**مایكل هـ. هارت**

# 100

# كاریگەرترین كەسایەتی د دیروكێ دا

وەرگێڕان ژ ئینگلیزی

**دیان جەمیل**

# 100

## کاریگەرترین کەسایەتی د دیروکێ دا

مایکل هـ. هارت


- ناڤێ پەرتووکێ ب ئینگلیزی: The 100: a ranking of the most influential persons in history
- وەرگێڕان ژ ئینگلیزی: دیان جەمیل
- پێداچوونا زمانی: رەمەزان عەبدوللا
- دیزاینا بەرگی: بێوار موحەمەد
- دیزاینا ناڤەرۆکێ: دیان جەمیل

# ناڤەرۆك

# گرنگترین رویدانێن دیروکی

**بەرى زاینی**

3500

نڤێسان ژلایێ سۆمەریانڤە هاتە داهێنان

مانی هەردوو شاهنشینین مسرێ کرنە ئێك

دەستپێکرنا چەرخێ برونزی ل رۆژهەلاتا ناڤین

3000

درۆستکرنا ئەهرامێن مسرێ

2500

سەردەمێ سەرجونێ ئەکەدی یێ سمەری

2000

داهێنانا ئێکەم ئیلیفبێتکێن زامنی

سەردەمێ حەمۆرابی

1500

سەردەمێ ئەخناتۆنی

دیاربوونا پێغەمبەر موسای ل مسرێ

بکارئینانا ئاسنی بوو تشتەکێ بەربەلاڤ ل رۆژهەلاتا ناڤین

شەرێ ترِوادە

پێغەمبەر داودی دەستهەلات ل ئورشەلیمێ دکر

1000

Homer

Isaiah

چاخێ ئاسنی ل چینێ دەستپێکر

600

سەردەمێ زەرادەشتی    شاهێ بابلیونی جودای پەرستگەها سلێمان پێغەمبەری

ژناڤبر

سەردەمێ ماهاڤیرای

سەردەمێ بودای

سەردەمێ کونفۆشیوسی

500

شەرێ ماراسون:

پەریکلیس هیرودوتس

سەردەمێ هیپوکراتی سەردەمێ دیموکراتی

مرنا سوکراتی

400

سەردەمێ پلۆتوی

سەردەمێ ئەریستوی سەردەمێ ئەلیکساندەرێ مەزن

مەنکلوس لاو تسو

سەردەمێ ئەقلیدیسی

300

سەردەمێ ئاشوکای

سەردەمێ ئەرخەمیدسی

شی هوانگ تی ئیمپارتوریا چینێ کرە ئێك

رۆما د شەرێ دوێ یێ دا شکەست

200

شاهنشینا

100

یولیوس قەیسەری دەستهەلات ل

ئوگوست قەیسەر: ئێکەم ئیمپراتورێ رۆمانی

پشتی زاینی

دەرکەفتنا پێغەمبەر عیسای

سەردەمێ نڤیسەر و شیرەتکار قەشە پاول

تسی ئای لوونی وەرەقە داهێنان

100

پێشکەفتنا هێزا ۆمانیان

Ptolemy

galen

200

ب دوماهی هاتنا ل چینێ

مانی ل دەڤەرا میزوپوتامیا دەرکەفت

300

قۆستەنتینێ مەزن: ئێکەم ئیمپراتۆرێ کریستیان ل رۆما
گوزیك کاڤاری لەشکەرێ پیادەیێ رۆمانی د شەرێ ئەدریانوپیلدا شکاند

400 کەفتنا رۆما — سەردەمێ قەشە ئوگستینی
داگیرکرنا ئینگلتەرا ژلایێ ئەنگلو ساکسون
بدوماهی هاتنا ئیمپراتۆریا رۆمانی یا رۆژئاڤا

500
سەردەمێ جوستینیانی
سو ئوین تی دووبارە چین کرە ئێك و رێکئێخست

600
دەرکەفتنا پێغەمبەرێ ئیسلامێ موحەمەد (س.خ)
عومەرێ کورێ خەتابی، خەلیفێ دوێ یێ موسلمانان، وەلاتێن مسرێ و عیراق و فارسان داگیرکر

700 دەستپێکرنا چاپکرنا بلوکی ل چینێ
موسلمانان وەلاتێ ئیسپانیا داگیرکر
موسلمان ل فرەنسا دشەرێ تاور دا شکەستن
خێزانا دەستهلاتدار ل چینێ گەهشتە گوپیتکێ

800 چارلیمەنگی تاجا ل رومان دانا سەر سەرێ خۆ — سەردەمێ هارۆن رەشیدی
گوپیتکا سەردەمێ خەلیفە مەئمونی ل بەغدا

900 گوپیتکا سەردەمێ ئەسکودیناڤی ل ئەورۆپا
پەیدابوونا وەلاتێ ئەسکودیناڤی ل نورماندی

1000 سەردەمێ لیف ئیریکسونێ دەریاڤان
ویلیەمێ مەزن ل ئینگلتەرا د شەرێ هاستینگدا ب سەرکەفت

1100 بابا ئوربانێ دووێ هەوا خاچپەرێسی دەستپێکر

زێدەبوونا بکارئینانا تیرکوڤانان د شەران دا

1200 زێدەبوونا دەستهەلاتا پاپای ل ژێر دەستهەلاتا ئینوسنێ سیێ
سەردەمێ ماگنا کارتا — سەردەمێ جەنگیزخانی

دەستپێکرنا هێرشێن مەنگولی بو سەر رۆسیا

سەردەمێ توماس        هێرشێن مەنگولی بۆ سەر چینێ و گوپیتکا فەرمانرەواییا

مەنگولیان: کوبیلای خان

1300 دەستپێکرنا سەردەمێ ریناسانس ل ئیتالیا        سەردەمێ مارکو پولوی

سەردەمێ دانتی        دەستپێکرنا بکارئینانا توپهاڤێژان ل ئەوروپا

تیرکوڤانهاڤێژێن ئینگلیز وەلاتێ فەرنسا ستاند،

نەخۆشیا تاعونا رەش ئەوروپا وێرانکر

1400 تەیمورلەنگی هێرش کرە سەر وەلاتێ، هندێ و فارسان

سەردەمێ دەریاڤان هێنری

جان دارك

1450

دەستپێکرنا دەستهەلاتا عوسمانیان ل قوستەنتینیە و ب دوماهی هاتنا بیزەنتیان.

گوتەنبەگی ئامیرێ چاپێ داهێنا

1475 فێردیناند و ئیزابێلایێ ئیسپانیا کرە ئێك دادگەهێن پشکنینێ ل ئیسپانیا دەستپێکرن.

رۆسیا سەربەخویا خۆ ژ مەنگولیا وەرگرت

کولومبوسی ئەمریکا ئاشکەراکر

1500 ڤاسکو دی گامای رێکا هندێ ئاشکەراکر        سەردەمێ لیوناردو داڤنشی

سەردەمێ مایکا ئەنجلوی        سەردەمێ ماکیاڤێلی

ریفۆرما پرۆتستانتی ژ لایێ مارتن لوسەری ڤە دەستپێکر

سەردەمێ ماگیلانی        کورتێسی مەکسیك داگیرکر

1525 پیزاروی وەلاتێ پیرو داگیرکر

سەردەمێ هێنری یێ هەشتێ        سەردەمێ کالڤینی

سەردەمێ کوپەرنیکوسی

1550 ئەلیزابێت بۆ فەرمانرەوایا ئینگلتەرا

ل ڤی دەمی وێڤە چەك د شەران دا زالبوو

1575

گەشتیێن ئیسپانی ژ لایێ هێزا دەریایی یا ئینگلیز ڤە هاتنە شکاندن

1600 سەردەمێ وولیەم شکسپیری

سەردەمێ کیپلەری        داهێنانا تێلسکوپێ

سەردەمێ گالیلیوی

| | |
|---|---|
| | سەردەمێ فرانسیس باکونی |
| 1625 | ئاشکەراکرنا زڤرۆکا خوینێ ژلایێ هارڤی ڤە |
| | ئەلمانیا ژبەر شەرێ سیه سالێ وێران بوو     یابانێ هێرش بەرەڤ رۆژئاڤای ڤە برن |
| | سەردەمێ رینێ دیکارتی     ئاڤاکرنا تاج مەحەل |
| 1650 | دەستپێکرنا شەرێ نافخۆیی یێ ئینگلتەرا: ئولیڤەر کرۆموێل |
| 1675 | لیڤنهوکی بەکتریا ئاشکەراکرن |
| | شورەشا سەربلند ل ئینگلتەرا دەستپێکر     سەردەمێ ئیسحاق نیوتنی |
| | سەردەمێ جون لوکی |
| 1700 | سەردەمێ پیتەرێ مەزن     پەیدابوونا بزوێنەرێن هەلمێ یێن دەستپێکی |
| 1725 | |
| | ڤولتێر نامە نڤیسین: دەستپێکا سەردەمێ رەوشەنگەریێ ل فرەنسا |
| | سەردەمێ جواهن سیباستیان باخی |
| 1750 | سەردەمێ مونتیسکیوی     سەردەمێ بنجامین فرانکلینی |
| | شورەشا پیشەسازی ل ئینگلتەرا دەستپێکر |
| 1770 | جێمس واتی بزوینەرێ هەلمی پێشئێخست |
| | جێفرسونی بەیاننامەیا سەرخەبونێ نڤیسا |
| | ئادەم سمیسی پەرتووکا "سامانێ مللەتان" نڤیسی |
| 1780 | سەردەمێ جورج واشنتونی     سەردەمێ ئیمانوێل کانتی |
| | کولومبی یاسایێن ئەلیکتریکێ ئاشکەراکرن |
| 1790 | سەردەمێ لاڤوازێ     دەستپێکرنا شورەشا فرەنسی     موزارت |
| | سەردەمێ جێنیری     سەردەمێ مالتوسی |
| 1800 | ڤولتای یەکەم پاتریا کارەبایی داهێنا |
| | ناپلیون بونابەرت |
| 1810 | جون دالتون     ئینگلتەرا بازرگانی ی کویلەیان قەدەغەکر |
| | شەرێ واتەرلوو     سەردەمێ بتهوڤنی |
| 1820 | بریتانیا هند داگیرکر     بولیڤار د شەرێ بویاکا دا ب سەرکەفت |
| 1830 | رێکێن شەمەندەفەرێ بەربەلاڤبوون |
| | مایکل فارادای پێلێن کاروموگناتیسی ئاشکەراکرن |
| | داهێنانا تیلیگراڤێ |
| 1840 | داگورای وێنەیێن فوتوگراڤ داهێنان |
| 1850 | مورتونی بەنج د نشتەگەریان دا بکارئینا |

1860
داروینی پەرتوکا "بنەمایێ رەگەزان" بەلاڤکر

کاتلینگی دەبانجەیا فیشەکان داهێنا

سەردەمێ جێمس کلارك ماکسوێلی        شەرێ ناڤخویی یێ ئەمریکا: لینکولن

مەندلی یاسایێن بوماوەزانیێ نڤیسین

1870
ڤەگەراندنا سەردەمێ مێژی ل یابانێ        کارل ماکس        لیستەر

سەردەمێ پاستەری        بێلی ئامیرێ تێلەفونێ داهێنا

1880

ئەدیسونی گلوپا رۆناهیێ داهێنا

1990
فەرانرەوایا ئینگلتەرا بەرەڤ دوماهیێ ڤە چوو

بۆ یەکەمجار ترۆمبێل ب شێوێ بازرگانی هاتە فروتن (دایملەر، بێنز)

وێنەیێن لڤوك هاتنە داهێنان        رۆنگینی تیشکا ئێکس داهێنا

مارکونی رادیو داهێنا        باکێرلی چالاکیا تیشکەیی ئاشکەراکر

1900
سیگموید فرید        ماکس پلانك

برایێن رایت فرۆکە داهێنان

ئەنیشتاینی تیورەکا تایبەت ل دور رێژەیێ نڤیسی

هێنری فوردی ترۆمبێلا مودێل تی دروستکر

1910

رۆزەلفوردی هێزا ناڤەکی ئاشکەراکر

شەرێ جیهانێ یێ یەکێ دەستپێکر        شورەشا رۆسیا: لینین

1920

ئامیرێن کوانتەمێ هاتنە دروستکرن: دی برۆگلی هێسنبێرگ، شرۆدینگەر

فلامینگی پەنسیلین ئاشکەراکر

1930
سەردەمێ بیکاسوی

فرانکلین دی رۆزفێلت        ستالین        کینیس

هێتلەر

1940
شەرێ جیهانی یێ دووێ

فێرمی یەکەم کارگەها ناڤکی ئاڤاکر        بەرەبابکێ یەکێ یێ کومپیتەرا

دروستکرنا بۆمبا ئەتومی

داهێنانا ترانسێستەرێ: شوکلی

1950
ماو زیدونگ        بکارئینانا تێلەڤزیونێ دەستپێکر

داهێنانا بۆمبا هایدروجینی        گریك و واتسۆنی پێکهاتەیا DNA ئاشکەراکر

پینکوسی حەبکێن دژی دووگیانیێ پێشئێخستن

| | |
|---|---|
| 1960 | جون کەنەدی پشتەڤانیا پرۆژێ ئەپولوی کر |
| 1970 | شەرێ ڤیتنامێ      یەکەم روونشتا سەر بانێ هەیڤێ (ئەپولوو دوو)<br>جینێن دەستکرد دناڤ بەکتریایێ دا هاتنە چاندن |
| 1980 | گورباچیف |
| 1990 | ژناڤچوونا یەکێتیا سوڤیەتێ      ب دوماهی هاتنا شەرێ سارڕ |

# 1. موحەمەد پێغەمبەر(س.خ) The Prophet Muhammad

(570ز. – 632ز.)

## موحەمەد پێغەمبەر (س.خ)

## مەزنترین و کاریگەرترین کەس د دیروکا مرۆڤایەتیێ دا

مە پێغەمبەرێ خودێ موحەمەد(س.خ) ل سەرێ لیستا 100 کاریگەرترین کەسایەتی د دیروکێ دا دانایە، چ پێنەڤێت گەلەك کەس دێ حێبەتی مینن ژبەر ڤێ چەندێ، لێ ئەگەرێ سەرەکی کو مە ئەڤ پێغەمبەرە وەك کاریگەرترین کەسایەتی د دیروکا مرۆڤایەتیێ هەمیێ دا دانایی ژبەر هندێ بوویە کو ئەو کەسێ ئێکانەیە شیای سەرکەفتنەکا مەزن و بێ وێنە ل سەر ئاستێ دین و دنیاییێ تومار بکەت کو د دیروکێ دا چ کەسێن وەکی وی دووبارە نەبووینە.

موحەمەد ئەو پێغەمبەر بوو یێ بانگەوازی ژبۆ ئاینێ ئیسلامێ دکری و بەلاڤ دکری کو ئێکە ژ مەزنترین و بەربەلاڤترین ئاینان ل سەرانسەری جیهانێ و شیایە ب بیتە سەرکردەیەکێ سیاسی و لەشکەری و دینی، هەتا بورینا پتر ژ 14 سەدەیان ل سەر وەغەرکرنا وی ژی لێ هێشتا کاریگەریا وی ل سەر موسلمانان گەلەك یا بهێزە و ڕۆژ بۆ ڕۆژێ هژمارا وان کەسێن باوەریێ ب ئیسلامێ دئینن د زێدەبوونێ دایە.

پتریا ئەو کەسێن مە ناڤێن وان د ڤێ لیستێ دا ئاماژە پێکری، ل هندەك دەڤەران ژ دایکبووینە و ژیاینە کو ناڤەندێن شارستانی یێن هەڕە پێشکەفتی بووینە یان ژی دبیت هندەك وەلاتێن پێشکەفتی ژ لایێ سیاسی و هزری و ئابوری ڤەبووینە، لێ ژ ڤان کەسان موحەمەد تێ نەبیت کو ل سالا 570 زاینی ل باژێرێ مەکەهێ ل باشورێ گزیرتا عەرەبی ژ دایکبوویە کو ل وی سەردەمی باژێرەکێ پاشڤەمایی بوو و یێ دوور بوو ژ شارستانیا مرۆڤان و سەنتەرێن بازرگانی و ڕەوشەنبیری و هونەری.

هەردیسان دەمێ بابێ وی وەغەرکری هێشتا ئەو نەهاتبوو سەر دنیاییێ. دەمێ دەیکا وی ژی وەغەرکری ژیێ وی ب تنێ شەش سالێ بوون، ل دویف دا ل دەڤ باپیرێ خۆ و

پاشی ل دەڤ مامێ خۆ دناڤ هندەك كاودانێن ئاسایی و سادە دا ژیایە و كەسەكێ نەخواندەڤان بوو، باری وی یێ ئابوری ژی هند یێ باش نەبوو هەتا ژیێ وی گەهشتیە 25 سالێیێ دەمێ بۆ خۆ "خەدیجا" ئینای كو ژنەكا دەولەمەند و بازرگان بوو. ل وی دەمی ژیێ وێ نێزیكی 40 سالاَن بوو.

دەمێ ژیێ پێغەمبەری گەهشتیە نێزیكی 40 سالێیێ، خۆدانێ كەسایەتیەكا گەلەك ب هێز و ئێكانەبوو، ل وی سەردەمی عەرەبان پەرستنا بتان "سەنەمان" دكر، لێ هژمارەكا كێم یا جوهی و فەلەیان ل مەكەهێ هەبوون و موحەمەدی پێزانین ل سەر ڤان هەردوو ئاینان هەبوون.

بەری هاتنا وەحیێ، موحەمەد بەردەوام دچوو شكەفتا "حەرا"یێ و هزرا خۆ د ڤی گەردونێ مەزن و دنیایێ دا دكر، د ژیێ 40 سالێیێ دا ژبۆ ئێكەم جار ل ڤێ شكەفتی وەحی بۆ هاتە خوارێ و هەر ژ وی دەمی دلێ وی پڕی باوەریا خۆدایێ ئێكانە بوو. ژ وێ ڕۆژێ خودایێ مەزن ئەو هەلبژارت وەك دوماهیك پێغەمبەر ژبۆ مرۆڤان داكو پەیاما وی ل سەر عەردی بەلاڤ بكەت.

ل هەرسێ سالێن دەستپێكێ یێن هاتنا وەحیێ، پێغەمبەری ب شێوەیەكی نهێنی بانگەوازا ئیسلامێ دناڤبەرا كەسوكارێن خۆ یێن نێزیك دا بەلاڤ دكر، هەتا وی دەمی هژمارەكا كێم یا خەلكی باوەری پێ ئینابوو. ل سالا 613 زاینی بریار دا ئێدی ب ئاوایەكێ ئاشكەرا بانگەوازا ئیسلامێ بەلاڤ بكەت. ئەڤ چەندە ژی بوو ئەگەر بێباوەرێن مەكەهی گەلەك نەخۆشی و زیان گەهاندە وی و هەڤالێن وی.

پشتی هژمارەكا خەلكێ مەدینێ، ئەوا دكەڤیتە باكورێ باژێرێ مەكەهی ب دووراتیا 200 كیلومەتران، باوەری ب ئاینێ ئیسلامێ ئینای، وان هاریكاریا موحەمەدی و هەڤالێن وی كر ل سالا 622 زاینی بەرەڤ مەدینێ مشەخت ببن و پشتی هینگێ ڕۆژ بۆ ڕۆژێ ئاینێ ئیسلامێ ب هێزتر لێ هات و هژمارەكا مەزن یا خەلكی باوەری پێ ئینا.

ئەم دشێن بێژین كو مشەختبوونا پێغەمبەرێ ئیسلامێ ژبۆ مەدینێ خالا وەرچەرخانێ بوو د ژیانا وی و دیروكا ئیسلامێ دا، چونكی وەختێ ل مەكەهێ هژمارەكا گەلەك كێم یا مرۆڤان باوەری پێ ئینابوو، لێ ل باژێرێ مەدینی هژمارەكا مەزن یا خەلكی باوەری پێ ئینا و بوونە موسلمان.

هەر د ماوەیەکێ کێم دا پێغەمبەر و ئاینێ ئیسلامێ شیان هێزەکا مەزن ب دەستخۆڤە بینن، ل وی دەمی و وێڤە پێغەمبەر شیا مەزنترین و کویرترین کارتێکرن ل دلێن مرۆڤان بکەت. پشتی چەند سالێن ل دویف دا ڕۆژ بۆ ڕۆژێ هژمارا مشەختی و ئەنساران د زێدەبوونێ دابوو و ئەڤ هەردوو کومە پێکڤە شیان شەڕێن بێباوەڕێن مەکەهێ بکەن و گەلەك سەرکەفتنێن مەزن تومار بکەن.

ئەڤ شەڕە هەمی ل سالا 630 زاینی ب دوماهی هاتن ئەوژی پشتی موحەمەد شیای ب سەرکەفتیانە بچیتە دناڤ مەکەهێ دا و بەری دوو سالێ و نیڤان ژ وەغەرکرنا وی خەلکی ژ هەمی دەڤەران قەستا وی دکر و باوەری پێ دئینا تا وی ڕادەی ئیسلام گەلەك بهێز کەفت، دەمێ وەغەرکرنا وی ژی ئاینێ ئیسلامێ ل هەمی گزیرتا عەرەبی بەلاڤ ببوو.

ل وی سەردەمی خەلکێ گزیرتا عەرەبی ب هندێ ب ناڤودەنگ بوون کو ژبۆ شەڕان گەلەك د زیرەك و مێرخاس بوون، هەرچەندە هژمارا وان ب خۆ ژی یا کێم بوو لێ وان ب خۆ ژی هەڤڕکی و دوژمنی دناڤبەرا هەڤدوو دا هەبوو لەوڕا نەشیابوون چ ئیمپراتۆرییێن بهێز ئاڤا بکەن، بەلکو خەلکێ وێ ب چاندنا شینکاتی و کشتوکالی ڤە د مژویل بوون.

لێ پێغەمبەرێ خودێ موحەمەد شیا ژبۆ ئێکەم جار وان بکەتە ئێك و دلێن وان ب باوەریا ب خودایێ ئێکانە تژی بکەت و مللەتەکێ مەزن و بهێز ژێ دروست بکەت. ژبەر ڤێ چەندێ لەشکەرێ موسلمانان هەرچەندە یێ بچووك ژی بوو لێ شیا سەرکەفتنێ د مەزنترین شەڕان دا توماربکەت و دوو ژ مەزنترین ئیمپراتۆرییێن مەزن یێن وی سەردەمی کو ئیمپراتۆریا فارسان ل ڕۆژهەلاتی و ئیمپراتۆریا ڕۆمان ل ڕۆژئاڤای بشکێنن و ب ڤێ چەندێ شیان گەلەك وەلاتان ڕزگار بکەن و ئاینێ ئیسلامێ لێ بەلاڤ بکەن.

هژمارا عەرەبان گەلەك ژ یا وان وەلاتان کێمتر بوو یێن وان ئاینێ ئیسلامێ لێ بەلاڤکری، ل سالا 642 زاینی موسلمان شیان وەلاتێ مسرێ ل ژێر دەستهەلاتا بیزەنتیان بینە دەرێ، هەردیسان ل سالا 637 زاینی ژی شیابوون ل شەڕێ "قادسیە" و ل سالا 642 ل شەڕێ "نەینەوا" هێزێن فارسی بشکێنن، ئەڤ سەرکەفتنە ل سەردەمێ هەردوو خەلیفەیێن موسلمان ئەبوبەکرێ کورێ سەدیقی و عومەرێ کورێ خەتابی هاتبوونە تومارکرن.

ڤان سەرکەفتنان دوماهی ب بەلاڤکرنا ئیسلامێ ل وان وەلاتان نەئینا، بەلکو ل سالا 711 زاینی هێزێن ئیسلامی شیان باکورێ کێشوەرێ ئەفریقیا هەتا زەریا ئەتلەسی ب تەمامی داگیر بکەن. ل دویف دا ڤان هێزان بەرێ خۆ دا گەرۆیێ "جەبەل تارق" و چوونە دناڤ وەلاتێ ئیسپانیا دا.

ل وی سەردەمی هەمی وەلاتێن ئەوروپی هەست ب وێ مەترسیێ کر کو هێزێن ئیسلامی دێ شێن وەلاتێن جیهانا مەسیحی ل ئەوروپا داگیرکەن و دوماهیێ ب ئاینێ مەسیحیان ئینن.

ل سالا 732 ل دەڤەرا "تۆر" ل فرەنسا هێزێن موسلمانان تووشی شکەستنێ بوون ئەوژی پشتی کو لەشکەرێن پتریا وەلاتێن ئەوروپی خۆ کریە ئێك و بریار دای دژی هێزێن لەشکەرێ موسلمانان شەری بکەن. سەرەرای ڤێ چەندێ لێ باوەریا موسلمانان ب خودێ و پیغەمبەرێ وی و قورئانا پیرۆز شیان ئیمپراتۆریا ئیسلامی ژ وەلاتێ هندێ تا دوماهیا زەریا ئەتلەسی ب دامەزرینن کو دهێتە هژمارتن مەزنترین ئیمپراتۆری د دیروکێ دا کو هەتا سەردەمێ ئەڤروکە هاتبیتە دامەزراندن.

عەرەب نەشیان ژبۆ ماوەیەکێ درێژ سنورێن ڤێ ئیمپراتۆریێ بپارێزن، چونکی هەر زویکا وەلاتێ فارسان شیا ژێڤەبیت لێ هەر خەلکێ وێ ل سەر ئاینێ ئیسلامێ مان، هەردیسان پشتی حەفت چەرخان ژ فەرمانرەواییا عەرەبان ل وەلاتێ ئیسپانیا، پشتی هژمارەکا شەرێن مەزن و خویناوی لەشکەرێ مەسیحی شیان ل دوماهیێ ئیسپانیا ژ دەستێ موسلمانان بینە دەرێ. هەردیسان هەردوو وەلاتێن عیراق و مسرێ کو دهێنە هەژمارتن لاندکا شارستانییێن مرۆڤایەتیێ ژ ڤێ ئیمپراتۆریێ هاتنە دەرێ، زێدەباری پتریا وەلاتێن کێشوەرێ ئەفریقیا لێ هەتا نوکەژی خەلکێ وان ل سەر ئاینێ ئیسلامێ ماینە.

ئاینێ ئیسلامێ رۆژ بۆ رۆژێ بەلاڤ دبوو و هژمارا خەلکێ باوەری پێ دئینایی بەرەڤ زێدەبوونێ دچوو، ل سەردەمێ ئەڤروکە هژمارا موسلمانان ژ ملیار مرۆڤان بوریە، ملیونەها خەلکێ وەلاتێن ناڤەراستا کێشوەرێ ئەفریقیا و پاکستان و ئەندونوسیا بووینە موسلمان، تا وی رادەی ئیسلام شیا هەمی گزیرتەیێن وەلاتێ ئەندونوسیا بکەتە ئێك کو بەری هینگێ گەلەك ئاین و دیالێکتێن زمانی لێ هەبوون لەورا ژی ئەڤروکە مەزنترین وەلاتێ ئیسلامی ژلایێ هژمارا موسلمانان ڤە ئەندونوسیایە.

ل وەلاتێ هندێ ژی ئاینێ ئیسلامێ هاته بەلاڤکرن و هەڤڕکی دگەل ئاینێن دی یێن وی وەلاتی کر، هەروەکی هەمی ئاینێن دی یێن ئەسمانی، ئاینێ ئیسلامێ ژی کارتێکرنەکا مەزن و کویر ل سەر ژیانا موسلمانان کریە.

هەرچەندە هژمارا وان کەسێن باوەری ب ئاینێ مەسیحیێ ئینای ئەڤروکە گەلەك پتر ژ هژمارا وان کەسێن باوەری ب ئاینێ ئیسلامێ ئینای ل سەرانسەری جیهانێ، ژبەر هندێ دبیت ژبۆ گەلەك کەسان یا سەیر بیت کا بوچی مە ناڤێ موحەممەدی ل ڕێزا ئێکێ دانا و ناڤێ حەزرەتێ عیسای ل ڕێزا سیێ دانا و یێ موسای ل ڕێزا 16 دانا.

ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤڕیت کو ڕۆلێ موحەممەدی گەلەك مەزنتر و مەترسیدارتر بوو ل دەمێ بەلاڤکرنا بانگەوازا ئیسلامێ، هەردیسان شیا پتر ڕێنما و شەریعەتێ ئاینێ ئیسلامێ بگەهینتە خەلکی و موسلمانان و باوەریێ ژبۆ دروست بکەت و کەسێ ئێکێ بوو د ئاینێ دا ئسلامێ دا.

هەرچەندە حەزرەتێ عیسای ژی بەرپرسێ ئێکێ بوو ژ دانانا بنەماییێن ڕەوشتی د ئاینێ مەسیحیەتێ دا، لێ قەشە "بۆلس" بوو یێ شیای ڕێنماییێن شەریعەتێ مەسیحیەتێ بدانیت و بەلاڤ بکەت و بەرپرسیار بوو ژ نڤیسینا پشکەکا مەزن ژ پەرتووکا پیروز ئینجیلێ.

لێ بەروڤاژی، موحەممەد کەسێ ئێکێ و ئیکانە بوو یێ بەرپرسیار ژ دانانا یاسا و بنەماییێن شەریعەتی و سەرەدەریا جڤاکی و ڕەوشتی و بنەماییێ کاروبارێن دەولەتێ و کاروبارێن خەلکی یێن د ژیانا وان یا دینی و دنیاییێ دا، هەردیسان قورئانا پیروز ژبۆ وی ب تنێ هاتبوو خوارێ کو هەر تشتێ موسلمان پێدڤی بووینی ژبۆ ژیانا خو یا دونیاییێ و ئاخرەتێ د قورئانێ دا هاتیە بەحسکرن.

قورئانا پیروز ب شێوەیەکێ تەمام ژبۆ پێغەمبەری هاتبوو خوارێ و هێشتا ئەوژی یێ ساخ هەمی ئایەتێن قورئانێ هاتبوونە ژبەرکرن و پاشی پشتی هینگێ بریار هاتەدان قورئان بهێتە نڤێسین و نڤێسانا وان گەلەك یا تازە و ڕێکوپێك بوو کو هەتا نوکە دەقێ وێ یێ ڕەسەن نەهاتیە گوهۆرین.

لێ د ئاینێ مەسیحیەتێ دا چ تشتێن ب ڤی ڕەنگی نینن چونکی پەرتووکەکا ب تنێ و ئێکگرتی نینە بەحسی ڕێنماییێن مەسیحیەتێ بکەت، ژبەر ڤێ چەندێ ژی کارتێکرنا موحەمەدی گەلەك مەزنترە ژ وێ کارتێکرنا عیسای ل دویفکەفتیێن خو کری.

ل سەر ئاستێ دینی، کاریگەریا موحەممەدی گەلەك یا بهێز بوو د دیروکا مرۆڤایەتیێ دا، هەردیسان کاریگەریا حەزرەتێ عیسای ژی گەلەك یا بهێز بوو، لێ موحەممەد نە ب تنێ کەسەکێ دینی بوو بەلکو کەسەکێ دنیایی ژی بوو و خێزان پێکئینابوو و زاروك هەبوون، هەردیسان کارێ شڤانیێ و بازرگانیێ ژی کربوو، پشکداری د شەڕاندا دکر و بریندار دبوو و نەساخ دبوو هەتا ل دوماهیێ ژی چوویە بەر دلوڤانیا خودێ وەکی هەمی مرۆڤێن دی یێن ل سەر ڕۆیێ عەردی ب مرنەکا ئاسایی و سروشتی وەغەرکر.

ژبلی کارێ پێغەمبەرایەتیێ، ئەم دشێن بێژین کو موحەممەد مەزنترین سەرکردێ سیاسی بوو کو دیروکێ نیاسی.

ئەگەر ئەم بەرپەڕێن دیروکێ هەلدەین دێ بینین گەلەك ڕویدانێن مەزن هاتینە تومارکرن لێ ئەم نزانین کا قارەمانێن وان یێن ڕاستەقینە کیبوون، بۆ نموونە ڕەنگە وەلاتێن کێشوەرێ ئەمریکا باشوری شیابان خۆ ژ بن زولما داگیرکەرێن ئیسپانیا قورتال بکەن خو هەکە سەرکردە "سیمون بولیڤار" نەبایە ژی چونکی هەر کەسەکێ دی دشیا بهێت و وی کاری ئەنجام بدەت.

لێ گەلەك یا ب زەحمەتە ئەم ڤێ چەندێ ل سەر عەرەبان و خەلکێ بیابانێ بێژین کو بشێن ئیمپراتۆریەکا مەزن وەکی یا ئیسلامێ بدامەزرینن هەکە کەسەکێ وەکی موحەممەدی نەهاتبایە، چونکی د دیروکێ هەمیێ دا چ زەلامێن وەکی وی یێن مەزن بەری هینگێ نەهاتبوونە نیاسین، ژبەر ڤێ چەندێ ژی ئەگەر ئەو نەبایە عەرەبێن بیابانێ چ جاران نەدشیان ببنە ئێك و پتریا وەلاتێن وی سەردەمی یێن کێشوەرێ ئەفریقیا و ئاسیا ڕزگاربکەن و فەرمانڕەوایێ لێ بکەن.

دبیت هندەك دیروکنڤێس بەحسێ هندەك شەڕێن مەزن یێن دیروکی بکەن، بۆ نموونە ئەو شەڕێن لەشکەرێ مەنگولیان ل چەرخێ 13 زاینی ئەنجامداین گەلەك ژ وان شەڕان مەزنتربوون یێن لەشکەرێ موسلمانان ئەنجامداین، لێ کاریگەریا ڤان شەڕان گەلەك

کێمتربوو و ژبۆ ماوەیەکێ کورت ڤەکێشان هەتا ل دوماهیێ هێزێن وان لاوازبووین و پتریا وەلاٚتێن خۆ ژدەستداینەڤە.

لێ ئەو شەڕێن موسلمانان ئەنجامداین ژ عیراقێ هەتا وەلاٚتێ مەغربێ عەرەب لێ د ئاکنجیبوون و ئەڤ دەڤەرە هەمی ژ وەلاٚتێن عەرەبان پێکدهاتن و ئیسلامێ ب تنێ ئەو نەکربوونە ئێك، بەلکو زمان و شارستانی و دیروکا وان ژی پێکڤە هاتە گرێدان وەکی وەلاٚتەکێ ئێکگرتی لێهاتن. هەلبەت باوەریا عەرەبان ب قورئانێ ب شێوەیەکێ مەزن و کویر بوویە ئەگەر ئەو زمانێ خۆ یێ ڕەسەن کو زمانێ عەرەبیە ژ گەلەك دیالێکت و زمانێن بیانی ب پاڕێزن.

د سەردەمێ ئەڤروکە دا گەلەك هەڤڕکی و هەڤدژی دناڤبەرا وەلاٚتێن عەرەبان دا هەنە و ئەڤ چەندە ژی تشتەکێ ئاساییە، لێ دگەل جاران ژی هەلویستیێ وان یێ ئێکگرتی بوویە، بۆ نموونە دەمێ ل سالاٚ 1973 و 1974 وەلاٚتێن ئیران و ئەندونوسیا بەردەوام بوون ل سەر فرۆشتنا پەترۆلێ بۆ وەلاٚتێن ڕوژئاڤای، لێ گشت وەلاٚتێن عەرەبی یێن پەترۆل هەی بریاردا گازێ نەفروشنە وەلاٚتێن ڕۆژئاڤایی، ئەڤ هەلویستێ ئیکگرتی یێ عەرەبان هندێ ڕادگەهینیت کو ئەو شەڕێن عەرەبان ل چەرخێ حەفتێ زاینی کرین هێشتا کاریگەریا وان ل سەر ژیانا ئەڤرو مایە.

ئەڤ پێکڤەگرێدانا دناڤبەرا دین و دنیایێ دا بوویە ئەگەر ئەم گەهینە وێ باوەریێ کو موحەمەد (س.خ) مەزنترین و کاریگەرترین مرۆڤ بوویە د د دیروکێ هەمیێ دا.

## 2. ئیسحاق نیوتن Isaac Newton

## (1642ز – 1727ز)

### ئیسحاق نیوتن

### ئەو زانایێ  بەرێ بنیاتێ زانستێ فیزیایێ دانایی

ئیسحاق نیوتن ئەو زانایە یێ کو هەر دەمێ ناڤێ وی دهێتە گوهێن مە، چیرۆکا کەفتنا سێڤێ ژ دارێ دهێتە بیرا مە، ئەو سێڤا بوویە ئەگەر کو نیوتن ببیتە ئێك ژ مەزنترین و کاریگەرترین مرۆڤان د دیروکێ دا.

نیوتن ل جەژنا کریسمسا سالا 1642 زاینی ل دەڤەرا ئولزۆرب ل ئینگلتەرا ژدایکبوویە، ئەڤە هەر ئەو سالێ بوو یا زانایێ فەلەکی یێ ئیتالی گالیلو تێدا وەغەرکری، ئەوژی وەکی پێغەمبەر موحەمەدی (س.خ) پشتی مرنا بابێ خۆ ژ نوو هاتیە سەر دونیایێ. نیوتن دهێتە هەژمارتن ئێك ژ مەزنترین زانایێن کارتێکرنەکا بێ وێنە ل سەر ژیانا مرۆڤایەتیێ کری ژبەرکو وی یاسایەك دانا کو بوو ئەگەرێ گوهۆرینا گشت بوارێن زانستی و کاریگەریا وێ هەتا ئەڤروکەژی یا بەردەوامە.

دەمێ نیوتن هێشتا یێ بچووك، چ نیشانێن زیرەکی و بیرتیژیێ ل دەف وی ددیار نەبوون، لێ دشیا ب شێوەیەکێ چالاك و باش دەستێن خۆ ب کاربینیت، لەورا دەیکا وی هزرکر دکر ئەو ل پاشەڕۆژێ دێ بیتە شەڕڤانەکێ چەلەنگ یانژی دارتاشەکێ دەستڕەنگین. هێشتا ل قۆناغا سەرەتایی و د ژیێ 10 سالێێ دا دەیکا وی ئەو ژ قوتابخانێ ئینا دەر ژبەرکو قوتابیەکێ تەمبەل بوو و گوهێ خۆ نەددا ئاخفتنێن ماموستایێن خۆ.

لێ ژیێ وی هێشتا نەگەهشتبوو 12 سالێێ دەمێ شیایی ب شێوەیەکێ گەلەك باش فێری خۆاندن و نڤێسینێ بیت و هەر تشتەکێ هاتبایە بەر دەستێ وی ب سانەهی د خۆاند. دەمێ گەهشتیە قۆناغا گەنجاتیێ د ژیێ 18 سالێێ چوو زانکۆیا کامبریج،  ل وێرێ دەرفەت ژبۆ وی پەیدابوو هژمارەکا مەزن یا پەرتووکان بخوینیت ب تایبەت پەرتووکێن زانستی و ماتماتیکێ.

ل دووڤدا نیوتنی ب شێوەیەکێ سەربەخۆ دەست ب ئەنجامدانا هندەك ڤەکۆلینان کر و د ماوێ دناڤبەرا ژیێ 21 هەتا ژیێ 27 سالیێ دا وی بنیاتێ هندەك تیورێن زانستی دانا کو پشتی هینگێ بوونە ئەگەرێ گوهۆرینا بنیاتێ پڕانیا تیورێن زانستی یێن وی سەردەمی و بوونە بەرێ بنیاتێ دانانا زانستێ فیزیاییێ یێ سەردەم.

نە وەکی زانایێن دی، نیوتنی تیورێن خۆ گەلەك ب نهێنیڤە ددانان و بۆ کەسێ ئاشکەرا نەدکرن هەتا ب تەمامی ژێ ب دوماهی نەهاتبا یانژی هەتا ڤەکۆلین ل سەر ئەنجامدابان و سەد ژ سەدێ یێ ژێ پشت ڕاستبا ژ نوو دا ژبۆ کەسێن دی دەتە دیارکرن و ل ڕۆژنامەیان بەلاڤ کەت، لێ تشتێ نەخۆش ئەوبوو ل دەستپێکێ کەسێ گرنگی نەددا تیورێن وی باوەر ژێ نەدکر هەتا چەندین سالاَن پشتی هینگێ.

پشتی ئەنجامدانا چەندین تاقیکرنان ل سەر ڕۆناهیێ، نیوتن شیا ئێکەم تیورا خۆ ل سەر سرۆشتێ ڕۆناهیێ بدانیت، ئەوژی پشتی هژمارەکا تاقیکرنان ل سەر تایبەتمەندیێن ڕەنگڤەدان و شکەستنا تیشکێن ڕۆناهیێ ئەنجامداین، ژبۆ وی دیاربوو کو ڕۆناهیا سپی ژ هەمی ڕەنگێن سرۆشتی پێکدهێت. هەر ل دویف بنیاتێ ڤان تیوران، ئەو شیا ل سالاَ 1668 تێلسکوپەکا پێشکەفتی دروست بکەت کو دهێتە هەژمارتن ئێکەم تێلسکوپا ڕەنگڤەدەر.

هەردیسان ئێك ژ مەزنترین ژ وان یاسایێن نیوتنی داناین، ئەوژی یاسایێن جووداکاری و تەمامکرنێ [1] بوون کو هێشتا ژیێ وی ژ 24 سالێێ نەبوری بوو، ئەڤ یاسایە دهێنە هەژمارتن بەرێ بنیاتێ هەمی زانستێن تیوری یێن سەردەم، ئەگەر نیوتنی ئەڤ داهێنانە ب تنێ ئەنجامدابان، دا ئەو ژ هەژی ڤێ شانازی و ڕێزگرتنا مەزن بیت و دا بۆ وی بەس بیت کو ناڤێ وی دگەل ڤێ لیستێ بهێتە دانان.

---

[1] جووداکاری و تەماکرن Calculus لقەکێ زانستێ ماتماتیکێ یە و گرنگیێ ددەتە خۆاندنا گوهورینان، هەردیسان گرنگیێ دەتە خۆاندنا دوماهیک و پێکهاتن و زنجیرەیێن بێ دوماهیک، ئەڤ زانستە د چەندین زانستێن دی یێن وەك ئەندازیاییێ دا دهێتە ب کارئینان.

لێ مەزنترین داهێنانا نیوتنی ئەوبوو دەمێ هەردوو یاساییێن لڤینێ یا ئێکێ و یا دووێ و یاسایا ڕاکێشانا گەردونی یا نیوتنی[2] دانایین، ئەو سەردەمێ نیوتن تێدا ژیایی بتایبەت ناڤەڕاستا چەرخێ هەڤدێ زاینی، گەلەك زانایێن مەزن تێدا ژیابوون و گەلەك داهێنان و دەستکەفتیێن زانستی یێن مەزن ئاشکەرا کربوون و داهێنابوون، لێ ئەم دشێین بێژین یاسایا نیوتنی ل سەر تاودانێ یان ژی هێزا ڕاکێشانێ مەزنترین داهێنانا زانستی بوو ل وی سەردەمی و بوو ئەگەرێ گوهۆرینا گشت بنەماییێن زانستی.

نیوتن بەحسێ سەرهاتیا خۆ دگەل دارا سێڤێ دکەت، ئەوژی دەمێ ڕۆژەکێ ل بن دارەکا سێڤێ ڕوینشتیە خوارێ ل ڤی دەمی نیوتنی هزرێن خۆ د یاسایا ڕاکێشانێ دا دکری، ژ نیشکەکێڤە سێڤەك کەفتیە سەر عەردی، نیوتنی هزرێن خۆ کرن ئەرێ کا بوچی ئەڤ سێڤە ب شێوەیەکێ ستونی کەفتە سەر عەردی، ئەرێ بوچی بەرەڤ ئەسمانی نەدچوو یانژی بەرەڤ ئاراستەکێ خوار نەدچوو، ڤێ چەندێ بۆ وی دووپاتکر کو دڤێت هێزەك دناڤ سەنتەرێ عەردی دا هەبیت و ئەڤ سێڤە کێشابیتە خۆ.

هەرچەندە گەلەك کەس د وێ باوەرێ دانە کو ئەڤ چیرۆکە ب تنێ وەك سەرهاتیەکێ یە و چ ڕاستی بۆ نینە ژبەرکو هزرا دانانا یاسایەکا مەزن وەك یاسایا ڕاکێشانێ هەما هوسا ب سانەهی پەیدانابیت بەلکو دڤێت بەری هینگێ گەلەك تاقیکرن ل سەر هاتبنە ئەنجامدان، لێ هەڤاڵەکێ نیوتنی یێ نێزیك ب ناڤێ ویلیام ستوکولی د پەرتووکا خۆدا بەحسێ ڕاستیا ڤێ چەندێ دکەت و دیار دکەت کو ل وێ ڕۆژێ ئەو و نیوتن پێکڤە چوبوونە ناڤ وی باخچێ سێڤان و پشتی وێ ڕویدانێ نیوتنی بوچوونێن خۆ ل سەر پەیوەندیا دناڤبەرا کەفتنا سێڤێ و هێزا ڕاکێشانا عەردی ژبۆ وی گوتبوون.

دبیت گەلەك کەسێن دی هەبن کارتێکرنەکا مەزن ل سەر ژیانا مرۆڤان کربیت، لێ دانانا نیوتنی ل ڕێزا دووێ د لیستا کاریگەرترین 100 کەس د دیروکێ دا ژبۆ هندێ دزڤڕیت کو نیوتن بوویە ئەگەرێ دانانا بنەماییێن زانستێ فیزیایێ و ماتماتیکی و ژیانا

---

[2] یاسایا ڕاکێشانا گەردونی یا نیوتنی Newton’s Low of Universal Gravitation دیاردکەت کو هەر تشتەکێ دناڤ گەردونی دا تشتەکێ دی ب ڕێکا هێزەکێ بۆ لایێ خۆ رادکێشیت، ئەو هێز ڕاستەخۆ یا هەڤرێژەیە دگەل دگەل بسەنگا وان هەردوو تشتان و بەروڤاژی هەڤرێژەیە دگەل مەودایێ دناڤبەرا واندا یێ دووجارکی ئەوژی ب ڤی ڕەنگی:

$$F = G\frac{m_1 m_2}{r^2}$$

**خەلکی پشتی هزروبیرێن نیوتنی ب تەمامی هاتینە گوهۆرین. نیوتن ل سالا 1727 وەغەر کریە و ئەو ئێکەم کەس بوو ل گۆرستانا کەسێن مەزن و بناڤودەنگ ل لەندەن هاتیە ڤەشارتن.**

## 3. حەرزەتێ مەسیح

## (6 بەری زاینی – 30 زاینی)

### حەرزەتێ مەسیح

### خۆدانێ پەیاما ڕۆحانی یێ ئاینێ مەسیحیێ

حەزرەتێ مەسیحی کاریگەریەکا مەزن ل سەر مرۆڤان کریە، لەوڕا ژی کەس نەشێت نەڕازیبوونا خۆ دیار بکەت کو ناڤێ ل سەرێ لیستا کاریگەرترین مرۆڤ د دیرۆکێ دا هاتیە دانان. لێ پرسیار ئەوە ئەرێ کا بوچی من ناڤێ حەزرەتێ عیسایی خۆدانێ دیانەتا مەسیحیێ یاکو پتر ژ هەمی ئاینێن دی کارتێکرن ل سەر خەلکی کری، نەکریە کەسێ ژمارە ئێك و ل دەستپێکا ڤێ لیستێ نەدانایە؟

گومان تێدا نینە کو ئاینێ مەسیحی دگەل بورینا دەمی بوویە ئێك ژ ئاینێن کاریگەر و هژمارەکا مەزن یا خەلکی باوەری پێ ئینایە و چووینە سەر ڤی ئاینی، لێ د ڤێ ڤەکۆلینا خۆدا ل سەر کەسێن کاریگەر د دیروکێ دا من گرنگی نەدایە کارتێکرنا ئاینان ل سەر خەلکی بەلکو من گرنگی یا دایە وان کەسێن ئەڤ ئاینە ب ڕێڤە دبرین و کا چەند شیاینە کارتێکرنێ ل سەر خەلکی بکەن. ئاینێ مەسیحیێ ژ گەلەك لایەناڤە یێ جوودایە ژ ئاینێ ئیسلامێ، چونکی ئاینێ مەسیحی ژلایێ کەسەکی ب تنێ ڤە نەهاتیە دانان بەلکو دوو کەس ڕابووینە ب ڕێڤەبرنا ڤی ئاینی ڤە ئەوژی حەزرەتێ عیسایی و قەشە بۆلس بوون، لەوڕا پێدڤیە ئەم شانازیا ڤی ناسناڤی ل سەر ڤان هەردوو کەسان پارڤە بکەین.

حەزرەتێ عیسایی بنەمایێن ڕەوشتی یێن ئاینێ مەسیحی یێن داناین، زێدەباری بوچوونێن خۆ یێن ڕۆحانی و هەر تشتێ پەیوەندی ب ڕەوشت و ڕەفتارێن مرۆڤی ڤە هەی، لێ بنەمایێن ئاینێ مەسیحیێ ژلایێ قەشە بۆلسی ڤە هاتینە دانان، عیسی خودانێ نامەیەکا ڕۆحانی بوو لێ قەشە بۆلسی عەبدینیا مەسیحی ل سەر زێدەکریە، هەردیسان قەشە بۆلسی پشکەکا مەزن ژ پەرتووکا پەیمانا نوو (ئینجیل) دانایە و مزگینگەهانێ ئێکێ یێ ئاینێ مەسیحیێ بوو ل چەرخێ ئێکێ زاینی.

دەمێ عیسی چوویە بەر دلوڤانیا خودێ هێشتا یێ گەنج بوو (نە وەکی پێغەمبەرێ ئیسلامێ موحەمەدی (س.خ) و بۆدایی)، لێ وی هژمارەکا حەوارییان ل پشت خۆ هێلان، و پشتی مرنا وی دویفکەفتیێن وی هۆزەکا یەهودی یا بچووك دروستکر، لێ قەشە بۆلس شیا ڤێ هۆزا یەهوی یا بچووك هێدی هێدی پێشبێخیت و مەزن بکەت کو کەسێن یەهودی و نەیەهودی ژی دناڤدابوون، هەتا وی ڕادەی ئاینێ مەسیحیێ بوویە ئێك ژ مەزنترین ئاینان ل سەر ڕۆیێ عەردی.

ژبەر ڤان ئەگەرێن مە دیارکری، گەلەك ڤەکۆلەر د وێ باوەرێ دانە کو دانەرێ ئاینێ مەسیحیێ قەشە بۆلس بوویە نەك عیسی (س.خ)، لەوڕا پێدڤی بوو مە دڤێ لیستێ دا ناڤێ قەشە بۆلسی ل بەری ناڤێ عیسایی ب دانین، ل ڤێرێ ئەم نزانین ئەگەر قەشە بۆلس نەبایە دا ئاینێ مەسیحی گەهیتە چ ڕادە، لێ تشتێ ئەم ژێ د پشت ڕاست ئەوە کو ئەگەر عیسا نەبایە ئاینێ مەسیحیێ ژی نەدبوو لەوڕا مە ناڤێ عیسایی ل بەری ناڤێ بۆلسی دانایە.

تشتەکێ نەیێ بەرئاقلە کو ئەم حەزرەتێ عیسایی بەرپرسیار بدانین دەربارەی وان تشتێن دێرێ یان زەلامێن ئاینێ مەسیحیێ دناڤ ڤی ئاینێ دا زێدەکرین، ژبەرکو گەلەك ئەو تشتێن ل سەر ڤی ئاینی هاتینە زێدەکرن دگەل ڕێنما و بیروباوەرێن حەزرەتێ عیسایی ناگونجن، بۆ نموونە شەڕێن دناڤبەرا هۆزێن مەسیحیان و سەرژێکرنێن درندانەیێن جوهیان ژلایێ مەسیحیانڤە گەلەك ژ وان تشتان د دوورن یێن حەزرەتێ عیسایی بانگەوازی بۆ دکر، و تشتەکێ مەحالە کو بێژین حەزرەتێ عیسایی ئەو ژبۆ ڤان کاران ڕاسپارد بن.

هەردیسان ئەگەر دناڤ جیهانا مەسیحیی یا ڕۆژئاڤایی دا زانست و زانین پێشکەفت بیت، نەیا بەرئاقلە کو بێژین حەزرەتێ عیسای بەرپرسیارە ژ سەرهدانا شۆڕەشا زانستی ل ڕۆژئاڤای د ماوێ بیست چاخێن بوریدا، ژبەرکو ئەڤ چەندەژی دناڤ ڕێنماییێن ویدا نەبوو، ئەڤ چەندە دناڤ پەرتووکێن تەفسیرێ یێن زەلامێن ئاینێ مەسیحیێ دا نەهاتینە دیتن. بەلکو گوهۆرینا ئیمپراتۆریا ڕۆمانی بۆ سەر ئاینێ مەسیحیێ هەڤدەمبوویە دگەل وێ پێشکەفتنا هەرە مەزن د بوارێ زانست و تەکنولوژیایێ دا,

د ڕاستی دا سەرهلدانا شۆڕەشا زانستی ل ئەوروپا ژبۆ هندێ ڤەدگەریت کو میراتێ ڕەوشەنبیری و هزرمەندی یێ ڕۆژئاڤایی دگەل شێوازێ زانستی یێ هزرکرنێ د گونجا، و ئەڤ

چەندەژی دناڤ ڕێنماییێن حەزرەتێ عیسایی دا نەبوو بەلکو ژ ئەنجامێ هزروبیرێن مێشکی گریکی و یونانی بوو ب تایبەت بەرهەمێن فەیلەسوفێ بناڤودەنگ ئەرِیستۆ و ئەندازیار ئەقلیدسی. زانست و زانین ل سەردەمێ حەزرەتێ عیسایی پەیدانەبوو بەلکو ل سەردەمێ شۆرەشا زانستی بەربەلاڤبوو و ئەڤەژی ئەو سەردەم بوو یێ کو ئەورۆپا دووبارە ل ئاینێ مەسیحیێ زڤڕی و زیندی کریەڤە.

لێ چیرۆکا ژیانا حەزرەتێ مەسیحی یا بەرچاڤە هەروەکی کا چەوا د پەرتووکا پیروز "ئینجیل"ێ دا هاتیە دیارکرن، لێ پتریا وان پێزانینێن ل بەر دەستێ مە دەربارەی ژیانا وی د پشتراست نینن، بۆ نموونە ئەم ژ ناڤێ وی یێ دروست د پشتراست نینین، لێ پتریا بوچوونان دگەل هندێ نە کو وی ناڤەکێ یەهودی هەبوو د گوتنێ "یەشرع". هەردیسان سالا ژدایکبوون و وەغەرکرنا ویژی نەیا پشتراستە، هەردیسان حەزرەتێ عیسایی ب خۆژی چ دەستخەتێن نڤێسایی ل پشت خۆ نەهێلاینە و ئەو پێزانینێن مە ل سەر ژیانا وی ب دەستڤەئیناین، مە ژ پەرتووکا (پەیمانا نوو) وەرگرتینە. ب مخابنیڤە ئەو پەرتووکێن پیرۆز یێن ل بەر دەستێ مەژی هندەك هەڤدژی تێدا هەنە، بۆ نموونە هەردوو پەرتووکێن "مونا" و لوقا" هەڤدژی دەربارەی پەیڤێن دوماهیێ یێن حەزرەتێ مەسیحی هەنە بەلکو ئەڤ پەرتووکە پەیڤێن وی بشێوەیەکێ حەرفی ژ پەتۆکا پەیمانا کەڤن "تەوراتێ" یێن وەرگرتین.

نە وەکی پێغەمبەرێ ئیسلامێ موحەمەدی، حەرزەتێ عیسایی چ دەستهەلاتێن سیاسی یان ئاینی نەبوون و د ژیانا خۆ دا چ ڕۆلێن سیاسی نەگێڕاینە، هەردیسان ئاینێ مەسیحیێ ژی چ کارتێکرنێن سیاسی ل جڤاکی نەکربوون، لەوڕا ژبەر ڤان ئەگەران من ناڤێ وی نەکرە د ڕێزا ئێکێ دا ژ لیستا کاریگەرترین مرۆڤ د دیروکێ.

## 4. بۆدا Buddah

## (563 ب.ز – 483 ب.ز)

### بۆدا

### ئەو کەسێ بنەمایێن ئاینێ بودی داناین

گواتاما بۆدا کو ناڤێ وی یێ دروست "شاهـ سیدهارتا"یە دهێتە هەژمارتن دانەرێ ئولا بۆدی کو ئێکە ژ ئولێن هەرە مەزن ل جیهانێ، بابێ وی دەستهەلاتدارێ دەڤەرا "کاپیلاڤاستۆ" بوو یاکو دکەڤیتە باکورێ وەلاتێ هندێ ل سەر سنورێ دگەل شاهنشینا نیپالێ. د ژیێ شازدە سالیێ دا خێزان دگەل کچ مامەکا خۆ پێك ئینا کو ئەوژی د هەمان ژی دا بوو.

هەرچەندە دەمێ ژدایکبووی ژ خێزانەکا دەولەمەند و زەنگین و حالخۆش بوو، لێ وی بەردەوام هەست ب بێهن تەنگی و نەخۆشیێ دکر، وی ددیت کو پتریا خەلکی د هەژارن و ژبەر سادەترین پێدڤی یێن ژیانێ دنالن و نەشێن ب دەستخۆڤە بینن، هەروەسا ئەو کەسێن دەولەمەند ژی هەست ب خوشی و ساخلەمیێ ناکەن و ل دوماهیێ هەمی دبنە قوربانیێن ئێش و نەخۆشی و مرنێ.

بۆدایی گەلەك هزرێن خۆ دڤان جورە بابەتاندا دکرن و ل دوماهیێ گەهشتە وێ باوەریێ کو دڤێت ل ڤی ژیانێ دا تشەك هەبیت ژ هەمیان گرنگتر بیت و یێ نەمر بیت.

پشتی ژیێ وی بوویە 21 سالێ، ئانکو پشتی ژدایکبوونا کوری وی یێ نەخری، بریاردا ب تەمامی ژ ڤێ جیهانێ دوورکەڤیت و ب تنێ لجهەکی بژیت داکو دەلیڤە ژبۆ وی پەیدابیت هزرێن خۆ د ڕاستیا ژیانێ دا بکەت و نهێنیا وێ ئاشکەرا بکەت. پشتی هینگێ دەست ژ هەمی تشتان بەردا. بۆدایی لبەر دەستێ چەندین ماموستا و زانایێن ئولی یێن وی سەردەمی خاندیە لێ ب دیتنا وی هەمی ئەو بوچوون و چارەسەریێن ژلایێ ڤان ماموستایانڤە دهاتنە پێشنیارکرن چ ڕاستی ژبۆ نەبوون و بوچوونێن کەسی ب دلێ وی نەبوون.

لەورا وی دیت کو باشترین چارەسەری ژبۆ رزگاربوونێ ژ ئارێشە و نەخۆشیێن دنیایێ ئەوە کو ئەو خۆ ژ هەمی تشتان دووربکەت و ب تنێ بژیت و دەستان ژ هەمی کاروبارێن ژیانێ بەردەت. چەند سالێ بورین وی تێکەلیا کەسێ نەدکر و چ نەدخۆار و ڤەخۆار ب تنێ برەکا کێم نەبیت، لێ پشتی هینگێ ژبۆ وی دیاربوو ڤێ چەندێ ژی چ مفا تێدا نینە و ب تنێ ئەو یێ لەشێ خۆ ئەشکەنجەددەت و بەرێ خۆ ژ دیتنا راستیێ د وەرگێریت، ژبەر هندێ بریاردا دوماهیێ ب ڤێ چەندێ بینیت و دووبارە دەست ب خۆارن و ڤەخۆارنێ بکەت و تێکەلیا خەلکی بکەت.

شەڤەکێ دەمێ یێ روونشتی لبن دارەکا هژیرێ، هەمی نەخۆشی و ژانێن دنیایێ کەفتنە بەر پێن وی، ویژی ب کویراتی هزرا خۆ دڤان ئارێشەیان داکر و هێدی هێدی د مێشکێ خۆدا ل چارەسەریەکێ دگەریا، وێ شەڤێ هەتا سپێدێ بۆدا ما هشیار و هزرا خۆ د وان ئارێشەیاندا دکر و دەما بوویە سپێدە ئەو گەهشتە وێ باوەریێ کو چارەسەریا وان ئارێشەیان ل دەف وی هەیە، لەورا هەر ژ وێ رۆژێ وەرە ببوو کەسەکێ بۆدی ئانکو کەسەکێ رۆناککەر.

رێنمایێن ئولێ بۆدی چوار راستیێن پیروز بخۆڤەدگریت، ئەوژی ئەڤەنە:

- ئێك: ژیان د بنەکوکا خۆدا یا نەخۆش و پری ئارێشەیە.
- دوو: ئەگەرێ ڤێ نەخۆشیێ ژی دزڤریت ژبۆ خۆپەرستی و حەز و ئارەزوویێن مرۆڤی.
- سێ: مرۆڤ دشێت وی دەمی ل سەر خۆپەرستی و حەزێن خۆ زاڵ ببیت دەمێ دگەهیتە حالەتێ "نیرڤانا" ئانکو دەستا ژ هەمی تشتان بەردەت خۆ ژ رەهورێشالاّن.
- چوار: رێکا رزگاربوونێ ژ خوپەرستی و حەزێن دلی ئەوە مرۆڤ ل دویڤ هەشت راستیان بچیت ئەوژی ئەڤەنە: (دیتنەکا دروست، هزرکرنەکا دروست، پەیڤەکا دروست، کارەکێ دروست، ژیانەکا دروست، خەباتەکا دروست، تێگەهشتنەکا دروست و هیڤخواستنەکا دروست).

دەرگەهێ ئاینێ بۆدی ژبۆ هەمی کەسان یێ ڤەکریە بییێ جوداهیا ڕەنگێ پیستێ وان یان زمان و نەتەوەیا وان و ئەڤ چەندەژی بەروڤاژی ڕێنماییێن ئاینێ هندوکی یێ ڕەگەزپەرستە.

پشتی چەندین سالاڤ ژ مرنا بۆدایی، ئاینێ بۆدی ب شێوەیەکێ هێدی و ل سەرخۆ بەربەلاڤ دبوو، ل چەرخێ سییێ پێش زاینی، ئیمپراتۆرێ هندی "ئاشوکا" چوو سەر ئاینێ بۆدی و ئەڤ چەندەژی بوو ئەگەر ئەو ئاینێ بۆدی بکەتە ئاینێ فەرمی یێ ئیمپراتۆریا خۆ و ل دووڤدا ژی ئەڤ ئاینە ل وەلاتێن دەوروبەر ژی بەربەلاڤبوو هەتا ل لایێ باشوری گەهشتیە دەڤەرا "سیلان" و ل ڕۆژهەلاتی گەهشتیە وەلاتێ "بۆرما"، "مەلایو" و "ئەندونوسیا" و ل باکوری ژی گەهشتە وەلاتێ ئەفگانستانێ، هەردیسان ئەڤ ئاینە گەهشتە وەلاتێ "چین"ێ کو ل وێرێ هژمارەکا مەزن یا دویکەفتیان هەبوون. ل دویڤدا ژی ژ چینێ بەرەڤ وەلاتێن یابان و کورییایێ ڤە چوو.

پشتی دەمەکی هەر ل وەلاتێ هندێ ب خۆ، ئاینێ بۆدی بەرەڤ کێمبوون و بەرزەبوونێ چوو هەتا ل سالا 1200 زاینی ب ئێکجاری بەرزەبووی، لێ ئەڤ ئاینە ل وەلاتێن چین و یابانێ هەر یێ بەربەلاڤ بوو هەتاکو دهێتە هژمارتن ئاینێ فەرمی ل دەڤەرا "تبت" و هندەک وەلاتێن دی یێن کێشوەرێ ئاسیایێ.

ڕێنما و شیرەتێن ئاینێ بۆدی نەهاتبوونە تومارکرن هەتا پشتی مرنا وی ب دەمەکێ درێژ، ژ نوو هندەک دویکەفتییێن وی ڕابوون ب تومارکرنا ڤان ڕێنمایان، ئەڤ چەندەژی ببوو ئەگەر کو هەر کەسەک ب کەیفا خۆ بنڤیسیت لەوراژی وەکی پتریا ئولێن دی، ئەڤ ئاینە ژی ژێکڤەبوو و چەندین چەقولق ژێ ڤەبوون.

گومان تێدا نینە کو بۆدا وەک ئێک ژ دانەرێن ئاینێ بۆداتییێ، یێ ژهەژییە ناڤێ وی دگەل کاریگەرترین 100 کەسێن د دیروکێ دا بهێتەدانان، هەرچەندە هژمارا دویکەفتیێن ڤی ئاینی ل سەرانسەری جیهانێ ژ 100 ملیون مرۆڤان نابوریت، ل دەمەکی کو هژمارا موسلمانان ژ ملیار مرۆڤان پترە، ئەڤ چەندەژی هندێ دگەهینیت کو کاریگەریا وی گەلەک کێمترە ژ کاریگەریا هەر ئێک ژ پێغەمبەرێ ئیسلامێ موحەمەدی (سلاڤێن خودێ ل سەربن) و پێغەمبەرێ مەسیحیان حەزرەتێ عیسایی.

لێ ئەرێ کا بوچی ئاینێ بۆدی ل وەلاتێ هندێ ب خۆ کو بنەکوکا بەلاڤبوونا ڤی ئاینی بوو بەرەڤ نەمانێ چوو، ئەگەرێن وێ ژبۆ هندێ دزڤڕن کو ئاینێ هندوکان گەلەك ڕێنما و بنەمایێن ئاینێ بۆدی بخۆڤە دگرتن، ئەڤ چەندەژی بوو ئەگەر خەلك ب ئاینێ هندوکی ڤە بهێتە گرێدان و هێدی هێدی بۆداتییێ ژبیربکەن.

دگەل ڤێ چەندێ ژی، ئاینێ بۆداتییێ ژی وەکی ئاینێن ئیسلام و مەسیحیەتێ داخازا ئاشتی و تەناهی و پێکڤە ژیانێ دکەت، گومان تێدا نینە ژی کو بنەمایێ ئاشتی و پێکڤەژیان و هێلانا دووبەرەکی و کەربێ کارتێکرنەکا کویر ل سەر ژیانا سیاسی یا وان وەلاتان هەبوو یێن باوەری ب ڤی ئاینی ئینایی.

ئەو چەندە ناهێتە ڤەشارتن ئەگەر جارەکا دی حەزرەتێ عیسایی ڤەگەریتە ژیانێ، دێ گەلەك تۆرەبیت ژبەر وان تاوانێن ب ناڤێ وی هاتینە ئەنجامدان ب تایبەت وان شەڕێن مەزن و خویناوی یێن دناڤبەرا جڤاکێن مەسیحی ل ئەورۆپا پەیدابووین، د هەمان دەمدا ئەگەر بۆدا ژی ب زڤڕیتەڤە ژیانێ دێ بینیت کو گەلەك تشت ژ زاردەڤێ وی هاتینە گوتن و ئەو یێ ژێ بێ گونەهە، هەردیسان ئەو شێوازێن دویفکەفتییێن وی گرتین د هزرا ویدا نەبوون و وی ئاگەهـ ژێ نەبوویە.

هەردیسان گومان تێدا نینە کو ئەو کارتێکرنا بۆدایی ل دویفکەفتییێن خۆ کری گەلەك مەزنتر و کویرتربوویە ژ وێ کارتێکرنا ڕێنمایێن ئاینێ حەزرەتێ مەسیحی ل دویفکەفتییێن خۆ کری، ئەم دشێن بێژین کو ئەو کارتێکرنا بۆدایی ل وەلاتێ هندێ و کونفۆشیوسی ل وەلاتێ چینێ کری هندی ئێك بوویە یان نێزیکی ئێکە.

د ڤێ لیستێ دا ژبەر دوو ئەگەران مە بۆدا دانایە بەری کونفۆشیوسی،

- ئێك: ل وەلاتێ چینێ شوعیاتی یانژی کومیونیزم شیایە ب سەر ئاینێ کونفۆشیوسی بکەڤیت و ب ڤێ چەندێ هژمارا دویفکەفتییێن ئاینی بۆدی پتر ماینە و کارتێکرنا وێ ب هێزتربوو.
- دوو: ئاینێ کونفۆشیوسی نەشیابوو ژ وەلاتێ چینێ دەرکەڤیت و کارتێکرنێ ل خەلکێ وەلاتێن دی بکەت، ئەڤ چەندە خالا جووداهیێ یا سەرەکی بوو دناڤبەرا ڤان هەردوو ئاینان دا.

## 5. كونفۆشيوس Confucius

## (551 ب.ز – 479 ب.ز)

### كونفۆشيوس

### ئەو فەيلەسوفێ شيايى بۆ پتر ژ هزار سالان كاريگەرييێ ل خەلكێ چينێ بكەت

كونفۆشيوس دهێتە هەژمارتن ئێكەم فەيلەسوفێ چينى كو شياى ب سەركەفتيانە رێبازەكێ ب دانيت كو دەربرينێ ژ گشت هزروبير و بوچوونێن چينى دەربارەى رەفتارێن جڤاكى و رەوشتى بكەت. فەلسەفا كونفۆشيوسى پشت بەستنێ دكەتە سەر بەهايێن رەوشتى يێن كەسايەتى، زێدەبارى هندێ كو دڤێت حكومەت خزمەتا خەلكى بكەت نەك بەروڤاژى. ڤان هزروبيران شيان كونترۆلێ ل سەر رەفتارێن خەلكێ چينێ بكەن بۆ ماوێ پتر ژ هزار سالان.

كونفۆشيوس ل سالا 551 بەرى زاينى ل ويلايەتا "لو" ل باكورێ چينێ ژدايكبوويە، هێشتا زاروك بوو دەمێ بابێ وى وەغەرا دوماهيێ كرى لەورا دگەل دەيكا خۆ د ژيانەكا گەلەك هەژار و بزەحمەت ژيايە، پشتى مەزن ژى بووى وەك فەرمانبەر ل سەر ميلاكێ حكومەتێ هاتيە دامەزراندن و كاركريە لێ پشتى هينگێ دەست ژ كارێ فەرمانبەرييێ بەردايە و ل دويڤدا ژبۆ ماوێ نێزيكى 16 سالان ل گەلەك باژێر و دەڤەران گەريا و بەردەوام ژبۆ خەلكى د ئاخفت و گوتار پێشكێشدكرن لەورا ژى هژمارەكا مەزن يا خەلكى ب دويفكەفت و گوهداريا هزروبيرێن وى دكر.

دەمێ گەهشتيە ژيێ 50 ساليێ، دووبارە ڤەگەريا سەر كارێ خۆ وەك فەرمانبەرێ حكومەتێ، لێ هندەك نەيارێن وى يێن كو چاڤ ب شيانێن وى نەرادبووين شيان هندەك پيلانان دژى وى ب دارێژن و ژ كارێ وى دووربێخن، ژبەر ڤێ چەندێ كونفۆشيوسى ب ئێكجارێ وەلاتێ خۆ بجهـ هێلا و ل دويڤدا دووبارە ژبۆ ماوێ پتر ژ 13 سالان ژ وەلاتەكى دچوو وەلاتەكێ دى و ل سەر پێشكێشكرنا گوتارێن خۆ ژبۆ خەلكى يێ بەردەوام بوو. ل

دوماهیێ زڤڕی بۆ وەلاتێ خۆ چینێ و پێنج سالێن دوماهیێ ژ ژیێ خۆ ل وێرێ بوراندن هەتا کو ل سالا 479 بەری زاینی وەغەر کری.

گەلەك کەسان کونفۆشیوس هوسا دایە نیاسین کو ئێکە ژ دانەرێن ئاینەکێ مەزن، لێ ئەگەر ب شێوەیەکێ کویرتر تەماشەی ڤێ چەندێ بکەین دێ ژبۆ مە دیاربیت کو ڕێبازا وی چ بنەمایێن ئاینی یان ئۆلی تێدا نەبوون بەلکو ڕێبازەکا کەسایەتی و سەربەخۆ بوو ژبەرکو وی د گوتارێن خۆدا بەحسێ هەبوونا خودێ و ئەرد و ئەسمانان نەدکر. لێ بەروڤاژی، ڕێبازا وی دەربڕین ژ ڕێکەکا تایبەت یا ژیانێ و ڕەفتارێن جڤاکی و سیاسی دکر، هەردیسان ڤێ ڕێبازێ دووپاتی ل سەر حەژێکرن و ڕێزگرتن و هاریکاریا دناڤبەرا خەلکی دا دکر، زێدەباری سەرەدەریا وان دگەل ئێکودوو و ب کارئینانا شێوازەکێ هەڤپەیڤینێ یێ نەرم و جوان و زمان و دەست پاقژیێ.

هەردیسان ڕێبازا وی خەلك شیرەت دکر کو ڕێزێ ل کەسێن مەزن و خۆدان بها بگرن، خێزان د ئێکگرتی و ب هێزبن و زاروك ڕێزێ ل مەزنان بگرن و مەزن ژی دلوڤانی و ڤیانێ ب زاروکان ببەن، ژن خزمەت و گوهداریا هەڤژینێ خۆ بکەت، د هەمان دەمدا ویژی گەلەك کەرب ژ زۆردار و ستەمکاران ڤەدبوون.

کونفۆشیوسی باوەری ب هندێ هەبوو کو دڤێت حکومەت د خزمەتا خەلکی دا کاربکەت نەك زۆریێ لێ بکەت و مافێن وان بخوت، هەردیسان کەسێ دەستهەلاتدار و فەرمانڕەوا دڤێت نموونەیا هەرە بلند و باش بیت ژبۆ خەلکی و خۆدان ڕەوشتەکێ بلند بیت، ب کورتی هەمی هزروبوچوونێن کونفۆشیوسی د وێ گوتنێ دا کوم دبوون یا دبێژت (تە چەند ژبۆ خۆ بڤێت، دڤێت تە هند ژبۆ کەسێن دیژی بڤێت).

تشتێ کونفۆشیوس ژ گەلەك فەیلەسوفێن دی جووداکری ئەوبوو کو ب شێوەیەکێ جوودا دەربڕین ژدیتنا خۆ بۆ ژیانێ دکر، وی هزرکر کو چەرخێ زێرین یێ مرۆڤایەتیێ ئەو چەرخ بوو یێ بووری ئانکو چەرخێن ڕابردوویی، د هەمان دەمدا وی گەلەك هزرا سەردەمێن بەرێ و ڕابردوویێ خۆ دکر و پشتەڤانیا خەلکی ژی دکر هزرا خۆ د ژیانا ڕابردوویی دا بکەن، لێ دەستهەلاتدارێن وی سەردەمی دژی ڤان هزروبیران بوون و ب بوچوونا وان ئەوبوو دڤێت هەردەم بەرێ مرۆڤی ل پاشەڕۆژێ بیت و ڕابردوویی ب تنێ ژبۆ مفا وەرگرتن ژ سەربوران بکاربینیت.

ئەڤ چەندە ببوو ئەگەر کو گەلەك کەس دژی هزروبیرێن کونفۆشیوسی ب ڕاوەستن و ب کەسەکێ نەزان ل قەلەم بدەن، ئەڤ نەڕازیبوونە هەتا پشتی مرنا ویژی ژبۆ ماوێ چەندین چەرخان بەردەوام بوون هەتا بوویە ئەگەر ئێك ژ شاهێن چینێ بڕیاردا هەمی پەرتووکێن وی بهێنە سووتن و دویفکەفتنا ڕێبازا وی دناڤ وەلاتی بهێتە قەدەغەکرن.

سەرەڕای ڤان ڕەخنە و دژایەتیان، لێ ڕێبازا کونفۆشیوسی هەر یا بەردەوام بوو و شیا ژبۆ ماوێ پتر ژ بیست چەرخان ئانکو هەر ژ چەرخێ ئێکێ بەری زاینی هەتا دوماهیا چەرخێ نوزدێ زاینێ کارتێکرنێ ل ژیانا خەلکی بکەت.

باوەریا خەلکێ چینێ ب ڕێبازا کونفۆشیوسی بۆ دوو ئەگەران دزڤڕیت، ئەوژی ئەڤەنە:

- ئێك: کونفۆشیوس کەسەکێ ڕاستگوو و دلسوز بوو دگەل خەلکی.
- دوو: کونفۆشیوس کەسەکێ چەلەنگ و خۆدان بریار و کارکەر بوو، ئانکو ڕێبازا وی ب تنێ پەیام نەبوو بەلکو وی ب خۆ و بەری هەمی کەسان کار ب پەیاما خۆ دکر و ئەڤ چەندەژی دگەل حەز و ئارەزوویێن جڤاکێ چینی د گونجیا و ئەو تشتێ وان دڤیایی دناڤ ڤێ ڕێبازێ دا هەبوو، هەر ئەڤ چەندەبوو کو بوویە ئەگەر ڕێبازا وی زویکا دناڤ خەلکی دا بەلاڤ بیت و بۆ ماوەیەکێ درێژ کار پێ بهێتەکرن.

لێ پشتی وەلاتێ چینێ هاتیە گوهۆرین ژبۆ جڤاکەکێ شیوعی و خەلکی بەرێ خۆ دایە پاشەڕوژێ، هێدی هێدی ئەڤ ڕێبازەژی بەرەڤ لاوازبوونێ چوو هەتا ل دوماهیێ ب ئێکجاری بەرزەبووی.

## 6. قەشە بۆلس St. Paul

(4ز-64ز)

### قەشە بۆلس

### ئەو پەیامنێرێ مەسیحیەت ژ ڕێبازەکا سادە کریە ئاینەکێ مەزن

قەشە بۆلس ئەو پەیامنێر بوو یێ ل سەردەمێ حەزرەتێ عیسای ژیایی و دهێتە هژمارتن مەزنترین مزگینگەهینەرێ ئاینێ مەسیحیەتێ ژبەرکو کارتێکرنا وی ل سەر ڤێ ئاینی کری گەلەك یا مەزن بوو، هەتا وی ڕادەیی کو پتریا دیروکنڤیسان د وێ باوەرێ دانە کو بۆلس مەزنترین و گرنگترین کەس بوو یێ ئەڤ ئاینە بەلاڤ کری و ڕێنماییێن وێ پاراستین.

بۆلس، هەردیسان دهێتە نیاسین ب "شاول" ل باژێرێ "تەرسۆس" ل وەلاتێ تورکیا کەڤن ژدایکبوویە، هەرچەندە کەسەکێ ڕۆمانی بوو لێ ل سەر ئولا جوهیان بوو، هێشتا دژییێ گەنجاتییێ دا زمانێ عبری خواند و بەرەڤ باژێرێ قودسێ چوویە و ل وێرێ زانست و زانین وەرگرتیە، دەمێ چوویە قودسێ ببوو قوتابی ل بەردەستێ حاخامێ جوهی یێ مەزن "جەمالیل"ی، هەرچەندە قەشە بۆلسی ل سەردەمێ حەزرەتێ عیسای سەرەدانا قودسێ کربوو لێ وی ب خۆ چاڤ ب عیسای نەکەفتبوو.

پشتی ل خاچدانا حەزرەتێ عیسایی، دویفکەفتییێن وی تووشی ئەشکەنجەدانەکا مەزن ببوون ب تاوانا دەرکەفتنێ ژ دینێ جوهیان، ل وی سەردەمی قەشە بۆلسی ب خۆ گەلەك کەس ئەشکەنجەددان و دژی وان کەسان دراوەستیا یێن باوەری ب ئاینێ مەسیحی ئینای. لێ د سەرەدانەکا خۆ دا ژبۆ باژێرێ قودسێ، بۆلسی حەزرەتێ مەسیحی د خەوا خۆدا دیت و ئەڤ خەونە بوو ئەگەر ئەو باوەرییێ ب ئاینێ مەسیحیان بینیت، ئەڤ چەندە ببوو خالا وەرگەیانێ د ژیانا بۆلسی و دیروکا ئاینێ مەسیحیەتێ ژبەرکو ئەو زەلامێ ل ڕوژەکێ مەزنترین و دژوارترین دوژمنێ ئاینێ مەسیحیان ئەڤروکە بوویە ئێك ژ نێزیکترین کەسێن پشتەڤانیا ڤی ئاینی دکەن و بەربەلاڤ دکەن.

پشتی هینگیّ قەشە بۆلسی ژیانا خۆ هەمی ب نڤیسینا ئاینیّ مەسیحیەتیّ ڤە بوراند و دەست ب بەلاڤکرنا وی دکر و بوو ئەگەر هژمارەکا مەزن یا خەلکی بهێنە سەر ڤی ئاینی. ڤی قەشەی سەرەدانا گەلەك وەلات و دەڤەران دکر وبەردەوام ژبۆ خەلکی د ئاخفت و داخاز ژێ دکر بهێنە سەر ئاینیّ مەسیحیەتیّ، وی سەرەدنا تورکیا کەڤن و وەلاتێن گریکی و سوریا و فەلەستینیّ کر. دەمیّ بۆلس ل سەر ئاینیّ جوهیان کەسەکیّ بانگخواز نەبوو و داخازا ژ خەلکی نەدکر بهێنە سەر ئاینیّ جوهیان لیّ بەرۆڤاژی پشتی هاتنا وی بۆ سەر ئاینیّ مەسیحیەتیّ ببوو کەسەکیّ بانگخواز ییّ زیرەك و چەلەنگ کو کەس بەری وی و پشتی وی نەشیابوو وەکی وی ڤی ئاینی بەلاڤ بکەت لەوڕاژی ژیانا وی کەفتبوو د مەترسیەکا مەزندا.

رۆلیّ قەشە بۆلسی ژبۆ هندیّ د زڤڕیت کو ئەو شیا ب شێوەیەکیّ جوان و باوەرپێکری گەلەك تشتان ل سەر ئاینیّ مەسیحیەتیّ بنڤێسیت و ڕێنما و شەڕیعەتیّ مەسیحیەتیّ پێش بێخیت و هژمارەکا مەزن یا خەلکی بینتە سەر ڤی ئاینی، ژ سەرجەمیّ 27 سەفەرێن پەرتووکا پیرۆز ئینجیلیّ " پەرتووکا سەردەمیّ نوو"، دیّ بینین کو بۆلسی ب تنیّ 14 سەفەر نڤێساینە.

ژ گرنگترین بوچوونێن قەشە بۆلسی: حەرزەتیّ عیسای ب تنیّ پێغەمبەرەکیّ مزگینگەهینەر نەبوو بەلکو خوداوەندەکیّ ڕاست ژی بوو، ئەوی ژیانا خۆ گوری مرۆڤان کر داکو گونەهێن وان بهێنە ژێبرن، لەوڕا مرۆڤ نەشێن ڤیّ گونەهژێبرنیّ ب دەستڤە بینن ئەگەر ئەو ب تنیّ باوەرییّ ب پەرتووکێن پیرۆز بینن بەلکو دڤێت ئەو باوەرییّ ب حەزڕەتیّ عیسای ژی بینن، لەوڕا ئەگەر مرۆڤان باوەری ب حەزڕەتیّ عیسای ئینا دیّ گونەهێن وان هێنە ژێبرن، هەردیسان قەشە بۆلس ئەو کەس بوو ییّ هزرا گونەها ڕەسەن "گونەها ئێکیّ" شرۆڤەکری ئانکو ئەو گونەها بۆ ئێکەم جار ئادەمی ب بەهەشتیّ کری دەمیّ سێڤا حەرامکری خاری و کو ب دیتنا وی ئەڤ گونەهە بۆ هەمی مرۆڤان دزڤڕیت.

هەردیسان قەشە بۆلسی ئەو چەندەژی ڕاگەهاندبوو کو پێدڤی ب هندیّ ناکەت مرۆڤ خۆ ب گەلەك ڕێوڕەسمێن ئاینیّ جوهیان دەربارەی خۆارن و پاقژییّ ڤە گرێبدەت، هەردیسان دڤێت خۆ ب ڕێنماییێن موسایی ژی ڤە گرێدەنەت ژبەرکو ئەنجامدانا ڤان

ڕێوڕەسمان بەس نینە مرۆڤ ژ گونەها بهێتە پاقژکرن بەلکو باوەریا ڕاست ب تنێ دشێت لەش و گیانێ مرۆڤی فورتال بکەت.

قەشە بۆلسی دژیانا خۆدا خێزان پێکنەئینابوو، هەتا نێزیکی چ ئافرەتان ژی نەبوو، وی بوچوونەکا تایبەت و جودا دەربارەی ئافرەت و ژن ئینان و کریارا سیکسی هەبوو و ڤێ بوچوونێ کارتێکرنەکا مەزن وکویر ل سەر هزرا ئەورۆپیان کر.

بۆلس د ناما خۆ یا ئێکێ دا بۆ خەلکێ "کرۆنوسوس"ی دبێژیت:

(ئەز بێژمە کەسێن زگورد و ژنکێن زەلامێن وان مرین و زەلامێن ژنێن وان مرین بۆ وان باشترە ئەو وەکی من بمینن و ژیانا هەڤژینییێ پێك نەئینن، لێ ئەگەر نەشیان کونترۆلێ ل سەر خۆ بکەن بلا ژیانا هەڤژینییێ پێك بینن چونکی هەڤژینی ژبۆ وان باشترە، شیرەتا من بۆ کەسێن خێزاندار ژی ئەوە بلا ب چ ڕەنگان ژنك زەلامێن خۆ نەهێلن، ئەگەر زەلامێن وان مرن ژی بلا ئێدی شوی نەکەن، هەردیسان زەلام ژی ب هەما شێوە بلا ژنێن خۆ بەرنەدەن و نەهێلن).

هەردیسان قەشە بۆلس د ناما خۆ دا بۆ "تیوساوس"ی دبێژیت:

(پێدڤیە ژن فێربیتە بێدەنگی و گوهدان و خۆ شکاندنێ، نابیت ب چ ڕەنگان ئەو دەستهەلاتێ ل سەر زەلامێ خۆ بکەت چونکی ئادەم بەری حەوایێ یێ هاتیە ئافراندن).

هەرچەندە قەشە بۆلسی گەلەك بوچوون ل سەر دەمێ خۆ بەلاڤ دکرن لێ حەرزەتێ مەسیحی بەحسێ چ ژ ڤان بوچوون و هزران ل سەر دەمێ خۆ نەکربوون.

بۆلسێ پەیامنێر ئەو کەس بوو یێ شیایی ئاینێ مەسیحیەتێ ژ ڕێبازەکا جوهی یا سادە بکەتە ئاینەکێ مەزن ل جیهانێ لەوڕاژی هندەك فەیلەسوفێن مەسیحی دوێ باوەرێ دانە کو قەشە بۆلس ئێکەم کەس بوو یێ ئاینێ مەسیحیەتێ بەلاڤ کری، لێ ئەم دشێن بێژین بۆلس نەدشیا ڤی کارێ هندێ مەزن بکەت هەکە حەزرەتێ مەسیح ب خۆ نەهاتبا لەورا ڕۆلێ سەرەکی و گرنگتر هەر دێ بۆ حەزرەتێ مەسیحی زڤڕیت.

## 7. تسی ئای لوون Ts’ai Lun

## (دەوروبەری سالا 105 زاینی ژیایە)

### تسی ئای لوون

### ئەو فەرمانبەرێ بۆ ئێکەم جار کاغەزێن نڤێسینێ داهێنایی

تسی ئای لوون ئەو داهێنەرە یێ ژبۆ ئێکەم جار کاغەز یانژی وەرەقە داهێناین، هەرچەندە ناڤێ ڤی داهێنەری گەلەك کێم د پەرتووك و ژێدەراندا دهێتە دیتن لێ ئەڤ چەندە رامانا هندێ نادەت کو چ راستی بۆ هەبوونا وی نینن یانژی وی ئەڤ داهێنانە ئەنجام نەدابیت.

تسی ئای لوون کەسەکێ چینی بوو و ل سەردەمێ خۆ وەك فەرمانبەر ژبۆ ئیمپراتۆریا چینێ کارکریە و ڤێ چەندێ هاریکاریا وی کر ئەو کاغەزان دروست بکەت و ئەڤ چەندەژی بوو ئەگەر ئەو ژلایێ ئیمپراتۆریا چینێ ڤە بهێتە خەلاتکرن و رێز لێ بهێتە گرتن.

بەری داهێنانا کاغەزان، مرۆڤ نەچاربوون دیروکا خۆ و کاروبارێن خۆ یێن رۆژانە ل سەر پارچەیێن دار و بەران و پیستێ گیانەوەران تومار بکەت، ل هندەك وەلاتان وەك فیرعەونی و گریکیان نامەیێن پۆستان هەبوون، لێ داهێنانا تسی ئای لوونی ب تەمامی رویێ دیروکێ وەرگێرا و گوهۆرینەکا گەلەك مەزن پەیداکر ژبەرکو داهێنانا وی دهێتە هەژمارتن ئێك ژ مەزنترین داهێنانێن مرۆڤایەتی د دیروکێ دا.

مللەتێ عەرەب ل چەرخێ شەشێ زاینی شیان کاغەزێن چینی ب دەستخوڤە بێخن، پشتی ماوەیەکێ کێم خەلکێ دەڤەرا رۆژهەلات ل وەلاتێ سەرمەرقەندێ شیان کاغەزان ل سەر شێوازێ چینیان دروست بکەن و ل دویڤدا عەرەبان ژی بۆ خۆ ئەڤ کاغەزە دروستکرن و ل دووڤدا ژبۆ وەلاتێن ئەوروپی ژی هاتنە ڤەگۆهاستن، لێ هەر زوی دروستکرنا کاغەزان گەلەك پێشکەفتن ب خۆڤە دیت و ب رێکێن ب سانەهیتر و بلەزتر هاتنە دروستکرن ژ وان رێکان یێن ل چینێ د هاتینە دروستکرن.

ل سەردەمێ ئەڤروکەژی کاغەز بووینە ئێك ژ پێدڤی یێن هەرە سەرەکی و گرنگ د ژیانا مرۆڤاندا و دبیت یا بزەحمەت بیت بۆمە ئەم هزرا خۆ د وێ ژیان و شارستانیا مرۆڤاندا بکەین ئەگەر کاغەز نەهاتبانە دروستکرن، هەلبەت ئیمپراتۆریا چینی یا وی سەردەمی ڕۆلەکێ مەزن و کاریگەر هەبوو ل سەر پشتەڤانی و پێشئێخستنا ڕێکێن دروستکرنا کاغەزان و ڤەگۆهاستنا وان ژ بەربابکەکی بۆ بەرەبابکێن ل دویڤ خۆ دا.

ل وی سەردەمی، زانایەکێ چینی دا پێدڤی ب عەرەبانەکا گەلەك مەزن بیت ژبۆ هندێ بشێت پەرتووکەکا خۆ ژ دەڤەرەکێ ب گەهینیتە دەڤەرەکا دی، لێ د سەردەمێ ئەڤروکە دا هەر کەسەك دشێت پەرتووکەکێ بکەتە د بەریکا خۆدا کو ژ هزار لاپەران پێکبهێت، هەردیسان دشێت پەرتووکخانەیەکا پەرتووکان کو ژ هزار پەرتووکان پێکبهێت بکەتە د بەریکا خۆدا ئەگەر ل سەر CD یان فلاش میموریەکی ب هەلگریت

## 8. جوهان گوتەنبەرگ Johann Gutenberg

## (1400ز – 1468ز)

### یوهان گوتەنبەرگ

### ئەو کەسێ ژبۆ ئێکەم جار پیت ل سەر کاغەزان چاپکرین

ئەرێ کیژ ژ وان یێ ژ هەژیترە ناڤێ وی ل بەراهیا یێ دی دناڤ لیستا 100 کاریگەرترین کەس د دیروکێ دا بهێتە دانان، داهێنەرێ کاغەزێ تسی ئای لوون، یانژی داهێنەرێ ئامیرێ چاپکرنێ گوتەنبەرگ؟

زانایێ ئەلمانی یوهان گوتەنبەرگ ئێکەم کەس بوو شیایی ئامیری چاپکرنێ دروست بکەت، ئانکو ئەو ئامیری دشێت پیتان دانیتە ب ڕەخ ئێك ڤە ب دووراتیەکا یەکسان و ڕێکخستی، ل دویڤدا دێ کاغەزەکێ دانیتە سەر ڤی ئامیرەی و پشتی فشارێ دئێختە سەر دێ کاغەزەکا چاپکری دروست بیت. هەرچەندە ئەڤ داهێنانا گوتەنبەرگی ژی گەلەك یا مەزن بوو لێ ئەگەر کاغەز نەبان داهێنانا ویژی چ مفا نەدبوو، لەوڕا ئەم دشێن بێژین گرنگیا کاغەزێ بەری یا ئامیری چاپکرنێ دهێت ژبەر ڤێ چەندێ مەژی ناڤێ داهێنەرێ کاغەزێ ل بەری ناڤێ داهێنەرێ ئامیرێ چاپکرنێ یێ دانایی.

جوهان گوتەنبەرگ ل سالا 1400 زاینی ل باژێرێ "مینسی" ل ئەلمانیا ژدایکبوویە، ئەڤی زانایی شیا ئامیرەکی ب داهێنیت کو دشیانێن ویدابوو پیتان ب شێوەیەکێ زراڤ و ژێکڤەبوویی بنڤێسیت، ل دویڤدا ئەڤ ئامیرە دێ ڕابیت ب شداندن و گرێدانا پیتان پێکڤە و دەمێ کاغەزەکێ دانیە سەر ئامیرەی دێ وان پیتان ل سەر کاغەزێ چاپکەت، ب ڤێ داهێنانێ گوتەنبەرگ شیا دیروکێ بەرەڤ ئاسویەکێ گەشتر پالدەت.

گوتەنبەرگ زەلامەکێ بازرگان بوو لێ د کارێ خۆ یێ بازرگانیێ دا یێ سەرکەفتی نەبوو لەوڕا ژی نەشیا چ پارەیەکی ب هاریکاریا ڤێ داهێنانا خۆ ب دەستڤە بینیت، بۆ نموونە دەمێ ژبۆ ئێکەم جار پەرتووکا پیرۆز "ئینجیل" چاپکری، ژبیرکر ناڤێ خۆ ل سەر لاپەڕێن پەرتووکێ بنڤیسیت لەوڕا کەسێ ئاگەهـ ژ داهێنانا وی نەبوو.

پشتی هینگی چەندین ئارپشە و نەخۆشی بۆ گوتەنبەرگی پەیدابوون و مژیلبوونا وی ب چارەسەرکرنا ڤان ئارپشەیانڤە بوو ئەگەر ئەو ژبیربکەت کو وی داهێنانەکا مرۆڤایەتی یا مەزن یا کری. لێ پشتی داهێنانا وی وەلاتێن ئەوروپی د ماوەیەکێ کێمدا ب شێوەیەکی بەرچاڤ گەلەك پێشکەفتن ب ڕەنگەکی کو دەهـ چەرخێن بەری هینگێ وان هند پێشکەفتن بخۆڤە نەدیتبوو.

دبیت ئەگەر ئەم بێژین هەکە داهێنەرێ تێلەفونێ گراهام بیلی تێلەفون دروست نەکربا، ڕەنگە کەسەکێ دی هاتبا و تێلەفون دروست کربا، بۆ گوتەنبەرگی ژی ئەم دشێن هەمان تشت بێژین، لێ جوداهی ئەوە ئەگەر کەسەکێ دی پشتی چەند چەرخەکان ژ نوو ئامیرێ چاپکرنا پیتان دروستکربا ڕەنگە ئەو پێشکەفتنا ئەڤروکە ژبۆ ماوێ چەندین چەرخێن دی گیرو ببا، ژبەر ڕۆلێ داهێنانا وی یا گرنگ مە ژ هەژی دیت ناڤێ گوتەنبەرگی دناڤ ڤێ لیستێ دا ب دانین.

## 9. کریستۆفەر کۆلومبوس Christopher Columbus

## (1451ز -1606ز)

### کریستۆفەر کۆلومبوس

### ئەو گەرۆکێ کێشوەرێ ئەمریکا ب شاشیڤە ئاشکەراکری

کریستۆفەر کۆلومبوس ئەو گەرۆکێ دەریایی بوو یێ کو بزاڤ دکرن ب ڕێکا زەریا ئەتلەسی بچیتە وەلاتێ چینێ ژبۆ بدەستڤەئینانا بهاراتان لێ وی هند دیت ئەو یێ ل کێشوەرێ ئەمریکا، ئەڤ ئاشکەراکرنا وی بۆ ئەگەر ئەو دەرگەهی لبەر چەندین ئاشکەراکرنێن دی و داگیرکرنا جیهانا نوو ڤەکەت.

هەلبەت کارتێکرنا ڤی گەریانا وی ل سەر دیروکا مرۆڤایەتیێ گەلەك ژ وێ چەندی مەزنترە یا مرۆڤ پێشبینیێ بۆ دکەت ژبەرکو ئەو شیا دوو کێشوەرێن دی ژبۆ کێشوەرێ ئەوروپا زێدە بکەت، ئەو چەندەژی ژبەر هەبوونا ژێدەرەکێ گرنگ و هژمارەکا مەزن یا گلکەنێن زێڕ و زیڤ و کەرەستێن سرۆشتی و خاڤ.

کۆلومبوس گەرۆکەکێ دەریایی یێ ئیتالی بوو، ل سالا 1451 ژدایکبوویە. هێشتا یێ گەنج کارێ گەریانێ ب ڕێکا پاپۆران دکر، پشتی هینگێ هزرەك بوو وی چێبوو ئەوژی ب هاریکاریا زەریا ئەتلەسی ڕێکەکا نوو بەرەڤ وەلاتێن ڕۆژهەلاتی ب تایبەت چینی دیاربکەت ژبەرکو ل وی سەردەمی ڕێکا ئێکانەیا ئەوروپا ب وەلاتێن ڕۆژهەلاتی ڤە گرێددا ب تنێ وەلاتێ تورکیا بوو کو ل ژێر دەستهەلاتا عوسمانیان ڤەبوو، ل وی سەردەمی ژی عوسمانیان ڕێك نەددا خەلکێ مەسیحی ل سەر ئاخا وەلاتێ وانرا هاتنوچوون و بازرگانیێ بکەن لەورا کۆلومبوسی بزاڤکر ڕێکەکا نوو ئاشکەرا بکەت.

ل دویڤدا کۆلومبوس شیا شاهژنا وی سەردەمی یا وەلاتێ ئیسپانیا کو ئیزابێلا بوو ڕازی بکەت هاریکاریا دراڤی ژبۆ ڤێ گەریانا وی یا چارەنڤیس بکەت، هەرچەندە ل دەستپێکێ شاهژن ڕازی نەبوو لێ پشتی چەندین دیداران دگەل کۆلومبوسی ڕازیبوو هاریکاریا وی بکەت.

کۆلومبوسی ئێکەم گەریانا خۆ یا دەریایی ل ڕێکەفتی 3 تەباخا 1492 دەستپێکر، ل دەسپێکێ پاپۆرا وی لبەر لێڤێن گزیرتا "کونتریا" ل کێشوەرێ ئەفریقیا ڕاوەستیا، ل دویڤدا ل ڕۆژا 6 ئیلونێ گەریانا خۆ بەرەڤ ڕۆژئاڤایی دەستپێکر، ئەڤ گەریانا وی گەلەك درێژبوو و هەتا بوویە ئەگەرێ ترساندنا هەمی گەمیڤانێن دگەل وی ژبەرکو بەری هینگێ وی گوتبوو گەمیڤانان کو گەشتا وان ب تنێ دێ دوو حەفتیان ڤەکێشیت لەوڕا هەڤالێن وی فشار لێکر ئەو ب زڤڕنەڤە، لێ پشتی هینگێ ئەو شیا هەڤالێن خۆ ڕازی بکەت ول سەر گەشتا خۆ بەردەوام بوون هەتا ل ڕۆژا 21 چریا ئێکێ ل سالا 1492 گەهشتینە سەر ئاخا کێشوەرێ ئەمریکا.

پشتی ڤێ گەریانا درێژ ڤەگەریا وەلاتێ ئیسپانیا و پێشوازیەکا مەزن لێ هاتە کرن، ل دویڤدا ژی سێ گەشتێن دی ئەنجامدان لێ هەر ب ڕێکا دەریایی نەگەهشتە وەلاتێن چین و یابانێ کو خەونا وی یا هەرە مەزن بوو. هەرچەندە ل دەستپێکێ شاهژنا ئیزابێلایێ سوزدابوو وی کو هەر جهەکێ نوو یێ ئەو ئاشکەرا بکەت دێ وی کەتە دەستهەلاتدارێ وێ دەڤەرێ، لێ ژبەرکو ژلایێ کارگێریڤە کەسەکی سەرکەفتی نەبوو لەوڕا هەر زوی ئەو زڤڕاندەڤە وەلاتێ ئیسپانیا و دەست و پێن وی د کەلامچەکری بوون.

هەتانوکە ژی گەلەك گومان و بوچوون ل سەر ڤێ سەرکەفتنا مەزن یا کۆلومبوسی توماکری هەنە، بۆ نموونە هندەك دیروکنڤێس د وێ باوەرێ دانە کو گەرۆکێ دەریایی یێ نەرویجی "لایف ئەریکسون" بەری کۆلومبوسی کێشوەرێ ئەمریکا ئاشکەرا کربوو لێ ڤێ ئاشکەراکرنا وی چ شۆڕەشێن مەزن د ژیانا سیاسی و ئابوری و هزری یا وەلاتێن ئەوروپی دا نەکرن.

لێ بەروڤاژی کۆلومبوس ب گەشتا خۆ یا دەریایی شیا کێشوەرێ ئەوروپا ب هەژینیت ژبەرکو ئەو شیا ڕێکێ ل هەمبەر جیهانەکا نوو ڤەکەت کو ژێدەرێن گرنگ یێن کەرەستێن خاڤ و زێڕ و زیف و شارستانیێن کەڤن لێ هەبوون. کۆلومبوس کەسەکێ دژوار و زۆردار بوو، هەروەسا ژلایێ جەستەیی ڤە گەلەك یێ زراڤ و زەعیف بوو، هێشتا یێ گەنج وی دڤیا ڤی پرۆژێ خۆ ئەنجامبدەت لێ ژبەر هەڤڕکیەکا دژوار دناڤبەرا وی و شاهژنا ئیسپانیا ئەڤ پرۆژە گیروبوو، هەردیسان کولۆمبوسی سەرەدەریەکا گەلەك ڕەق و نەخۆش دگەل هندوکێن سۆر ل کێشوەرێ ئەمریکا دکر.

**ئەگەر مە ڤاڤارتنا ڤان کەسێن مەزن و داهێنەر ل دویڤ ڕەوشت و سەرەدرەیا وان ئەنجامدابا، چ پێ نەڤێت دا ناڤێ کۆلومبوسی ل دوماهیا ڤێ لیستێ هێت، لێ ڤاڤارتنا مە ژبۆ ڤان کەسان ل سەر بنەمایێ کارتێکرنا وان ل سەر دیروکا مرۆڤایەتیێ بوویە لەورا ناڤێ ویژی ل دەستپێکا لیستێ هاتیە.**

## 10. ئەلبێرت ئەنیشتاین Albert Einstein

## (1879ز- 1955ز)

### ئەلبێرت ئەنیشتاین

### ئەو زانایێ بەری بنیاتێ زانستێ فیزیا سەردەم دانایی

ئەنیشتاین دهێته هەژمارتن مەزنترین و بناڤۆدەنگترین زانایێ چەرخێ بیستێ، دەمێ ناڤێ وی دهێته گوهێن مە ئێكسەر هزرا مە ل تیورا "ڕێژەیی"ێ دهێت، هەرچەندە دوو تیورێن دیژی ب هەمان ناڤ هەنە، ئێك ژ وان ل سالا 1905 هاتبوو بەلاڤکرن ل ژێر ناڤێ "تیورا ڕێژەیی یا تایبەت" و یا دوێ ژی ل سالا 1915 ل ژێر ناڤێ "تیورا ڕێژەیی یا گشتی". ئەڤ هەردوو تیورە هند ئالۆز و ب زەحمەتن چ کەس نەشێن ب شێوەیەکێ ئاسایی د گوڤارەکێ دا شرۆڤە بکەت یانژی ژبۆ خەلکەکێ ئاسایی شرۆڤە بکەت خۆ هەکە ئەو چەند شیانێن خۆژی ب مەزێخیت.

ئەم دشێن تا ڕادەیەکی تیورا ڕێژەی یا ئەنیشتاینی شرۆڤە بکەین ئەوژی ب نموونەکێ، هەلبەت ئەڤ نموونەژی یا ب زەحمەتە و گەلەك کەس تێناگەهن لێ ئەڤ چەندەژی بەلگەیە ل سەر ئالۆزی و زەحمەتیا ڤێ تیورێ، نموونە ب ڤی ڕەنگی یە:

ئەم دێ هزرکەین کو گەمیەکا ئەسمانی ب لەزاتیا (1000 میل\چرکە) ژ ئەردی دوورکەفت، ئەڤ لەزاتیە هاتە پیڤان ژلایێ دوو کەسان، ئێك یێ د گەمیێ دا و ئێك ژی یێ ل سەر ئەردی و ئەنجامێن هەردووکان وەکی ئێك بوون. لێ هەکە گەمیەکا دیژی بەرەڤ هەمان ئاڕاستێ گەمیێ ئێکێ ژ ئەدری دووربکەڤیت ب لەزاتیا (1800میل\چرکە) دا، هەردیسان ئەنجامێن هەردوو کەسێن ل سەر ئەردی و د گەمیێ دا ژبۆ پیڤانا لەزاتیێ دێ وەکهەڤ بن.

ل ڤێرێ ئەم دێ هزرکەین کو گەمیا ئێکێ ب (800میل\چرکە) ل بەری گەمیا دووێ دچیت، لێ تیورا ئەنیشتاینی دبێژیت ئەڤ چەندە ب تنێ خاپاندنەکە، بەلکو دیراتیا دناڤبەرا هەردوو گەمیان دا 1000 میلن نەك 800 میل. ئەڤ چەندە نهێنیا تیورا ئەنیشتاینی بوو یاکو هەمی زانایێن چەرخێ بیستی واستاندین و مەندەهۆش کرین، کەس

نەشیا ڕاستیا وێ ب سەلمینیت هەتا پشتی دەهـ سالان ژبەلاڤکرنا وێ ئەوژی پشتی کو فەلەکناس شیاین هندەك وێنەیان ژبۆ دیاردا ڕۆژگێرانێ ل جهێن جودا جودا یێن جیهانێ بگرن.

ئەنیشتاینی هندەك تیورێن دژی هەبوون کو زانستێن بیرکاری و فیزیایێ هەژاندبوون، لێ دگەل ڤێ مەزناهیێ ژی ناڤێ ئەنیشتاینی پشتی نیوتنی دڤێ لیستێ دا هاتیە دانان چونکی نیوتن شیا ب دروستاهی تیورا خۆ ژبۆ زانایێن وی سەردەمی شرۆڤەبکەت و باوەریێ ژبۆ وان دروست بکەت، لێ سەرەڕای هندێ کو ئەنیشتاین کەسەکێ گەلەك زیرەك بوو لێ نەشیابوو ڕاستیا تیورا خۆ ژبۆ خەلکی ب سەلمینیت، هەردیسان گەلەك کەسێن دیژی بەری وی هزرا ڤێ تیورێ کربوو.

ئەنیشتاین ئێکەم کەس بوو داخاز ژ حکومەتا ئەمریکا کری کو لەزێ د دروستکرنا بۆمبا ناڤۆکی دا بکەن بەری کو ئەلمانی وێ بۆمبێ دروست بکەن، لێ پشتی هینگێ گەلەك ل سەر ڤێ داخازا خۆ پەشیمان بوو ئەوژی کو پشتی هژمارەکا مەزن یا خەلکێ هیرۆشیما و ناگاساکی سەرا بۆمبێن ناڤۆکی یێن ئەمریکا گیانێ خۆ ژ دەستداین.

هەردیسان ئەنیشتاین خۆدانێ وێ هاوکێشا بناڤودەنگە یا دبێژیت:

تێهن (ووزە)= سەنگ(بارستە)x لەزاتیا ڕۆناهیێ$^2$

ئەڤ هاوکێشە برا تێهنا دەرکەفتی ژ گەردیلەکا تۆخمێ یۆرانیومێ دیاردکەت، ئانکو دەمێ گەردیلەك دهێتە گوهۆرین ژبۆ تێهنا گەرماتیێ.

ئەنیشتاین ل سالا 1879 ل باژێرێ "ئولەم" یێ ئەلمانی ژدایکبوویە و خۆاندنا خۆ ل وەلاتێ سویسرا ب دوماهی ئینایە و شیا ڕەگەزناما سویسری ب دەستخوڤە بینیت، لێ پشتی بەلاڤکرنا تیورا خۆ یا ڕێژەیی یا ئێکێ کو هێشتا ژیێ وی نەگەهشتبوو بیست سالێ، چوو وەلاتێ ئەلمانیا و ل زانکۆیەکا وێ کارکر و ل دویڤدا بوو ڕێڤەبەرێ پەیمانگەها ئیمپراتۆری ژبۆ زانستێن فەلەکی.

ئەنیشتاین شیا خەلاتێ نوبل ل سالا 1921 د زانستێ فیزیایێ دا وەربگریت، لێ ژبەرکو ئەو کەسەکێ جوهی بوو لەورا ل سالا 1933 ژبەر حکومەتا نازی یا ئەلمانی ڕەڤی

و چوو وەلاتێ ئەمریکا و ڕەگەزناما ئەمریکی ژی وەرگرت و بوو ماموستا ل زانکۆیا "نیستون" هەتا وەغەرکری.

ئەنیشتاین د ژیانا هەڤژینیا خۆ یا ئێکێ دا یێ سەرکەفتی نەبوو، لێ ژ هەڤژینا خۆ یا دووی دوو زاروك هەبوون، جوهیان داخاز ژێکر ئەو ببیتە ئێکەم سەرۆکێ دەولەتا ئیسرائیلێ لێ وی ئەڤ داخازە ڕەتکر، هەرچەندە کەسەکێ جوهی یێ ڕەگەزپەرست بوو لێ د هەما دەمدا کەرب ژ تیرۆرێ ڤەدبوون، و باوەریا وی ب ئاینی پتر وەکی یا سۆفیان بوو و وی بەردەوام دگوت (مێشکی مرۆڤی هند یێ بچووکە نەشێت ب دروستاهی د گەردونی و دیاردەیێن فەلەکی بگەهیت، ڤێجا چەوا دێ شێت د ئافراندەرێ ڤی گەردونی گەهیت؟).

هەردیسان کەسەکێ سادە و ئاسایی بوو د ژیانا خۆدا، گەلەك حەز ژ موزیکێ و ژەنینا ئامیرێ کەمانێ دکر، هەتا وی ڕادەیی وی هزردکر کو موزیك بیرکاری یە و بێی هەبوونا بیرکاریێ موزیك ژی نابیت و هەکە موزیك ژی نەبیت ئەم نەشێن هەست ب جوانیا بیرکاریێ بکەین، لەوڕا هەر جارەکا ئەو د بابەتەکێ بیرکاریێ دا مابا ئاسێ دا چیت گوهداریا موزیکا "موزارت"ی کەت.

# 11. لویس پاستەر Louis Pasteur

## (1822ز. – 1895ز.)

### لویس پاستەر

### ئەو زانایێ ژیانا ملیونەها مرۆڤان ژ نەساخیێن کوژەك ڤۆرتالکری

کیمیازانێ فرەنسی لویس پاستەر دهێتە هەژمارتن مەزنترین زانا د دیروکا زانستێ پزیشکیدا ژبەرکو کار و داهێنانێن وی بووینە ئەگەرێ پێشکەفتنێن هەرە مەزن د زانستێن سەردەمدا، لێ رۆلێ وی یێ سەرەکی و گرنگ ژبۆ هندێ دزڤریت کو ئێکەم کەس بوویە زیندەوەرێن هویر وەکی میکرۆبان ئاشکەرا کرین، زێدەباری پەیوەندیا ڤان میکرۆبان د پەیداکرنا نەساخیاندا و ب کارئینانا چەندین رێکێن خۆ پاراستنێ ژ نەخۆشیان.

پاستەر ل سالا 1822 ل باژێرێ "دۆل" ل وەلاتێ فرەنسا ژدایکبوویە و خۆاندنا خۆ ل پاریسێ تەمامکریە. لێ نەوەکی هندەك زانایێن، چ زیرەکی و بیرتیژی ل دەمێ گەنجاتیێ و د ماوێ سالێن خۆاندنا ویدا ل دەف دیارنەبوون، هەتا ئێك ژ ماموستاییێن وی دیارکربوو کو ئەو قوتابیەکێ گەلەك ئاسایی و سادە بوو د بابەتێ کیمیایێ دا و چ زیرەکیا هوسا ل دەڤ نەبوو وی ژ قوتابییێن دی جودا بکەت، لێ پشتی باوەرناما دکتورایێ ل سالا 1847 د زانستێ کیمیایێ دا وەرگرتی، هەمان ماموستایێ وی ل بوچوونا خۆ لێڤەبوو و دیارکر کو ئەو یێ شاش بوو.

هێشتا د ژیێ بیست سالیێ دابوو دەمێ شیایی ناڤۆدەنگیەکا زانستی یا باش ژبۆ خۆ پەیدابکەت، ل دویڤدا ئاراستێ خۆاندنا گوهارت و ڤەکۆلین ل سەر کریارا گەنیبوون و ترشبوونا شیری کرن. پاستەری هەمی گاڤا هزرا خۆ د هندێ دا دکر ئەرێ بوچی دەمێ مرۆڤ خۆارنێ ژبۆ ماوەیەکی بهێلیتە لبەر هەوایی دێ گەنی بیت یان شیر دێ ترش بیت، ئەڤ هزرێن وی یێن بەردەوام هاریکاریا وی کر ئەو ل دوماهیێ ئەگەرێ ڤێ چەندێ دیاربکەت، ئەوژی کو ئەگەرێ ترشبوون و گەنیبوونا خورانێ ژبۆ هندەك زیندەوەرێن گەلەك هویر و بچووك دزڤریت کو ئەم ب چاڤ نابینین دبێژنێ میکرۆب.

ل دویڤدا پاستەر گەهشتە وی ئەنجامی کو د شیانێن ڤان میکرۆباندا هەیە زیانێ بگەهینە ساخلەمیا مرۆڤی و گیانەوەران و نەخۆشیان پەیدابکەن، هەرچەندە پاستەر ئێکەم کەس نەبوو تیبینیا ڤێ چەندێ کری لێ ئەو ئێکەم کەس بوو ب تاقیکرن ڕاستیا ڤێ تیورێ سەلماندی و شیایی باوەریێ ژبۆ هەمی زانایێن ل سەردەمێ خۆ دروست بکەت.

ئەگەر میکرۆب ببنە ئەگەرێ پەیداکرنا نەخۆشیان، پا دڤێت کوشتن یان نەهێلانا ڤان میکرۆبان ببنە ئەگەرێ چارەسەرکرنا نەخۆشیان ژی. پاستەری هزرا هندێ کر کا چەوا دێ شێن خۆ ژ ڤان میکرۆبان پارێزین و کارتێکرنا وان نەهێلین، پشتی پاستەری زانایەکێ دی هات ب ناڤێ "جوزێف پاستەر" کو ل دویف ڕێبازا پاستەری چوو هەتا شیایی هندەك تەکنیکێن خۆپاراستنێ دژی میکرۆبان ل دەمێ ئەنجامدانا نشتەگەریان ب کاربینیت.

بەکتریا و میکرۆبێن دی یێن زیانبەخش دشێن ب ڕێکا خۆارن و ڤەخۆارنێ بچنە دناڤ لەشێ مرۆڤیدا و نەخۆشیان پەیدابکەن، ژبۆ نەهێلانا ڤێ چەندێ، پاستەری ڕێکەکا نوو یا خۆپاراستنێ داهێنا کو هەر ب ناڤێ وی دهێتە نیاسین ئەوژی "تەکنیکا پاستەرکرنی" یە ژبۆ کونترۆلکرنا گەشەکرنا میکرۆبان دناڤ شلەمەنیان دا ب تایبەت شیری دهێتە بکارئینان، ب ڤێ تەکنیکی پاستەر شیا ب تەمامی گەشەکرنا وان میکرۆبێن شیری پیس دکەن و دبنە ئەگەرێ ترشبوونا شیری بکوژیت.

دەمێ ژیێ وی چوویە د پێنجیان دا، پاستەری ڤەکۆلین ل سەر نەخۆشیەکا کوژەك و مەترسدار کرن کو تووشی گیانەوەران دبیت و ل دویڤدا ژبۆ مرۆڤی دهێتە ڤەگوهاستن ئەوژی نەخۆشیا "ئەنتراکسا پیس" بوو کو دبیتە ئەگەرێ کوشتنا مرۆڤ و گیانەوەران، پاستەر شیا هندەك ڤاکسینان ژ وی جورێ بەکتریایێ دروست بکەت یێن ڤێ نەخۆشیێ پەیدادکەن و ل دویڤدا هندەك گیانەوەرێن دی یێن ساخلەم ب ڤان ڤاکسینان دەرزیکدان، ئەڤ چەندە بوو ئەگەرێ پەیدابوونا حالەتەکێ نەخۆشیێ یێ سڤك ل دەڤ وان گیانەوەران، لێ هەر زوی لەشێ وان گیانەوەران بەرگریەکا بهێز دژی نەخۆشیێ پەیداکر و ژ نەخۆشیێ ساخبوونەڤە.

ئەڤ داهێنانا نوو یا پاستەری ناڤەندێن زانستی یێن وی سەردەمی هەژاندن ژبەرکو هەر زوی ژبۆ زانایان دیاربوو کو ئەڤ ڕێکا پاستەری دژی نەخۆشیان دشێت ژبۆ چارەسەرکرنا گەلەك نەخۆشیێن دی یێن کوژەك بهێتە بکارئینان. لەوڕا پشتی هینگێ زانا

شیان گەلەك جورێن ڤاكسینان دروست بكەن دژی نەخۆشی یێن تیفویێ و ئەنفلوەنزایێ و گەلەك دی كو تا سەردەمێ ئەڤروكەژی زانا ل دویف ڤێ ڕێبازێ دچن.

پاستەر ئێك ژ وان زانایان بوو یێن پتریا وەختێ خۆ ب ئەنجامدانا ڤەكۆلینانڤە بوراندی و گەلەك كار دكر لەوڕاژی شیا گەلەك تشتان د بوارێ پزیشكیێ دا ئاشكەرا بكەت، هەردیسان ئێك ژ كارێن دی وی ئەوبوو دەمێ دیاركری كو هندەك زیندەوەرێن هویر هەنە پێدڤێ ب هەوایی و ئوكسجینی نابن ژبۆ ژیانا خۆ، وی ناڤێ وان كرە "زیندەوەرێن نەهەوایی".

هەردیسان ڤەكۆلینێن وی ل سەر كرمێ حەریری Silk worm كو داڤێن قوماشێ حەریری ب شێوەیەكێ سرۆشتی دروست دكەت بۆ ئەگەرێ ب دەستڤەئینانا ئەنجامێن ئابوری یێن هەرە مەزن. زێدەباری داهێنانا وی یا مەزن دەربارەی ڤاكسیدانا مریشكان دژی نەخۆشیا كولێرایێ.

لویس پاستەر ل سالا 1895 ل دەڤەرەكا نێزیكی پاریسێ وەغەركر.

پشتی داهێنانێن پاستەری و كارێن وی یێن هەرە گرنگ، ڕێژەیا نەخۆشیان و ئەو كەسێن ژبەر نەخۆشیان گیانێ خۆ ژ دەستداین ل جیهانێ گەلەك كێمبوو، ئەڤ چەندەژی بوو ئەگەر كو هێدی هێدی هژمارا ئاكنجیێن سەر ڕویێ ئەردی زێدە بیت و خەلك ئێدی پتر خۆشیێ ب ساخلەمیا خۆ ببەن چونكی بەری هینگێ هژمارەكا مەزن یا خەلكی ژبەر نەخۆشیان گیانێ خۆ ژ دەستددا، ئەگەرێ ڤێ زێدەبوونێ ژبۆ كارێن پاستەری دزڤریت یێ شیایی میكرۆبان ئاشكەرا بكەت و شەڕێ وان بكەت و مرۆڤی ژ نەساخیان ڤۆرتال بكەت.

هەكە بابەتێ ڤێ پەرتووكێ ل سەر كاریگەریا وان مرۆڤان بایە یێن كارتێكرن ل سەر ساخلەمی و ژیانا خەلكی كربایە، بێگومان دا ناڤێ لویس پاستەری ل ڕێزا ئێكێ هێت، لێ ڤاڤارتنا ڤان كەسان ل سەر بنەمایێ كاریگەریا وان ب شێوەیەكێ گشتی بوویە نەك لایەنێ ساخلەمیێ ب تنێ لەوڕا ناڤێ پاستەری ل ڤێ ڕێزێ هات.

## 12. گاليليو گاليلى Galileo Galilei

## (1564ز. – 1642ز.)

### گاليليو گاليلى

### ئەو زانايێ دياركرى ئەرد نەيێ پەحنە و ل دور ڕۆژێ دزڤڕيت

زانايێ ئيتالى گاليليو گاليلى دهێتە هەژمارتن ئێك ژهەرە مەزنترين زانايێن كو د ديروكێ دا كەسێن وەكى دووبارە نەبوويە چونكى بەرپرسيارێ ئێكێ بوويە ژ پێشئێخستنا سيستەمێن زانستى پتر ژ هەر كەسەكێ دى.

گاليلى ل سالا 1564 ل باژێرێ "بيزا" يێ ئيتالى ژدايكبوويە و هەر ل زانكۆيەكا وى باژێرى خۆانديە، لێ ژبەر هەژارى و ئەگەرێن دارايى نەشيايە خۆاندنا خۆ تەمام بكەت، سەرەڕاى ڤێ چەندێ ژى لێ ل سالا 1589 شيا وەك مامۆستا ل زانكۆيێ كاربكەت. پشتى چەند سالەكێن دى چوو زانكۆيا "بادوا" و هەتا سالا 1610 ما ل وێرێ، دناڤبەرا وى ماوەيى دا گاليلى مەزنترين كارێن خۆ يێن زانستى بەرهەم ئينان و مەزنترين دەستكەفتنا وى ژى دەربارەى زانستێ ميكانيكيێ بوو.

فەيلەسوفێ گريگى ئەڕستۆ دبێژت: تشتێن گران دەمێ دكەڤنە سەر ئەردى زويتر دگەهن ژ تشتێن سڤك، پشتى وى ب سەدەها زانا هاتن و هەمى ل دويف ڕێبازا وى دچوون، لێ گاليلى باوەرى ب ڤێ چەندێ نەبوو لەوا گەلەك ڤەكۆلين ئەنجامدان ژ پيخەمەت ڕاستيا ڤێ چەندێ دياربكەت، ل دوماهيێ گەهشتە وى ئەنجامى كو بوچوونا ئەڕستۆى نەيا دروستە و وى دياركر لەزاتيا كەفتنا تشتێن سڤك و گران هندى ئێكە ئەوژى هەكە تووشى هێزا لێكخشاندنێ دگەل هەوايى نەبيت ئانكو ئەگەرێ گيروبوونا كەفتنا تشتێن سڤك ژبۆ لێكخشاندنا وان دگەل هەوايى دزڤڕيت.

تشتێ نوو د ڤەكۆلينێن گاليلى دا ئەوبوو كو وى هندەك ياسايێن بيركاريێ ب كاردئينان و ڤان ياسايان لڤين و لەزاتيا كەفتنا تشتان شرۆڤەدكر، ل دويڤدا وى ياسايا سستبوون يان خاڤبوونا خۆيى Inertia دانا.

بەری هینگێ خەلکی هوسا هزردکر کو هەر تشتەك دەمێ د لڤلڤیت هێدی هێدی لەزاتیا وێ کێم دبیت ب تنێ ئەگەر هێزەکا دی ڤێنەکەڤیت و جارەکا ب لڤینیتەڤە. لێ گالیلی بەروڤاژی ڤێ چەندێ دووپاتکر کو هەر تشتەك د گەردونی دا بەردەوام یێ د حالەتێ لڤینێ دا ب تنێ ئەگەر هێزەکا دی نەهێت و لڤینا وێ ب ڕاوەستیت وەك هێزا لێکشخاندنێ دگەل هەوای یان دگەل ئەردی. ئەڤ داهێنانا گالیلی بوو ئەگەر پشتی هینگێ زانا نیوتن بهێت و بکەتە "یاسایا ئێکێ یا لڤینی". هەرچەندە ئەڤ داهێنانە گەلەك یا مەزن و گرنگ بوو لێ داهێنانێن گالیلی یێن مەزنتر ئەوبوون یێن د بوارێ فەلەکی دا بەلاڤکرین.

بەری گالیلی، دوو تیورێن فەلەکی هەبوون: تیورا ئێکێ دگوت کو ڕۆژ سەنتەرێ گەردونی یە، ئەڤ تیورە ژلایێ زانا "کوبرنیکوس"ی ڤە هاتبوو دانان، تیورا دوێ دگوت ئەرد سەنتەرێ گەردونی یە. ل سالا 1659 گالیلیوی ب بەلگەڤە دیارکر کو تیورا زانا کوبرنیکوسی یا دروستە و ڕۆژ سەنتەرێ گەردونا مەیە و هەر تشتتەکێ دڤی گەردونی دا هەی ل دور ڕۆژێ دزڤڕیت نەك ل دور ئەردی.

پشتی گالیلی زانی کو ل هولەندا تێلسکوپەك یا هاتیە دروستکرن، وی شیا تێلسکوپەکێ ب دەستخوڤە بێخیت و چەندین گوهۆڕینان تێدا بکەت و پێش بێخیت، ل دویڤدا ب ڤێ تێلسکوپا نوو وی تەماشەی ئەسمانی کر و گەلەك تشتێن نوو ئاشکەرا کرن، ل دویڤدا وی تەماشەی هەیڤێ کر و دیارکر کو هەیف نە تەنەکێ ڕاست و پەحنە، نەك هەیف ب تنێ بەلکو هەمی تەنێن ئەسمانی د ڕاست و پەحن نینن.

هەردیسان وی دیارکر کو هەیف ژی وەکی ئەردی یا گرۆڤرە و گەلەك دولێ و نەهالێ و چیا یێ ل سەر هەین، ل دویڤدا وی تەماشەی گالاکسیا "ڕێکا شیری" Milky Way ل ئەسمانی کر و دیارکر چ ڕاستی بۆ ڤێ ڕێکێ نینن و چ ڕەنگێ شیری ژی لێ نینە بەلکو کومەکا ستێرانە کو هژمارا وان گەلەك یا مەزنە و گەلەك د دوورن کو مرۆڤ نەشێت ب چاڤێن خۆ یێن ئاسایی بینیت.

ل دویڤدا وی ب تێلسکوپا خۆ تەماشەی ئەختەرا ئوڕانوسێ کر و دیارکر کو هژمارەکا خۆلگەیان ل دور ڤێ ئەختەرێ دزڤڕن، هەردیسان وی دیارکر چوار هەیف ل دور ئەختەرا موشتەریێ دزڤڕن، ڤێ چەندێ باوەری بۆ وی چێکر کو ڕەنگە هندەك هەیڤێن

دیژی هەبن ل دور ئەختەرێن دی دزڤڕن، ئانکو نەك ب تنێ ئەختەرا ئەردی هەیڤەك ل دور دزڤڕیت بەلکو ئەختەرێن دیژی هەیڤ یێن هەین ل دور دزڤڕن.

گالیلی تەماشەی ڕۆژێ کر و دیت کو پنیەکا ڕەش یا ل سەر ڕۆژێ هەی، هەرچەندە گەلەك زانایێن دی بەری هینگێ تیبینیا ڤێ پنیا ڕەش ل سەر ڕۆژێ کربوو لێ گالیلی ب شێوەیەکێ بەرفرەهتر و پتر پێزانین بەحسێ ڤێ پنیێ کر. هەردیسان وی دیارکر کو ئەختەرا ڤینوسێ د هندەك قۆناغێن جودا ژ ئەختەرێن دی دبوریت هەر وەکی وان قۆناغێن هەیڤ تێرا دبوریت. ئەڤ چەندە هەمی بەلگەبوون ل سەر ڕاستیا تیورا کوبرنیکوسی کو دیارکر بوو ڕۆژ سەنتەرێ گەردونی یە و ئەختەرێن دی ل دور ڕۆژێ دزڤڕن.

پشتی گالیلی ئەنجامێن ڤەکۆلینێن خۆ بەلاڤکرن، زانایێن ئولی یێن دێری ل وی سەردەمی دژی وی ڕاوەستیان و ئەنجامێن وی ب درەو دانە زانین ژبەرکو ل وی سەردەمی دێرێ دەستهەلاتداری ل ئەوروپا دکر، پشتی فەرمانڕەوایێ وی سەردەمی یێ دێرێ مری، کەسەکێ نوو ل جهێ وی هاتە دانان کو ئێك بوو ژ داخبارێن کارێن گالیلی لەوڕا دەرفەت دایێ ب ئازادی ڤەکۆلینێن خو یێن زانستی ئەنجام بدەت.

گالیلی ژبۆ ماوێ پتر شەش سالاَن مژیلی دانانا پەرتووکا خو یا بناڤودەنگ "هەڤپەیڤین دەبارەی دوو سیستەمێن فەلەکی یێن بناڤودەنگ"بوو. لێ هەر زوی ئەڤ پەرتووکە بوو جهێ ڕەخنەیێ و ژلایێ دێرێ ڤە هاتە قەدەغەکرن و نەهێلا بهێتە بەلاڤکرن.

لێ دێرێ گالیلی ژبەر ڤان ڤەکۆلینێن وی زیندان نەکر، بەلکو ئەو نەچار کر بمینتە د مالڤە و نەهێلا کەس ژی سەرەدانا وی بکەت، لێ د هەما دەمدا سزایەکێ دژی ل سەر سەپاند ئەوژی گوتێ دڤێت تو خەلکی هەمیێ کومبکەیی و بێژیێ کو چ ڕاستی ژبۆ ئەنجامێن ڤەکۆلینێن تە نینە و ڕۆژ سەنتەرێ گەردونی نینە بەلکو ئەرد سەنتەرێ گەردونی یە و هندی تشتەکی د ڤی گەردونی دا هەی ل دور ئەردی دزڤڕن، ل وی دەمی ژیێ وی 62 سالێ بوون دەمێ ئەڤ کارە ژ نەچاری کری، لێ وی تەماشەی ئەردی دکر و هیدی دگوت ئەرد ل دور ڕۆژێ دزڤڕیت.

تشتێ سەرنجڕاكێش ئەوە كو ل ڤان سالێن دوماهیێ ب تایبەت پشتی تەكنولوژیا پێشكەفتی و گەمی هاتینە فڕێكرن ژبۆ ئەسمانی و زانایان دیاركری كو ڕاستە ئەرد یێ گرۆڤرە و ڕۆژ سەنتەرێ گەردونی یە، ژ نوو ل وەلاتێ ڤاتیكانێ دادگەهەكا تایبەت ل دور گالیلی هاتە ئەنجامدان و بێ گونەهیا وی دیاركر و دێرێ پشتی چەندین سالان ژ مرنا وی بێگونەهیا وی دیاركر و ژ نوو داخازا لێبورینێ ژ گالیلی كر.

## 13. ئەرِیستۆ Aristotle

## (384ب.ز – 322ب.ز)

### ئەرِیستۆ

### ئەو فەیلەسۆفێ بەرێ بنیاتێ شارستانیا ڕۆژئاڤایی دانایی

ئەرِیستۆ دهێتە هەژمارتن مەزنترین زانا و فەیلەسۆفێ چەرخێن دێرین ژبەرکو شیایە بەرێ بنیاتێ زانستێ لوژیکی بدانیت کو کاریگەریەکا ڕاستەخۆ ل سەر فەلسەفێ هەیە، هەردیسان شیایە گەلەك ڕێنما و بنەماییێن هەمی زانستێن مرۆڤایەتی پێش بێخیت.

هەرچەندە پتریا وان تیورێن ژلایێ ئەرِیستۆی ڤە هاتینەدانان ل سەردەمێ ئەڤروکە کار پێ ناهێتە کرن و یێن هاتینە لادان، لێ ئەو تشتێ ئەرِیستۆی ل دویف خۆ هێلای ئەوە کو بەردەوام مێشکێ مرۆڤی ل هەمی ڕاستیان بگەڕییێت دوور ژ کارتێکرنێن ئایدولوژی و فانتازی ڕەفتارێ بکەت.

ئەرِیستۆ ئەو کەس بوو یێ شیایی هەمی کار وهزر و بیروباوەرێن مرۆڤی ب دانیتە ژێر مێشکێ مرۆڤی، هەردیسان وی بزاڤ ژبۆ هندێ دکرن باوەرییێ بۆ خەلکی چێکەت کو ئەڤ گەردونە ژنیشکەکێڤە یان ژلایێ خودێ ڤە یان سێربەندییێ ڤە نەهاتیە ئافراندن، بەلکو ل دویف هندەك یاساییێن لوژیکی یێن جێگیر هاتیەدانان کو ل دویف حەزێن مرۆڤان ناهێتە گوهۆرین، ئەڤ شێوازێ هزرکرنێ بوویە بەرێ بنیاتێ ئاڤاکرنا شارستانیا ڕۆژئاڤایی دژی شێوازێن کلاسیکی یێن سوفیگەری و سێرەندی و ئەفسانەیی یێن کو هەمی چەرخاندا هەین.

ئەرِیستۆ ل سالا 384 بەری زاینی ل باژێرێ "ستاگیرا" ل ویلایەتا مەقدونیا ژدایکبوویە، بابێ وی نوژدارەکێ بناڤودەنگ بوو ل وی سەردەمی، دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 17 سالیێ چوو باژێرێ ئەسینا داکو ل سەر دەستێ فەیلەسوفێ مەزن ئەفلاتۆنی بخوینیت. هەرچەندە ئەرِیستۆی گەلەك تیبینی و پێزانین ژ بابێ خۆ وەرگرتن، لێ ژ ماموستاییێ خۆ ئەفلاتۆنی فێری هزرکرنا فەلسەفی ببوو.

ل سالا 432 بەری زاینی، ئەڕیستۆ ڤەگەریا ویلایەتا مەقدونیا و بوو ماموستایێ سەرکردێ ب ناڤودەنگ ئەسکەندەرێ مەقدونی یێ کو پشتی هینگێ ب ناسناڤێ "ئەسکەندەرێ مەزن" د هاتیە نیاسین و ل وی دەمی تنێ ژیێ وی 13 سالێ بوون. ل سالا 335 بەری زاینی ئەسکەندەرێ مەقدونی هاتە سەر تەختێ حوکمڕانیێ، ل وی دەمی ئەڕیستۆ ژی ڤەگەریا باژێرێ ئەسینا و قوتابخانەك ب ناڤێ لیسیوم Lyceum ڤەکر و بۆ ماوێ پتر ژ 12 سالاَن ما ل ئەسینا.

هەرچەندە پشتی ئەسکەندەر بوویە فەرمانڕەوا ئێدی داخازا چ شیرەتان ژ ئەڕیستۆی نەکر لێ پارەیەکی ٛمەزن کرە دیاری ژبۆ وی داکو بەردەوامیێ بدەتە ڤەکۆلین و پێشئێخستنا ڕێبازا خۆ یا فەلسەفی و ئەم دشێن بێژین ئەڤ چەندە ئێکەم جاربوو د دیروکێ دا کو زانایەك پشتەڤانیا کەرەستی و دارایی ژ حکومەتێ وەربگریت.

ئەڕیستۆ کەسەکێ زێدە دیموکراتی بوو دگەل ئەلکساندەری و ئەڤ چەندەژی بوو جهێ باوەریا خەلکێ ئەسینا، ئەڤ پەیوەندیا ب هێزا ئەڕیستۆی دگەل ڤی سەرکردەی ببوو ئەگەر شاهێ وی سەردەمی گەلەك کەرب ژ ئەڕیستۆی ڤەبن و پشتی مرنا ئەلکساندەری ل سالا 323 بەری زاینی گەلەك زیان گەهاندە ئەڕیستۆی و ب کەسەکێ خودێ نەناس و بێباوەر گونەهبار کر.

مرنا ئەلکساندەرێ مەزن ئەو چەندە ئینا بیرا ئەڕیستۆی دەمێ یا بەری 26 سالاَن ب سەرێ فەیلەسوفێ مەزن سوکراتی هاتی دەمێ ژلایێ دەستهەلاَتدارێن وی سەردەمیڤیە هاتیە گونەهبارکرن و سزادان و نەچارکری خۆ ب ژەهری بکوژیت، لەورا ئەڕیستۆی بریار دا ژ باژێرێ ئەسینا ب ڕەڤیت و گوت ئەز ناهێلم جارەکا دی خەلکێ ئەسینا گونەهەکا د دەرحەقێ ڕێبازا فەلسەفێ دا بکەن ژبەرکو وی د زانی مانا وی ل وێرێ دێ بیتە ئەگەرێ مرنا وی.

لێ پشتی ئەڕیستۆی باژێرێ ئەسینا ب جه هێلای، پشتی چەند هەیڤەکان د ژیێ 62 سالیێ گیانێ خۆ ژدەستدا، ئەڕیستۆی د ژیانا خۆ دا 170 پەرتووك دانابوون لێ ب تنێ دیروك شیایە 47 پەرتووکێن وی ژبۆ مە ب پارێزیت. هەلبەت ڤێ هژمارا مەزن یا پەرتووکان چ گرنگیا خۆ د مەزنیا وی دا نەبوو بەلکو ئەو کاریگەریا ئەڕیستۆی ل دویف

خۆ هێلای بها و گرنگیا وی دیار دکەت کو وەکی وێ کاریگەریێ د دیروکا شارستانیا مرۆڤاندا نەبوویە.

ئەرِیستۆی پەرتووك بابەتێن جوداجودا نڤێساینە و ڤەکۆلین دچەندین بواراندا ئەنجامداینە، پەرتووکێن وی دەربارەی زانستێن فەلەکی و زیندەوەرزانی و جوگرافیا و فیزیا و زانستێ سوریکلانزانی و فرمانێن ئەندامێن لەشی مرۆڤی بووینە، زێدەباری هەمی بوارێن دی یێن زانستی یێن وی سەردەمی، هەرچەندە ئەڤ ڤەکۆلینێن وی ئەنجام ددایین هندەك هەڤالێن وی هاریکاریا وی دکر لێ وی ب تنێ ئەنجامێن ڤان ڤەکۆلینان لێکددان و کورت دکرن.

د زانستێ فەلسەفێ ژی دا، ئەرِیستۆ ماموستا و هزرمەندەکێ مەزن بوو، د ڤی بواری دا وی چەندین پەرتووك دەربارەی زانستێن سروشتی و دەروننناسی و رەوشت و ئابوری و سیاسی و ئاینزانیێ بوون. هەردیسان ئەرِیستۆ ئێکەم کەس بوو بەرێ بنیاتێ زانستێ لوژیکی دانایی، هەردیسان وی چەندین بابەت دەربارەی هونەرێ گوتاربێژیێ و دەستوران نڤێساینە لێ تووشی گەلەك شاشیان بوویە، لێ ئەم دشێن بێژین ڤان شاشیێن وی کرین چ کارتێکرنەکا نێگەتیڤ نابیت ئەگەر ئەم هەڤبەربکەین دگەل کارێن وی یێن دی و ئەو راستییێن وی د هەمی بواران دا دیارکرین.

یا ژ هەمیێ مەترسیدارتر ئەو کاریگەری بوو یا ئەرِیستۆی ل سەر شارستانیا رۆژئاڤا و رۆژهەلاتی کری تا وی رادەی کەس نەشیایە ب سانەهی خۆ ژبن کونترۆلا فەلسەفا وی ل سەر مێشکی دوور بکەت.

فەیلەسۆفێ ئیسلامی "ئیبن رۆشدی" بزاڤکر فەلسەفا وی کوپی بکەت و هندەك تشتان ل سەر زێدەکەت هەروەکی کا چەوا فەیلەسۆفێ جوهی "موسایێ کورێ مەیمونی" بزاڤکری فەلسەفا وی کوپی بکەت و ب ڤەگۆهێزیت ب تایبەت دەمێ بزاڤکری ل دویڤ رۆناهیا فەلسەفا وی بچیت ژبۆ شرۆڤەکرنا ئاینێ جوهیان و کارتێکرنا وێ.

پەرتووك و بەرهەمێن ئەرِیستۆی ژبۆ چەندین زمانێن جیهانی هاتینە وەرگێران، هەرچەندە ڤان پەرتووکان کارتێکرنەکا مەزن هەبوو لێ د هەمان دەمدا ژی گرێیەك بوون د رێکا هزرکرنا فەلسەفی دا ژبەرکو ئەرِیستۆی بزاڤا و ئازادکرنا هزرا مرۆڤی دکر ژ هندەك بنەما و بیروباوەرێن کلاسیکی یێن هزرکرنێ.

هەردیسان ناهێتە ڤەشارتن کو ئەڕیستۆی گەلەك بیرباوەرێن شاش ژی هەبوون، بۆ نموونە وی هزر دکر کویلایەتی و بەندەیی و دوورئێخستن تشتەکێ نۆرمال و پێدڤیە، هەردیسان وی هزردکر ئافرەت ژلایێ پێکهاتنا لەشی هزرکرنێ ڤە گەلەك یا جودایە ژ زەلامی و یا پاشڤەمایە، لێ ئەڕیستۆ گەلەك یێ ڕاست بوو دەمێ گووتی "ڕەخنەگرتن کلیلا سەرەکی یا هەمی شۆڕەشانە" و "شارستانی ژ فێرکرن و پشتەڤانیا گەنجان" دەست پێ دکەت.

## 14. ئیقلیدیس Euclid

## (بوون و مرن: 300 بەری زاینی)

### ئیقلیدیس

### ئەو زانایێ بەریێ بنیاتێ زانستێ ئەندازیاریێ دانای

کێم کەس ژ مرۆڤێن بناڤودەنگ شیاینە ژبۆ ماوەیەکێ درێژ بژین هەروەکی کا چەوا زانایێ ئەندازیاری یێ گریکی ئەقلیدیس ژیای، گەلەك کەسێن مە ناڤێ وان د پەرتووکێ دا داناین هێشتا دزیندی بوون دەمێ بناڤودەنگ بووین، لێ ژیانا ئەقلیدیسی یا ڤەشارتی بوو و کەسێ نەدنیاسی لێ پشتی مرنا وی ب چەندین سالاَن ژ نوو خەلکی نیاسی وبناڤودەنك کەفت.

سەرەڕای ڤێ ناڤودەنگیا ئەقلیدیسی، لێ دیروکێ کێمەك ژ ژیانا وی بۆمە هەلگریتە و پێزانینێن مە ل دور وی دسنوردارن، تشتێ زانا ئەوە کو وی وەك ماموستا ل ئەسکەندەریە نێزیکی سالاَ 300 بەری زاینی کارکریە، لێ دیروکا بوون و مرنا وی نەیا دیارە. هەردیسان جهێ ژداکیبوونا ویژی کا ئەورۆپا یان ئەفریقیا بوو نەهاتیە پشتڕاست کرن.

ڤی زانای د ژیانا خودا گەلەك پەرتووك نڤێسایننە، لێ ب تنێ پەرتووکەکا وی بوو ئەگەر ئەم ڤی جهێ بلند دناڤ کەسێن کاریگەر دا ب دەینێ ئەوژی پەرتووکا وی یا ب ناڤێ (بنەمایێن ئەندازیارێ)بوو.

گرنگیا ڤێ پەرتووکا بۆ وان تیور و شرۆڤەکرنان ناڤەگەریت یێن تێدا بەحس لێ هاتینە کرن، چونکی پتریا وان تیوران بەری هینگێ هاتبوونە زانین و گەلەك بەلگە و سەلماندن ژی ل سەر ڕاستیا پێزانینێن وان هاتبوونە دیارکرن، لێ سەرکەفتنا ئەقلیدیسی ئەوبوو کو شیای ڤان تیوران هەمیان د پەرتووکەکێ دا کوم بکەت و پێکڤە گرێبدەت و هندەك بەلگەیێن باوەرپێکری ل سەر ڕاستیا وان دیاربکەت، ئەڤ سەرکەفتنە بۆ هندێ

دزڤڕن کو ئەو شیا گەلەك ژ بنەمایێن زانستێ ئەندازیاریێ بدانیت و پاشی ئەڤ تیورە ئێك ل دویڤ ئێك د ڕێکخستن هەتا کو شیای هەمیان ب شێوەیەکێ لوژیکی پێکڤە گرێبدەت. هەردیسان وی گەلەك بەلگەیێن نوو کو بەری هینگێ کەسێ هزرتێدانەکربوو یارکرن.

هەرچەندێ ڤێ پەرتووکا وی بەحسێ بنەمایێن ئەندازیاییێ دکر، لێ وی هندەك هاوکێشەیێن بیرکاری و زانستێ جەبری کرنە تێدا. ئەڤ بنەمایێن ئەندازیێ یێن وی داناین بوونە بنیاتێ خواندنێن ئەندازەیی بۆ ماوێ پتر ژ هزار سالآن و ڕەنگە چ پەرتووکێن دی هوسا نەبن کو مرۆڤەکی دانابیت و بۆ ماوەیەکێ هندە یێ درێژ بهێتە خواندن و کار پێ بهێتەکرن. هەرچەندە چاپا سەرەکی یا ڤێ پەرتووکا ئەقلیدسی ب زمانێ گریکی یێ کەڤن بوو لێ هەر زوی هاتە وەرگێران بۆ سەر گەلەك زمانێن دی یێن جیهانی، ئێکەم چاپا ڤێ پەرتووکێ ل سالآ 1482 زاینی دەرکەفت ئەوژی پشتی 30 سالآن ژ دەمێ گوتەنبەرگی ئامیری چاپێ داهێنای، پشتی وی دەمی ب هزارەها چاپێن وێ ب سەدەها زمانان دەرکەفتن.

ژبەرکو ئەڤ پەرتووکە ڕاهێنانەکا پڕاکتیکی ل سەر هزرکرنەکا لوژیکی بوو، لەوڕا کاریگەریەکا مەزنتر ژ پەرتووکا ئەریستۆی یا بناڤێ "لوژیك" هەبوو ژبەرکو دهێتە هەژمارتن باشترین نموونە ژبۆ ڕێکخستنا لوژیکی یا هزرا مرۆڤی، ژبەر ڤێ چەندێ هەمی هزرمەندێن وی سەردەمی پشت بەستن کرە سەر.

نابیت ئەم وێ چەندێ ژبیربکەین کو ئەڤ پەرتووکا ئەقلیدیسی فاکتەرەکێ بهێزبوو ژبۆ زیندیکرنا زانستێن سەردەم، ژبەرکو زانست نە ب تنێ خڕڤەکرنا پێزانینانە بەلکو بەلکو پشت بەستنێ دکەتە سەر پێزانینێن گەلەك هویر و ئەنجامێن مەزن و گشتی ژێ دەردئێخیت.

مەزنترین سەرکەفتنێن زانستێ سەردەم ژ ئەنجامێ پێکڤەگرێدانا تاقیکرنێن مرۆڤایەتی دهێت پشتی کو ئەنجامێن وان دهێنە شرۆڤەکرن و دبنە ئەگەرێ دانانا گریمان و تیوران.

دبیت تا نوکە ئەگەرێن وێ چەندێ بۆمە دیارنەبن کا بوچی شۆڕەشا زانستی ل ئەورۆپا دەستپێکر نەك ل چینێ، هەلبەت ئەڤ چەندەژی ژ نیشکەکێڤە نەهاتیە، چ پێنەڤێت دڤێت هندەك ئەگەرێن بهێز و باوەرپێکری و ڕۆهن و ئاشکەرا هەبن ژبۆ

پێشڤەچوونا زانستی ل ئەوروپا نەك ل چ جهێن دی، هەلبەت ئەڤ چەندەژی بوو ئەگەرێ دەرکەفتنا هندەك زانایێن مەزن وەك زانایێ ئیتالی گالیلی و یێ پولەندی کوبرنیکوسی.

گومان تێدا نینە کو هندەك ئەگەرێن بهیز یێن هەین هەتا ئەڤ کەسە دیاربووین. ئێك ژ ئەگەرێن هەرە سەرەکی ئەبوو کو ئەوروپا ب هزرا گریکی داخبار و کاریگەربوو ب تایبەت ب وان تیورێن د زانستێ ماتماتیکێ دا دانایێن.

ناهێتە ڤەشارتن کو چین ژ سەر ئاستێ دروستکرنا دەرمان و ئامیرەیان ژ ئەوروپا پێشکەفتیترە، لێ نەشیایە بگەهیتە وێ پێشکەفتنا ئەوروپا دەربارەی ئاشکەراکرنا تیورێن ماتماتیك و زانستی، د دیروکا چینێ دا چ زانایێن ئەندازیاری یێن وەکی ئەقلیدیسی پەیدانەبووینە. هەرچەندە چینێ گەلەك بزاڤێن ئەندازیاری هەبوون لێ نەشیایە خۆ تیورەکا ب تنێ ژی ب دانیت، ئانکو وێ ب تنێ تاقیکرنێن پراکتیکی هەبوون نەك فەلسەفا تیورێن زانستی.

کارتێکرنا ئەقلیدسی ل سەر نیوتنی ژی گەلەك یا بهێز بوو و ئەڤ کاریگەرە د پەرتووکا نیوتنێ یا ب ناڤێ "بنەما"دا کو ب زمانێ لاتینی هاتیە نڤێسین گەلەك یا ئاشکەرایە ژبەرکو پەرتووکا وی ب شێوەیەکێ ئەندازەیی یێ تەمام وەکی یا ئەقلیدسی هاتیە نڤێسین.

هەردیسان پشتی هینگێ گەلەك زانایێن دێ یێن ماتماتیکی مفا ژ پەرتووکا ئەقلیدسی وەرگرتیە و ل دویڤ رێبازا وی چوونە وەك فەیلەسوفێن ئینگلیزی "رۆسل" و "هوایتد" و فەیلەسوفێ هۆلەندی "ئەسبینوزا"

د ماوێ هەردوو چەرخێن بوریدا زانایێن ماتماتیکی گەهشتنە وێ راستیێ کو ئەندازا ئەقلیدسی نموونەکا لوژیکی یا ب تنێ نینە، یانژی وێنەیەکێ دروست ژبۆ هەمی هزرێن مرۆڤی یانژی پەیوەندیا دناڤبەرا تشتان یان دناڤبەرا مرۆڤی یان دناڤبەرا گەردونی دا بیت، بەلکو گەلەك پەیوەنییێن دی و وینەییێن دی یێن هەین کو گەلەك دجودانە ژ وان وێنەیان یێن هەر ژ سەردەمێ ئەقلیدسی کونترۆل ل سەر مێشکێ مرۆڤی کری، بو نموونە تیورا رێژەی یا زانایێ ماتماتیکی ئەلبرت ئەنیشتاینی وێنێ کلاسیکی یێ ئەندازا ئەقلیدسی ژناڤبر.

د بوارێن مەگناتیسی یێن ستێرێن دوور و ئەختەر و لڤینێن واندا، ئەم نەشێن ئەندازا ئەقلیسیی ل سەر بسەپینین ژبەرکو ئەندازا وی ب تنێ دگەل هندەك بوارێن سنوردار ب کاردهێت.

سەرەای هەبوونا تیورێن زانستی یێن سەردەم دەربارەی ئەندازیاری و ماتماتیك و فیزیایێ، لێ ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت ئەم گرنگی و ڕولێ زانا ئەقلیدسی ژبیربکەین یێ کو کاریگەریا زانستێ وی هەتا 22 چەرخان ژی شیای بژیت.

## 15. مووسا Mosses

**(بوون و مرن: بەری زاینی)**

### مووسا

### ئەو پێغەمبەرێ دناڤ هەمی ئایناندا خۆدان جهەکێ بلند

ب درێژاهیا دیروکێ مرۆڤان رێز ل چ مرۆڤان نەگریتە هندی رێز ل پێغەمبەرێ خودێ مووسای (سلاڤ ل سەر بن) گرتی، هەرچەندە تانوکە ب دروستاهی سالا ژدایکبوونا وی نەهاتیە زانین لێ پتریا دیروکنڤیسان دوێ باوەرێ دانە کو ل چەرخێ سیێ بەری زاینی ژیابیت چونکی ئەو فیرعەونێ مووسا ژبۆ هاتە فرێکرن ل سالا 1237 بەری زاینی وەغەرکربوو. پشتی شەش چەرخێن ل دویڤدا مووسای ببوو کەسەکێ گەلەك خوشتڤی و خۆدان رێز ل دەڤ جوهیان.

ل سالا 500 بەری زاینی ئەڤ حەژێکرنە پتر لێ هات ب تایبەت پشتی بەلاڤبوونا ئاینێ مەسیحیان ل وەلاتێن ئەوروپی و پشتی هینگێ ب چەرخەکی ئاینێ ئیسلامێ ژی دەرکەفت و ب شێوەیەکێ راستەخۆ دانپێدان ب پێغەمبەرینیا مووسای کر.

پشتی بەلاڤبوونا ئاینێ ئیسلامێ، مووسا پتر هاتە نیاسین و رێز لێ هاتە گرتن ب تایبەت دناڤ جیهانا ئیسلامێ دا و پشتی بورینا نێزیکی 32 چاخان ژ بوونا مووسای یان وەغەکرنا وی، لێ هێشتا جهێ وی دناڤ جوهی و مەسیحی و موسلمانان دا گەلەك یێ بلندە و ب چاڤەکێ مەزن تەماشەی وی دکەن، لێ هندەك کەسان ئەڤ حەژێکرنە ژ رادێ پێدڤی بریە دەرێ و ب چاڤەکێ گەلەك مەزنتر بەرێ خۆ ددەنێ ئەوژی ژبەرکو پێغەمبەرەك بوو ژبۆ جوهیان هاتبوو هنارتن.

سەرەرای وێ ناڤودەنگیا مووسای ل سەرانسەری جیهانێ و دناڤ هەمی ئاینادا هەی، لێ ئەو پێزانینێن دەربارەی وی گەهشتینە مە گەلەك دکێمن یانژی پتریا وان پێزانینان نەهاتینە پشتراست کرن و مرۆڤ نەشێت ب تەمامی پشت بەستنێ بکەتە سەر.

هندەك دیروكنڤێس هزردكەن مووسا كەسەكێ فیرعەونی بوو چونكی ب دیتنا وان ناڤێ "مووسا" یانژی ب ئینگلیزی "موزس" یان "موزیس" هەمی ناڤێن فیرعەونی نە و ڕامانا وان ژی ئانكو "كور" دهێت.

د پەرتووكا پیرۆز دا گەلەك بەحسێ ئایەت و سەرهاتی و موعیجیزەیێن مووسای هاتیە كرن، لێ موعیجزەیا هەرە مەزن ئەوبوو دەمێ د هەڤڕكیەكێ دا دگەل سێرەبەندێن فیرعەونی دارێ خۆ هاڤێتیە سەر عەردی و بوویە ئەژدەهایەكێ مەزن و مارێن هەمی سێرەبەندان داعیراین. هەردیسان موعیجیزەیا فورتالكرنا مللەتێ جوهی ژبن زۆلم و زۆرداریا فیرعەونی ئەوژی دەمێ دارێ خۆ ل دەریایا "سۆر" دای و كریە دوو نیڤ و خەلك تێرا دەربازبووینە لایێ دی یێ ئاڤێ.

ئەڤ موعجیزەیە هەمی ل وی دەمی ڕویدابوون دەمێ ژیێ مووسای نێزیكی 80 سالان، دەمێ عومرانی ژ مسرێ دەركەفتین و فۆرتال بووین، بەرەڤ دەڤەرا "سینا"یێ چوون، ب حەزا خودێ ئەو چل سالان ل وێ دەڤەرێ مان و تەڕا و بەرا بوون!

هندەك دیروكنڤێس دبێژن پتریا ئەو موعیجزەیێن مووسای یێن د تەوراتێ دا هاتینە بەحسكرن وەك 12 جورێن تاعونێ یێن تووشی خەلكێ مسرێ یێ وی سەردەمی بووین، شەقبوونا ئاڤا دەریایی و دەربازبوونا مللەتێ مووسای و ئەو دارێ بوویە ئەژدەها، ئەڤ موعجیزەیە هەمی د سەرهاتی و ئەفسانەیێن كەڤن یێن بابلیاندا هەنە. لێ تشتێ پشتڕاست و گومان تێدا نەی ئەوبوو كو مووسا شیابوو سێ سەركەفتنێن هەرە مەزن ب دەستڤە بینیت لەوڕا مەژی ناڤێ دناڤ ڤێ پەرتووكێ دا دانایە، ئەو سەركەفتن ژی ب ڤی ڕەنگی بوون:

ئێك: مووسا سەركردەیەكێ سیاسی یێ بهێز و خودان شیان بوو كو شیا مللەتێ جوهیان ژ بن زۆلم و زۆرداریا فیرعەونی فورتال بكەت.

دوو: مووسا خودانێ پێنج پەرتووكێن مەزن بوو د تەوراتێ دا [1] د ڤان پەرتووكاندا دا مووسای هەمی ڕێنمایێن ئاینی جوهیان تێدا نڤێسابوون كو كونترۆل ل سەر ڕەوشت و سەرەدەریا جوهیان یا كەڤن دكر. تشتێ هەرە گرنگ ژی ئەوە كو هەر "10

---

[1] ئەو هەر پێنج پەرتۆك ئەڤەبوون ( سەفەرا دروستبوونێ، دەركەفتنێ، لاویون، هژماران، دووبارەكرن)

وەسیەت" تێن مووسای تێدا هەنە. ژبەر ڤان پەرتووك و ڕێنمایان ئەم دشێن بێژین مووسا کەسەکێ گەلەك بێهن فرەهـ بوو و کاریگەری ل سەر ملیونەها جوهیان کریە.

دەربارەی ڤێ چەندێ ژی چ جوداهی دناڤبەرا بوچوونێن دیروکنڤیساندا نینن کو مووسای ب تنێ ئەڤ پەرتووکە نڤێسابن بەلکو گەلەك کەسێن دی پشکداری د نڤێسینا واندا یا کری و ڤان کەسان پشتی وەغەکرنا مووسای ژ نوو ئەڤ کارە یێ کری.

سێ: هندەك ڤەکۆلەر گەهشتینە وێ باوەریێ کو مووسا ب خۆ "ابو التوحید" بوو، ئەوژی ژبۆ ڤێ بوچوونێ پشت بەستنێ د کەنە سەر وان بەلگەیێن د تەوڕاتێ دا هاتین، لێ تەوڕات ب خۆ ژبۆ مە دیار دکەت کو "ابا التوحید" مووسا نەبوو بەلکو ئیبراهیم پێغەمبەر (سلاڤ ل سەر) بوو. لێ ئەم دشێن دبێژن ئەڤ تەوحیدە یا بەردەوام نەدبوو ئەگەر مووسا نەهاتبا ژبەرکو ئەو شیا دووبارە زیندی بکەت و بهێلیتە ساخ و د دلێن جوهیان دا جێگیر بکەت.

مووسای باوەری ب خودایێ ئێکانە و بێ هەڤپشك ئینا و ئەڤ باوەری بوو ئەگەر جهێ وی دناڤ ئاینێن ئەسمانی و دیروکێ دا هەر مەزن و بلند بمینیت.

## 16. چارلز داروین Charles Darwin

## (1809ز. – 1882ز.)

### چارلز داورین

### ئەو زانایێ گوتی مرۆڤ یێن ژ مەیمینکان پەیدابووین

چارلز داروین ل 12 شواتا 1809 زاینی ل وەلاتێ ئینگلتەرا ژدایکبوویە ئانکو د هەمان ڕۆژدا یا سەرۆکێ ئەمریکا ئەبراهام لینکولن ژداکیبووی. ل ژیێ 16 سالیێ دا چوویە زانکۆیێ ژبۆ خواندنا زانستێن پزیشکی لێ پشتی هینگێ هاتیە ڤەگۆهاستن بۆ زانکۆیەکا دی ژ پێخەمەت خواندنا زانستێ ئاینزانییێ یانژی لاهوتی[1]. ل وێ زانکۆییێ ئەو چەندە ژبۆ وی دیاربوو کو هندەك چالاکییێن دیژی هەنە وەك سیاربوونا هەسپی و نێچیکرن و مەلەڤانی ژ خواندنا زانکۆییێ فەرترن.

ل وی دەمێ ل زانکۆیێ د خواند، داروینی ماموستایەکێ خۆ ڕازیکر پشکدارییێ د گەشتا وان یا دەریای دا ب پاپۆرا "بیجل" بکەتن کو بریاربوو گەشتەکێ ل دورماندوری دونیاییێ بکەت، داروینی د ڤێ گەشتێ خۆدا دا وەکی وەکی ڤەکۆلەرەکێ سرۆشتی دگەل وان کارکەت، لێ بابێ وی ل سەر ڤێ چەندێ ڕازی نەبوو چونکی وی هزرکر دکر مەرەما داروینی ب تنێ ئەوە ژ خواندنا کولیژی ب ڕەڤیت و خواندنا خۆ ب دوماهیك نەئینیت. لێ پشتی وی باوەری بۆ بابێ خۆ چێکری کو ئەڤ گەریانا وی یا زانستی کارەکێ گەلەکێ گرنگە ژبەرکو کەسێ بەری وی د دیروکێ دا ب چ گەشتێن زانستی یێن بڤی ڕەنگی نەڕاببوو.

ل سالا 1831 پاپۆرێ دەست ب گەشتا خۆ کر و ل وی دەمی ب تنێ ژیێ داروینی 22 سالێ بوون، د ماوێ پێنج سالێن خۆ یێن گەشتکرنێ دا، پاپۆر چوو کنارێن گزیرتێن ئەمریکا باشور و گزیرتا "کالا باجوس" یا ڤالا و بێ مرۆڤ، زێدەباری هژمارەکا مەزن یا گزیرتێن زەریا هێمن و باشورێ زەریایا ئەتلەسی.

---

[1] لاهوتی زانستەکە ڤەکۆلینێ ل دور وان باوەریان دکەتن یێن باوەری بخودێ ڤە هەبن .

د ماوێ ڤێ گەریانێ دا داروینی گەلەك سەیروسەمەرێن جیهانا گیانەوەر و ڕۆەك و زیندەوەرێن بەردبوویی و زیندەوەرێن پێشەنگی دیتن، ل دویڤدا وی گەلەك نموونە و داتا ژ ڤان گیانەوەر ڕۆەكان وەرگرتن و تیبینیێن خۆ ل سەر دنڤیسیان. ل دویڤدا ئەڤ پێزانین و تیبینیە بوونە ژێدەری هەمی وان پەرتووكێن وی پشتی هینگێ بەلاڤكرین، هەر ب هاریكاری و پشت بەستن ل سەر ڤان تیبینیان داروین شیا تیورا خۆ یا بناڤودەنگ ل سەر بنیاتێ پەیدابوونا زیندەوەران ل سەر ڕوییێ ئەردی ب دانیت.

ل سالا 1836 داروین جارەكا دی ڤەگەریا وەلاتێ و بۆ ماوێ پتر ژ 20 سالان ڤەكۆلین و تیورێن خۆ بەلاڤدكرن و ڤێ چەندێ ژی هاریكاریا وی كر هەر زوی بناڤودەنگ بیت و ببیتە ئێك ژ مەزنترین و بناڤودەنگترین زانایێن بایۆلوژی ل جیهانێ. ل سالا 1837 داروین ب تەمامی گەهشتە وێ باوەرییێ كو ئەڤ مرۆڤ و ڕۆەك و گیانەوەرێن سەردەمێ ئەڤروكە ئەم دبینین ل دەستپێكێ دهوسا نەبوون بەلكو بەری هزارەها سالان گوهۆرین ب سەرداهاتینە هەتا گەهشتینە شێوێ وان یێ ئەڤروكە و دبیت پشتی چەند هزار سالێن دی شێوەیەكێ دی وەربگرن، لێ ل وی سەردەمی وی نەشیا دیاربكەت كا ئەگەرێ ڤێ گوهۆرین وپەرەسەندنێ چیە.

داروینی ل سالا 1838 ڤەكۆلینەكا زانستی یا ڤەشە "تۆماس مالتوس"ی ب ناڤێ "ڤەكۆلینەك ل دور بنیاتێ زێدەبوونا هژمارا ئاكنجیان" خواند، خواندنا ڤێ ڤەكۆلینێ كلیلكا دەرگەهڤەبوونێ ل هەمبەر دانانا تیورا "هەلبژارتنا سرۆشتی ژ پێخەمەت مانا دژیانێ " دانا. هەرچەندە داروین هەر زوی شیا تیورا هەلبژارتنا سرۆشتی ب دانیت لێ وی لەز ل بەلاڤكرنا وێ نەكر چونكی وی پێشبینیا هندێ دكر ئەڤ تیورە دێ گەلەك گەنگەشە و نەڕازیبوونان ل دویڤ خۆ ئینیت لەوڕا وی بریاردا ژبۆ ماوەیەكێ درێژ ڤەكۆلینان ل سەر ڤێ تیورا خۆ بكەت و گەلەك بەلگەیان ل سەر ڕاستیا وێ ب دەستخوڤە بینیت بەری بەلاڤبكەت.

ل دەستپێكێ ل سالا 1842 مانشێتێن سەرەكیێن پەرتووكا خۆ نڤێسان، لێ پشتی هینگێ ژبەر نەخۆشیا خۆ دەست ژێ بەردان هەتا ل سالا 1844 دووبارە دەست ب نڤێسینا پەرتووكێ كرەڤە، داروین بەری پەرتووكا خۆ ب دوماهی بینیت ل سالا 1858 هندەك نامەیێن دەستخەتی ژلایێ زانایێ بریتانی "ئەلفرێد ڕۆسل والاس" گەهشتنێ كو ل وەلاتێ

هندێ دژیا و تێدا بەحسێ ئەنجامێن ڤەکۆلینێن خۆ ل سەر بابەتێ گوهۆرین و پەرەسندنا زیندەوەران کربوو داکو بوچوونا خۆ ل سەر ئەنجامێن وی دیاربکەت وەك ئێك ژ زانایێن بایۆلوژی. تشتێ سەیر ل ڤێرێ ئەوبوو کو ئەو ئەنجامێن والاس د ڤەکۆلینین خۆدا گەهشتیێ هەر وەکی وان ئەنجامان بوون یێن داروینی ژی دهەمان دەمدا د ڤەکۆلینێن خودا ب دەستڤەئینایین.

هەلبەت ئەڤ چەندەژی ڕویدانەکا گەلەك نەخۆش و ب شەرم بوو ژبۆ داروینی چونکی ئێدی دێ یا بزەحمەت بیت خەلك بزانیت کیژ ژ وان بەری هینگێ ئەڤ ئەنجامە ئاشکەراکرینە هەرچەندە داروینی بەری هینگێ ب کورتی بەحسێ ئەنجامێن ڤەکۆلین و تیورا خۆ بۆ دەزگەهەکێ زانستی یێ وی سەردەمی کربوو، لێ ل وی سەردەمی کەسێ گرنگی نەدا ڤێ ڕویدانێ و بۆ خەلکی یا گرنگ نەبوو کا کی بەری کێ تیورا هەلبژارتنا سرۆشتی دانایە، بەلکو ڕویدانا هەرە مەزن ئەوبوو دەمێ داروینی ل سالا ل دویڤدا پەرتووکا خۆ یا بناڤودەنگ "بنیاتێ جوران" بەلاڤکری.

د دیروکێ دا چ جاران هوسا ڕوینەدایە کو دەرکەفتنا پەرتووکەکێ هەڕایەکا زانستی و جڤاکی ل دویڤ خۆ بینیت هندی وێ هەڕایێ یا ل دەمێ دەرکەفتنا پەرتووکا داروینی پەیدابووی دەربارەی بنیاتێ جورێ هەر زیندەوەرەکی ب ڕێکا کریارا هەلبژارتنا سروشتی یان مانا زیندەوەرێن بهێز و ژناڤچوونا زیندەوەرێن لاواز د ژیانێ دا، ئەڤ گەنگەشە تا هینگێ دبەردەوام بوون دەمێ داروینی پشکا دوێ ژ پەرتووکا خۆ ل سالا 1871 زاینی ب ناڤێ "بنیاتێ مرۆڤی و هەلبژارتنا سروشتی یا پەیوەندی ب ڕەگەزێ مرۆڤان هەی"، د ڤێ پەرتووکێ دا داروینی هوسا دابوو دیارکرن کو مرۆڤ ژ جورەکێ مەیمینکان پەیدابووینە، ئانکو ل دەستپێکێ مرۆڤ ل سەر شێوێ خۆ یێ نوکە نەبوون بەلکو گوهۆرین ب سەر هندەك جورێن مەیمینکاندا هاتیە و بووینە مرۆڤ، هەلبەت ڤێ چەندێ ژی هەڕایەکا زانستی و تۆرەبوونەکا دینی یا مەزن ل دویڤ خۆ ئینا.

لێ پشتی دەرکەفتنا ڤان پەرتووکان و گەنگەشەیێن زانایان ل سەر ڤێ چەندێ، داروین یێ ئامادەنەبوو بەرسڤا کەسێ بدەت ژبەرکو تووشی نەخۆشیەکا گران ببوو، ئەڤ نەخۆشیە هەر ل هینگێ هاتبوویێ دەمێ ژ گەشتا خۆ یا بناڤودەنگ ل دور دنیایێ زڤڕی ژبەرکو دەمێ چووینە کێشوەرێ ئەمریکا باشور هندەك مێشومورێن زیانبەخش لەق

دانابوونێ و ئەڤ نەخۆشیە دەم بۆ دەمی لێ دزڤڕی هەتا دوماهیێ ل سالا 1882 زاینی گیانێ خۆ ژدەستدای.

پشتی مرنا داروینی زانایێ بناڤەدەنگ "تۆماس هکسلی" ل شوینا داروینی بەرەڤانی ژ بوچوون و تیورا وی دەربارەی پەرەسەندنا زیندەوەران کر ئەوژی پشتی کو چەندین گوهۆرین و دەستکاری د تیورا ویدا کرین و هندەك شاشیێن وێ بۆ ڕاستڤەکرین.

ئەم دشێن بێژین کو داروین ب تنێ خودانێ تیورا پەرەسەندنێ نەبوو ژبەرکو بەری وی و پشتی وی گەلەك زانایێن دی بزاڤا ڤێ چەندێ کربوو وەك زانایێ فرەنسی "لامارك" و زانا "ئارازموس داروین" کو دبیتە باپیرێ چارلز داروینی.

## 17. شی هوانگ تی Shih Huang Ti

## (259 ب.ز – 120 ب.ز)

### شی هوانگ تی

### ئەو سەرکردەیێ ئیمپراتۆری و دیوارێ چینێ یێ مەزن دانای

شی هوانج تی سەرکردەیەکێ چینی یێ مەزن و بناڤودەنگ بوو، د ماوێ ناڤبەرا سالێن 238 بەری زاینی هەتا 210 بەری زاینی فەرمانڕەوایی ل ئیمپراتۆریا چینێ یا مەزن دکر، ئەڤ سەرکردە شیا هەمی وان ویلایەتێن چینی یێن ژێکڤەبوویی و هەڤڕکی دناڤبەرا واندا هەی بکەتە ئێك و ئیمپراتۆریەکا بهێز ب دامەزرینیت و پشتی هینگێ گەلەك گوهۆڕین وچاکساری دڤێ ئیمپراتۆرییێ دا کرن وەك نەهێلانا گەندەلی و دزی و ژێکڤەبوون وکارێن خراب. ئەڤ گوهۆرین و چاکسازیی بوونە ئەگەر هەتا سەردەمێ ئەڤروکە ژی چین وەکی وەلاتەکێ بهێز بمینیت و شارستانی و کەلتور و ئێکگرتنا خۆ یا جوگرافی بپارێزیت، ژبەر ڤێ کاریگەریا مەزن مە ناڤێ ڤی سەرکردەی دانا دڤێ لیستێ دا.

بەری هاتنا ڤی ئیمپراتۆری، چین وەلاتەکێ ژێکڤەبووی و وێرانکی بوو ژبەرکو بەری هینگێ چەندین شەڕێن مەزن و خویناوی ل سەر ئەردێ وی ڕویدابوون، سەرکردە و میرێن ویلایەتێن چینێ بەردەوام د شەڕی دابوون و ئێکودوو دکوشت لەوڕا ژی ئەڤ ویلایەتە بۆ ماوەیکێ درێژ مابوونە د کاودانێن شەڕی دا.

ل وی سەردەمی ناڤێ ئێك ژ وان ویلایەتان چین بوو، لێ پشتی سەرکردێ ڤێ ویلایەتێ هندەك بنەمایێن ڕەوشتی یێن گرنگ پەیرەو کرین، وەك فەلسەفەیا هەبوونا بنەمایێن ڕەوشتی ژبۆ سەەردەریا مرۆڤی دگەل ئێك و دگەل وەلاتی، دبیت ئەڤ بنەمایە گەلەك بهێز و کارتێکەر بن و هەمی کەس د وەلاتی دا ژ سەرکردەی هەتا بچووکترین کەس پێگیریێ پێ بکەت. ئەڤ بنەمایە بوونە ئەگەر ویلایەتا چینێ هێدی هێدی بهێز بکەڤیت هەتا شیای هەمی ویلایەتێن دی ڕزگاربکەت و ئیمپراتۆریا چینێ ب دامەزرینیت و ل دویڤدا ڤی سەرکردەی ناڤێ خۆ کرە "شی هوانج تی" ئانکو سەرکردێ چینێ یێ ئێکێ.

ڤی سەرکردەی هەر زوی هندەك گوهۆرینێن ڕیشەی د ویلایەتا چینی و هەمی ویلایەتێن دی یێن ژ نوو ڕزگاربووین ئەنجامدان و پاشی دووبارە وەلاتێ خۆ ل سەر 36 ویلایەتێن نوو دابەشکر و بۆ هەر ویلایەتەکێ ژی میرەك دانا و پاشی بۆ هەر ئێکێ لەشکەرەکێ بهێز و سەرکردیەکێ شەڕی یێ چەلەنگ دانا، وی ئەڤ پۆستە نە ل سەر بنەمایێ بۆماوەی و خزمانیێ دانان بەلکو وی کەسێن ژ هەژی و چەلەنگ هەلبژارتن و دامەزراندن. ل دویڤدا ژی وی شیرەتکارەك دامەزراند ژبۆ هەڤسەنگکرنا دەستهەلاتێ دناڤبەرا دەستهەلاتداریێ مەدەنی و دەستهەلاتداریێ لەشکەری داکو هەر ئێك ژ وان بزاڤێ نەکەت دەستهەلاتێ هەمیێ بگریت و ببیتە کەسەکێ دکتاتور.

ل دویڤدا ڤی سەرکردەی بریاردا کەسێن زەنگین و چینا ئورستوکراتی ب ڤەگۆهێزیتە پایتەختی داکو ب شێوەیەکێ ڕاستەخۆ ل بن کونترۆل وچاڤدێریا وی بن. هەردیسان بریاردا هەمی باژێر و گوند ب ڕێکێن فرەهـ و بلەز پێکڤە بهێنە گرێدان داکو خەلك ب سانەهی سەرەدانا باژێرێن ئێکودوو بکەن ژ پێخەمەت بهێزکرنا هەستا نیشتیمان پەروەری و بازرگانیێ. ل دویڤدا وی ب شێوەیەکێ فەرمی دیارکر کو هەکە باژێر هەمی پێکڤە نەهێنە گرێدان ل سەر فەرمانڕەوایێ وەلاتی دێ یا ب زەحمەت بیت کونترولێ ل سەر وەلاتێ خۆ بکەت.

هەرچەندە سەرکردە هوانجی ب شێوەیەکێ ژیرمەندانە سەرکردەیێن لەشکەری و میرێن ویلایەتان د هەلبژارتن و شیا باژێران ب شێوەیەکێ باش و بهێز پێکڤە گرێبدەت و چینێ هەمیێ بکەتە ئیمپراتۆریەکا ئێکگرتی، لێ وی شاشیەکا گەلەك تەمسار ئەنجامدا کو د دیروکێ هەمیێ دا چ سەرکردەیان کارێن ب وی ڕەنگی نەکرینە ئەوژی ڕابوو ب سووتنا هەمی پەرتووکێن وی سەردەمی ب تنێ هژمارەکا کێم یا پەرتووکان نەبیت ل سەر بابەتێن کشتوکالێ و پیشەسازیێ.

دیروکنڤێس دبێژن وی دانەیەك ژ هەر پەرتووکەکا وی سووتی د پەرتووکخانەیا سەرەکی یا وەلاتی دا هەلگرت لێ هەتا نوکە چ بەلگەیێن باوەرپێکری ل دور ڤێ چەندێ نینن. مەرەما ڤی سەرکردەی ب سووتنا ڤان پەرتووکا ئەوبوو ڤیا ب هەر ڕەنگەکێ هەبیت کونترۆلێ ل سەر هەمی پاشمایێن کونفۆشیوسی و ڕێنمایێن ئاینێ وی بکەت و نەهێلیت.

سیاسەتا دەرەکی یا ڤی سەرکردەی گەلەك یا دژواربوو، وی پەیوەندیێن بهێز دگەل وەلاتێن هەڤسوییێن خۆ هەبوون، لێ لەشکەرێ وی یێ بەردەوام بوو ل سەر داگیرکرنا وان وەلاتێن دکەفتینە باکورێ چینێ و ل دویڤدا بریاردا دیوارەکێ مەزن ل دورماندوری هەمی دەڤەرێن لژێر ئیمپراتۆریا چینێ ئاڤا بکەت کو ب دیوارێ مەزنێ چینێ یێ ناڤدارە و هەتا ئەڤروکەژی یێ مای.

ئەڤ شەرێن مەزن و دژوار پێدڤی ب پارەیەکێ مەزن هەبوون لەورا بریاردا باجێ ژ خەلکی وەربگریت، ئەڤ چەندە ببوو ئەگەر کەربێن خەلکی ژ وی ڤەبن لێ دگەل هندێ یا ب زەحمەت بوو وی ژ دەستهەلاتێ بێخن. هەرچەندە گەلەك کەسان بزاڤا کوشتنا وی کر لێ کەس نەشیا بکوژیت هەتا ل دوماهیێ ئەو دناڤ جهێن خۆ دا مری.

پشتی مرنا وی کورێ وی هاتە سەر کوسیکا دەستهەلاتێ لێ ویژی خۆ لبەر پێلێن دژوار یێن نەرازیبوونێن خەلکی نەگرت لەورا پشتی چوار سالاَن ئەوژی هاتە کوشتن و پشتی هینگێ کاودانێن ئیمپراتۆریا چینێ تێکچوون.

دیروکنڤیسان بوچوونێن جوداجودا دەبارەی گرنگی و رۆلێ سەرکردێ چینێ یێ ئێکێ هەنە، شیوعی وی ب سەرکردەکێ پێشکەفتی ل قەلەم ددەن و ئەوروپی ژی وی وەکی ناپولیونی دبینن، لێ ئەم دشێن بێژین ئەڤ سەرکردە شیابوو ئیمپراتۆریەکا چینی یا بهێز ب دامەزرینیت و ئاشتی و ئێمناهی و رێکوپێکیا کاروبارێن وەلاتی و لەشکەری بپارێزیت لێ چ سەرکردەیێن دی یێن چینی نەشیابوون پشتی وی ڤی کاری ل ئیمپراتۆریا چینێ بکەن.

هندەك کەس سەرکردێ چینێ یێ ئێکێ ب ئیمپراتۆرێ رۆمانی ئوگوست قەیسەری کو دهێتە هەژمارتن دامەزرێنەرێ ئیمپراتۆریا رۆمانی هەڤبەر دکەن، لێ ناهێتە ڤەشارتن کو ئیمپراتۆریا رۆمانی ژلاییێ قەبارەی ڤە یا بچووکتر بوو و ماوەیەکێ کێمتر ژیابوو و کێمتر یا پێکڤە گریدایی بوو، بەروڤاژی ئیمپراتۆریا چینی کو بۆ ماوەیەکێ درێژ کاریگەریا وێ مابوو و هەتا سەردەمێ ئەڤروکەژی شینوارێن وێ ماینە.

## 18. ئوگوست قەیسەر Augustus Caesar

## (63 ب.ز. – 14ز.)

### ئوگوست قەیسەر

### ئەو سەرکردێ ئیمپراتۆیا ڕۆمانی دامەزراندی

ئوگوست قەیسەر دهێـە هەژمارتن ئێك ژ كەسایەتییێن هەرە پێشچاڤ د دیروکێ دا چونکی وی ئێك ژ مەزنترین و بهێزترین ئیمپراتۆری ل سەر عەردی دانابوو ئەوژی ئیمپراتۆریا ڕۆمانی بوو. پشتی ب دوماهی هاتنا شەڕێن ناڤخۆیی یێن کو بووینە ئەگەرێ ژێکڤەکرن و پارچەکرنا کومارا ڕۆمانی ل چەرخێ ئێکێ بەری زاینی، لێ پشتی هینگێ ئوگوست هات و شیا دووبارە سیستەمێ ناڤخۆیی یێ ڤێ کومارێ ڕێکبێخیت و بکەتە ئیمپراتۆریەکا بهێز کو بۆ ماوێ چەندین چەرخان بەردەوام بوو.

ناڤێ وی یێ دروست "مابوس ئوکتافیوس"بوو لێ پشتی ژیێ وی گەهشتیە 35 سالێیێ ژ نوو ناسناڤێ ئوگوست [1] ژبۆ خۆ هەلبژارت. ئوگوست کورێ یولیوس قەیسەری بوو کو ئێك بوو ژ مەزنە بەرپرسێن لەشکەری یێن ڕۆمانی. لێ ژبەرکو یولیوسی چ زاروك نەبوون لەوڕا وی ئوکتافیوس وەکی کورێ خۆ ب خۆدانکر و گەلەك حەژێکر و وی بخۆ ئەو ل سەر ڕێبازەکا سیاسی پەروەردەکر، دەمێ ل سالا 44 بەری زاینی یولیوس قەیسەر هاتیە کوشتن ل وی دەمی ژیێ ئوکتافیوسی ب تنێ 18 سالێ بوون.

پشتی کوشتنا یولیوس قەیسەری، هەڤڕکی و ناکوکیێن مەزن و خویناوی کەفتنە ناڤ سەرکردەییێن لەشکەری ل ڕۆما، پشتی هینگێ وان بریاردا فەرمانڕەوایا یولیوسی بکەنە د دەستێ کورێ برایێ وی ئوکتافیوسی دا و کەسێ نەڕازیبوونا خۆ ل سەرڤێ چەندێ دیارنەکر چونکی کەسەکێ گەنج و چەلەنگ بوو.

ئوکتافیوس نەك تنی ژبەرکو برازایێ یولویوس قەیسەری بوو بهێتە هەلبژارتن بەلکو وی ب زیرەکانە پیلانەك دارێژت داکو تەختێ فەرمانڕەوایێ وەربگریت. ئەو شیا

---

[1] ئوگوست ناڤەکێ ڕۆمانی یێ کەڤنە ب ڕامانا "مەزن" دهێت.

هژمارەکا هەڤالێن مامێ خۆ ڕازیبکەت کو پشتەڤانیا وی بکەن، پشتی هینگێ لەشکەرێ ڕۆما چوونە پشتا "مارك ئەنتۆنیو"ی کو ئێك بوو ژ هاریکارێن یولویوس قەیسەری لێ پشتی هینگێ ڕۆما تووشی گەلەك شەڕێن درێژبوو کو دناڤبەرا پشتەڤانێن ئەنتۆنیوی و ئوکتافیوسی ڕویدان.

ل وی دەمی ئەنتۆنیو کەفتە د عەشقا کلیوپاترایێ دا و ڤێ چەندێ وەل وی کر ئەو ب تەمامی ژ دەستهەلاتێ دوورکەڤیت لێ بەروڤاژی ئوکتافیوس یێ بەردەوام بوو ل سەر زێدەکرنا پشتەڤان و دویفکەفتیێن خۆ، ل سالا 31 بەری زاینی د شەڕێ "ئوکتیوم" یێ دەریایی دا هێزێن ئەنتۆنیوی تووشی شکەستنێ بوون و ل سالا 30 بەری زاینی شەڕەکێ دی یێ مەزن دناڤبەرا واندا ڕویدا کو هێزێن ئوکتافیوسی سەرکەفتنەکا مەزن تومارکر و لەشکەرێ بەرامبەر شکاند، ئەڤ چەندە بوونە ئەگەر ئەنتۆنیو و کلیوپاترا هەردوو خۆ بکوژن.

پشتی هینگێ ئوکتافیوس شیا مەزناهی و سەرکەفتنێ دووبارە بۆ ڕۆما ب زڤڕینیت ئەوا مەزناهیا ل سەردەمێ مامێ وی بۆ ماوێ پتر ژ 15 سالاَن هەی، لێ دەمێ مامێ وی یولیوس قەیسەری بزاڤ کرین خۆ بکەتە شاهێ ئێکێ ل سەر ڕۆما ب تایبەت پشتی سیستەمێ کوماری لادای، ژلایێ نەیارێن خۆڤە هاتە کوشتن.

لێ ئوکتافیوس سەرەڕای پابەندبوونا وی ب سیستەمێ کوماری لێ شیا دەستێ خۆ ب دانیتە سەر ڕۆما و دەستهەلاتێ کونترۆل بکەت و خۆ بکەتە فەرمانڕەوایێ ئێکانە. لێ نەشیا ناسناڤێ "شاهـ" ب دەستخوڤە بینیت، لێ شیا بۆ ماوەیەکێ درێژ حوکمی ل وەلاتێ ئیسپانیا و سوریا و دەڤەرێن "جال" بکەت، ل ڤان ویلایەتان یانژی وەلاتان هێزێن ڕۆمانی شیان ب تەمامی کونترۆلێ ل سەر خەلکی بکەن.

ئوگوست ئەو کەس بوو یێ شیایی ب سیاسەتا خۆ یا هەڤپەیمانیێ هەمی وان بریناں چارەسەربکەت یێن ژ ئەنجامێ شەڕێن ناڤخۆیی تووشی ڕۆما بووین. وی بۆ ماوێ پتر ژ 40 سالاَن فەرمانڕەوایی ل ڕۆما کر و کارتێکرنا سیاسەتا وی بۆ ماوەیەکێ درێژ کاریگەری ل سەر ڤێ ئیمپراتۆریێ هەبوو. ل سەردەمێ وی، لەشکەرێ ڕۆما شیا وەلاتێن ئیسپانیا و سویسرا و تورکیا کەڤن و بەشەکێ مەزن ژ وەلاتێ "بەلقان" داگیر بکەت،

سنورێن ئیمپراتۆریا وی ل لایێ باکوری گەهشتنە هێلا "ڕاین" و "دانوب" و ئەڤ سنورە بۆ ماوێ چەندین چەرخان مان.

ئوگوست کەسەکێ کارگێری یێ زیرەك و سەرکەفتنی بوو، ئێکەم کەس بوو کو هزرا دانانا زێرەڤانێن تایبەت کری کو پشتی هینگێ ڤان زێرەڤانان ڕۆلەکێ مەترسیدار و مەزن هەبوو ل سەر هەلبژارتنا شاهـ و فەرمانڕەوایان.

هەردیسان ل سەردەمێ وی گەلەك ڕێك هاتنە ڤەکرن و ئاڤاهی و خانییێن جوان و مەزن هاتنە چێکرن، ئەڤ چەندە بوو ئەگەر ڕۆما ببیتە ئێك ژ جوانترین باژێرێن دونیایێ، هەروەسا ل سەردەمێ وی پەرستگەهـ هاتنە ئاڤاکرن و خەلك هاندا کو هەلکەفتنێن ئاینێ یێن کەڤن دووبارە زیندی بکەنەڤە، وی هندەك یاساییێن تایبەت بو ژنئینانێ دانان و پشتەڤانیا خەلکی کر کو گەلەك زاروکان بەرهەم بینن.

ل سالا 30 بەری زاینی ئیمپراتۆریا ڕۆمانی شیا ب دروستاهی ئاڤا ببیت و ئێمناهی و ئاسایش ل هەمی پارچەییێن وەلاتێ بەرفەڕاڕ بوو، ئەڤ چەندە بوو ئەگەر هەمی بوارێن ژیانێ وەك هونەر و ئەدەب و زانست و بیناسازی پێشکەفتنەکا مەزن ب خوڤە بینن. ل سەردەمێ وی دهێتە نیاسین ب چاخێ زێڕین یێ ئەدەبی ژبەرکو هژمارەکا ئەدیبێن مەزن پەیدابوون وەك "فرجیل" و " هۆراس" و " لیفی". لێ ئەدیب "ئوفید"ی قەیسەر تۆرەکر لەوڕا بریار هاتەدان ژ ڕۆما بهێتە دەرئێخستن.

ئوگوستی چ زاروك نەبوون، هەردیسان زاروکێن برایێ ویژی بەری وی مرین لەوڕا نەچاربوو کورێ هەڤژینا خۆ "نیریوس"ی ل جهێ خۆ ب دانیت و بکەتە جهگرێ خۆ.

پشتی هینگێ بوو ماوێ پتر ژ 100 سالاں ئیمپراتۆریا ڕۆمانی ب ئازادی و ئارامی دەربازبوو, دڤی ماوەیی دا و لژێر سیبەرا ڤێ ئازادیێ هزرۆبیرێن ئەدەبی و هونەری و فەلسەفی یێن مەزن پەیدابوون کو بەری هینگێ د دیروکێ دا نەهاتبوونە بەرچاڤ. هەردیسان ئەڤ پێشکەفتنە ل هەمی وان وەلاتان پەیدابوو یێن کەفتینە ژێر داگیرکرنا لەشکەرێ ڕۆمانی.

ئیمپراتۆریا ڕۆمانی دهێتە هەژمارتن بناڤودەنگترین و مەترسیدارترین و کاریگەرترین ئیمپراتۆری د دیروکا مرۆڤایەتیێ دا، چونکی ل سەردەمێ وێ شارستانیا

مرۆڤان گەهشتە گوپیتکێ و بوو ئەگەر شارستانییێن دی یێن دونیایێ وەك شارستانیا مسرِ و بابل و جوهی و گریکان بهێنە ڤەگوهاستن بۆ وەلاٌتێن رِۆژئاڤای.

ئەگەر ئەم هەڤبەرکرنەکێ دناڤبەرا ئوگوست قەیسەری و مامێ وی یولیوس قەیسەری دا بکەین، چ جوداهی ژلایێ بیرتیژی و جوانی و هێزا کەسایەتی و سەرکەفتنێن وان یێن شەرِی دا نینە، لێ مامێ وی پتر یێ چاڤنەترِس و زیرەك بوو، هەردیسان مامێ وی شیا فانتازیا سەردەم د مێشکێ خەلکی دا ب ئازرینیت.

لێ ژلایێ دیروکی ڤە، ئوگوست گرنگتر و کاریگەر تربوو، هەرچەندە مامێ وی ژ وی بناڤودەنگتربوو لێ ناڤودەنگی نە پیڤەرەکێ مەزنە بۆ مەزناهی و نەمریا زەلاٌمان. هەرچەندە مەزناهیا ئوگوستی ژلایێ لەشکەریڤە نەگەهشتبوو یا ئەلیکساندەرێ مەزن، لێ سەرکەفتنێن ئوگوستی مەزنتربوون و کاریگەریا وان بۆ ماوەیەکێ درێژتر مابوو و ئەڤ چەندە خالاٌ جوادهییێ بوو دناڤبەرا واندا.

## 19. نیکولاس کوپەرنیکوس Nicolaus Copernicus

## (1473ز.- 1543ز.)

### نیکولاس کوبرنیکوس

### ئەو زانایێ بوویە ئەگەرێ پەیدابوونا شۆڕەشەکا فەلەکناسی

نیکولاس زانایەکێ پولەندی یێ مەزن بوو، ل سالا 1473 زاینی ل باژێرێ "تۆن" ل سەر ڕێبارێ "فیستۆلا" ژدایکبوویە. ژبەرکو نیکولاس ژ خێزانەکا دەولەمەند و بناڤودەنگ بوو لەوڕا هەر زوی مالا وان ئەو فرێکرە بەر خواندنێ و ل زانکۆیا "خاکوڤ" هاتە وەرگرتن، ل وی دەمی نیکولاسی گەلەك حەز ژ خواندنا زانستێن فەلەکی دکر.

دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 20 سالێێ بەرەڤ وەلاتێ ئیتالیا چوو و دەست ب خواندنا زانستێن پزیشکی و یاسایێ ل زانکۆیێن پۆلۆنیا و بادوا کر. ل دویڤدا شیا باوەرناما دکتورایێ د زانستێ یاسایێ دا ل زانکۆیا "فیرارا" ب دەستڤە بینیت. هەرچەندە ڤی زانایی پتریا دەمێ خۆ وەك ماموستا کارکریە، لێ ب تنێ وی دەمی ڤەکۆلینێن خو ل سەر بوارێ فەلەکی دکرن دەمێ یێ بەتال لەوڕا ژی وەك فەلەکناسەکێ زیرەك نەهاتبوو نیاسین.

دەمێ ل وەلاتێ ئیتالیا ئاکنجیبووی، دەست ب خواندنا ڤەکۆلینێن زانایێ گریگی "ئەڕستاگوس"ی کر ئەوێ کو ل چەرخێ سیێ بەری زاینی ژیایی، ژ ڤەکۆلینێن ڤی زانایی بۆ نیکولاس دیاربوو کو هەمی ئەختەرو ستێرێن د گەردونی دا ل دور ڕۆژێ دزڤڕن و وی باوەری بڤێ بوچوونێ ئینا.

دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 40 سالێێ دەست ب ئەنجامدانا ڤەکۆلینەکێ کر ژ پێخەمەت پشتڕاست کرنا تیورا خۆ. پۆختەیێ ڤەکۆلینا وی ل سەر هندێ بوو کو ڕۆژ ل چەقی گەردونی یە و یا ڕاوەستیایە و هەمی ئەختەرێن وێ و ئەرد و هەیڤ ژی ل دورماندوری ڕۆژێ دزڤڕن و دگەل هندێ ژی وی چەندین تیبینی و بەلگە ل سەر ڤێ ڤەکۆلینێ ئامادەکرن، وی ئەنجامێن ڤێ ڤەکۆلینێ نیشا هەڤالێن خو ددان، و پاشی وی ئەڤ کارێن خۆ هەمی د پەرتووکەکێ دا ب ناڤێ "لڤینا تەنێن ئەسمانی" چاپکرن.

ل سالا 1533 و دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 60 سالێ، هژمارەکا وانەیان ل زانکۆیا ڕۆما پێشکێشکرن، ل وی دەمی شیا بنەماییێن تیورا خۆ بۆ زاناییێن وی سەردەمی شرۆڤە بکەت بێی کو ببیتە ئەگەرێ تۆرەبوونا دێرا کاسولیکی یا وی سەردەمی، لێ هەتا پەرتووکا خۆ ب دوماهی ئینای ژی هەر یێ دوو دل بوو ل سەر بەلاڤکرنا وێ ژبەرکو هزر دکر دێ دێرا کاسولیکی دژی وی ڕاوەستیت لەوڕا ژی بریاردا پەرتووکا خۆ بەلاڤ نەکەت هەتا گەهشتیە دوماهیا ژیێ 60 سالێ لێ وی ب خۆ ئێکەم دانەیا پەرتووکا خۆ نەدیت ژبەرکو ئێکەم دانە ل ڕۆژا وەغەرکرنا وی ل ڕێکەفتی 24 گولانا 1543 دەرکەفت.

د ڤێ پەرتووکێ دا نیکولاسی دیارکر کو ئەرد ل دور خۆ ب خۆ دزڤڕیت، هەیڤ ژی ژی ل دور ئەردی دزڤڕیت، ل هەمان دەمدا عەرد و هەمی ئەختەرێن دی ل دور ڕۆژێ دزڤڕن.

هەروەکی زاناییێن بەری هینگێ، کوبرنیکوس نەشیا ڕۆبەر و بەرفرەهیا کوما ڕۆژێ و دووراتیا ئەختەران ژ ڕۆژێ دیاربکەت، هەردیسان ئەو تووشی شاشیەکێ بوو دەمێ بەحسێ ئاڕاستێ زڤڕینا ئەختەران ل دور ڕۆژێ کری، وی هزرکر ئەختەر ب شێوەیەکێ بازنەیی یان نیمچە بازنەیی ل دور ڕۆژێ دزڤڕن، ئەڤ چەندە بوو ئەگەر کو تیورا وی نەك ب تنێ ژلایێ ماتماتیکیڤە گەلەك یا ب زەحمەت بیت بەلکو تیورەکا شاش ژی بوو. لێ دگەل هندێ ژی ئەڤ پەرتووکا وی بوو جهێ گەنگەشێ و ڤەبوونا دەرگەهەکی کو چەندین فەلەکناسێن دی ژ خەو هشیاربن و بەردەوامیێ ب ڤەکۆلینێن وی و شۆڕەشا فەلەکی بدەن ب تایبەت ژی فەلەکناسێ دانیمارکی "تیخو پەراهو" ئەوی ْکو شیایی تیبینیێن خۆ دەربارەی خۆلا زڤڕینا ئەختەران ل دور ڕۆژێ ب شێوەیەکێ هویرتر و دروستر بەلاڤ بکەت.

هەر ب هاریکاریا تیبینی و پێزانینێن فەلەکناسێ دانیمارکی، فەلەکناسێ ئەلمانی "یوهانس کێلبر" شیا ب شێوەیەکێ گەلەگ هویر و دروست شێوازێ زڤڕینا ئەختەران ل دور ڕۆژێ دیاربکەت.

هەرچەندە فەیلەسوفێ گریکی ئەڕستاگوسی ب حەفت چەرخان بەری نیکولاسی دیارکربوو کو ڕۆژ سەنتەرێ گەردونی و هەمی ئەختەر ل دور دزڤڕن، لێ ژبەرکو ئەو تشتێ ئەڕستاگوسی دیارکری ب تنێ وەك هزرکرنەك بوو و چ بەلگەییێن زانستی ل سەر دیارنەکربوون لەوڕا ژی ژلایێ ناڤەندێن زانستیڤە نەهاتبوو پێشوازیکرن و کەسێ گرنگی

پیٚ‌نەددا، ژبەر ڤێ چەندێ ئەم دشێن ڕۆلێ سەرەکی بۆ نیکولاسی بزڤڕینین ژبەرکو شیا ڤێ گریمانا ئەڕستۆگوسی بکەتە تیورەکا زانستی یا باوەرپێکری ژلایێ ناڤەندێن زانستیڤە، ب ڕەنگەکی کو مرۆڤ دشێت ب سانەهی پێشبینیا لڤین و هاتنوچوونا ئەختەران بکەت و زێدەباری هەڤبەرکرنێ دناڤبەرا ڤیٚ‌تیورێ دگەل تیورێن کەڤن بکەت یێن دگوتی کو ڕۆژ و ئەختەرێن دی ل دور ئەردی دزڤڕن.

گومان تێدا نینە کو تیورا کوبرنیکوسی وەکی شۆڕەشەکێ بوو دەربارەی تێگەهشتنا مە بۆ زانستێ فەلەکی و لڤینا ئەختەران ل دور ڕۆژێ، هەردیسان بوو ئەگەرێ پەیدابوونا چەندین گوهۆرینێن ڕیشەی دەربارەی دیتنا مەیا فەلسەفی ژبۆ گەلەك تشتان. لێ داکو ئەم پتر د بهایێ ڕاستەڤینە یێ تیورا کوبرنیکوسی بگەهین، دڤێت ئەم بزانین کو زانستی فەلەکی وەکی زانستێن فیزیا و کیمیا و بایۆلوژی یێ ب مەترسی نینە، بۆ نموونە ئەم دشێن ئامیرەکێ تێلەڤزیونێ یان ترۆمبێلەکێ دروست بکەین بێی کو مە پێدڤی ب تیورا وی هەبیت، لێ گەلەك یا ب زەحمەتە ئەم بشێن ئامیرەکێ ژ ڤان دروست بکەین بێی کو پێدڤی ب تیورێن هندەك زانایێن دی وەك فاڕادای، ماکسوێل و لافوازێ و نیوتنێ نەبین.

لیٚ‌دگەل هندێ ژی ئەم نەشێن ڕۆلێ زانا نیکولاس کوبرنیکوسی ل سەر پێشکەفتنا ئامیرێن سەردەم بەرزەکەین ژبەرکو پەرتووکا وی وەك پێنگاڤا ئێکێ یا پەیدابوونا شۆڕەشەکا فەلەکی بوو و پشتی هینگێ چەندین زانایێن دی یێن مەزن هاتین و بەردەوامی ب ڕێبازا وی دا ب تایبەت زانا گالیلی و کێلبەر، کارێن ڤان هەردوو زانایان ژی بوونە ئەگەر هاریکاریا زانا نیوتنی بکەن کو یاسایێن لڤین و هێزا ڕاکێشان و تاودانێ بهێنە دانان.

## 20. ئەنتۆان لۆرێنت لاڤوازێ Antoine Laurent Lavoisier

## (1743ز- 1794ز.)

### لاڤوازێ

### ئەو زانایێ بنەمایێن زانستێ کیمیایێ داناین

زانایێ بناڤودەنگ ئەنتۆان لورێنت لاڤوازێ دهێتە هژمارتن ئێك مەزنترین زانایێن کو ڕۆلەکێ بەرچاڤ د پێشئێخستنا زانستێ کیمیایێ دا هەی، ل سالا 1743 زاینی ل باژێرێ پاریس ل فرەنسا ژدایکبوویە، ل وی سەردەمی زانستێ فیزیایێ گەلەك یێ دوور و بێ ئاگەهـ بوو ژ زانستێن کیمیا و ماتماتیك و فەلەکی، هەرچەندە تا وی سەردەمی گەلەك ڕاستی و پێزانینێن کیمیایی یێن مەزن هاتبوونە ئاشکەراکرن لێ چ زانا نەشیابوون ڤان هەمی ڕاستیان ل بن تیورەکا زانستی یا ئێکگرتی و گشتی خڕڤە بکەن.

ل وی سەردەمی زانایان هزردکر هەوا ئێکە ژ تۆخمێن سروشتی، هەردیسان تا وی دەمی کەسێ نەشیابوو پێکهاتەیێن ئاگری دیار بکەت. ئێك ژ شاشیێن دی یێن هەرە بەربەلاڤ ل وی سەردەمی ئەوبوو هزردکر هەر کەرەستەکێ شیانێن سووتنێ هەبن دڤێت کەرەستەیەك دناڤدا هەبیت  ب ناڤێ "کەرەستێ فلوجیستون" و ئەڤ کەرەستە ل دەمێ سووتنێ دەردکەڤیت.

ل ماوێ دناڤبەرا سالێن 1754 هەتا 1774 هندەك زانایێن کیمیایی وەك "جوزێف بلاك" و "جوزێف برۆستل" و "هێنری کافنبدیش" و گەلەکێن دی شیان هژمارەکا گازان ئاشکەرا بکەن ب تایبەت گازێن ئوکسجین و دوەم ئوکسیدا کاربونی و هایدروجین. لێ ژبەرکو ڤان زانایان باوەری ب هەبوونا کەرەستێ فلوجیستونی هەبوو لەوڕا ئەو نەشیان بهایێ وان کەرەستێن کیمیایی بزانن یێن وان ئاشکەرا کرین، بۆ نموونە وان هزر دکر ئوکسجین گازەکە ژ کەرەستێ فلوجیستونی دەردکەڤیت.

هەردیسان ل وی سەردەمی نەیا ڕۆهن و ئاشكەرابوو كا بوچی چەقەكێ داری پتر دناڤ ناڤەندەكی دا دسوژیت هەكە گازا ئوكسجین لێ هەبیت نەك هەوایێ ئاسایی. لێ لافوازێ هات و شیا ڤان ڕاستییێن كیمیایی هەمیان ل بن چارچوڤەكێ زانستی یێ دروست كومبكەت.

ئێكەم كارێ لافوازێ كری ڕەتكرنا هەبوونا كەرەستێ فلوجیستونی بوو، هەردیسان دیاركر كو سووتن ژ ئەگەرێ ئێكگرتنەكا كیمیایی دناڤبەرا ئوكسجین و كەرەستێ سووتنێ دا پەیدادبیت، هەروەسا دیاركر كو ئاڤ نە تۆخمە بەلكو پێكهاتەیەكێ كیمیایی یە و ژ ئوكسجین و هایدروجینی پەیدادبیت، د هەمان دەمدا هەواژی نە تۆخمە بەلكو ئەوژی ژ هەردوو گازێن ئوكسجین و نایتروجینی پێكدهێت.

هەرچەندە ئەڤ ڕاستیە ل سەردەمێ ئەڤروكەدا گەلەك د ڕۆهن و ئاشكەرانە لێ ل سەردەمێ لافوازێ كەسێ ئەڤ تشتە نەدزانین، هەتاكو هژمارەكا زانایێن وی سەردەمی ژی باوەری ب ڤان ڕاستیان نەبوو، لێ پشتی لافوازێ پەرتووكا خۆ یا ب ناڤودەنگ "بنەمایێن كیمیاییێ" ل سالا 1789 بەلاڤكری، ئێدی هژمارەكا مەزن یا زانایان باوەری ب كارێن وی ئینا.

پشتی لافوازێ دیاركری كو هەوا و ئاڤ نە تۆخمێن كیمیاینە، وی لیستەكا نوو یا تۆخمێن كیمیایی بەلاڤكر. هەرچەندە ڤێ لیستا ویژی هندەك شاشی تێدا هەبوون لێ ژبەركو ئێكەم كەس بوو هێمایێن زانستی ژبۆ تۆخم و هاوكێشەیێن كیمیایی داناین لەوڕا ئێدی خواندنا زانستێ كیمیاییێ ب هەمی زمانان گەلەك ب سانەهی كەفت.

ئەم دشێین بێژین لافوازێ ئەو زانایێ بەرپرسیارە یێ كو زانستێ كیمیایی كریە زانستەكێ گرنگ و ب هویری ل سەر خواندی، ژبەركو وی ڤەكۆلینێن خۆ ب شێوەیەكێ گەلەك ڕۆهن و ب هویربینی ل سەر كارلێكێن كیمیایی ئەنجامددان.

ژلایەكێ دیڤە ڤەكۆلینێن لافوازێ هاریكاریا زانایێن دی كر دكارێن خۆدا د سەركەفتی بن ب تایبەت دبوارێ خواندنا زانستێ جیولوجی و زانستێ فرمانێن لەشێ مرۆڤی، ژبەركو وی دیاركر كریارا هەناسەدانێ ژی كریارەكێ سووتنێ یە، ژبەر ڤێ چەندێ هەمی زیندەوەر و مرۆڤ و گیانەوەر تێهنا پێڤی ژبۆ لەشێ خۆ ژ سووتنا كەرەستێن ئەندامی ب هاریكاریا گازا ئوكسجینی وەردگرن.

هەرەکی گەلەك زانایێن دی، لافوازێ ژ ژبلی بوارێ کیمیایێ گەلەك زانستێن دی خواندن، بۆ نموونە وی یاسا خاند و باوەرنامەکا زانستی ژ پێ وەرگرت لێ پشتی هینگێ کار ب باوەرناما خۆ نەکر، هەردیسان وی گەلەك کارێن دی کرن ب تایبەت ل ئەکادیمیا زانستی یا شاهانە.

بۆ ماوەیەکی ژی ل ڕێکخراوا وەرگرتنا باجێ ژ خەلکی کار دکر و دەمێ شۆڕەشا فڕەنسی پەیدابووی ئەو دگەل 27 هەڤالێن خۆ هاتنە گرتن و پشتی هینگێ ل ڕۆژا 8 گولانا 1794 هاتنە دادگەهکرن وبریار هاتەدان بهێنە سێدارەدان، لێ خێزانا وی شیا وی ژ وەریسێ سێدارەدانێ قۆرتال بکەت.

خێزانا وی ژنکەکا گەلەك زیرەك و بیرتیژبوو و گەلەك هاریکاریا وی دکر ل دەمێ ئەنجامدانا ڤەکۆلینان، لەوڕا داخازا ژ دادوەری کر ل هەڤژینێ وی بوریت، لێ دادوەری گوتی: شۆڕەشا فڕەنسی پێدڤی ب چ زانایان نینە. لێ پشتی هینگێ هەڤاڵەکێ وی گوتە دادوەری"سێدارەدانا لافوازێ بۆ ماوێ خولەکەکێ زێدەتر ناڤەکێشیت، لێ 100 سالێ ژی تێرا فڕەنسا ناکەن هەتا کەسەکێ وەکی  وی دووبارە لێ پەیدادبیت" و ب ڤێ چەندێ دادوەر ڕازیبوو لافوازێ نەهێتە سێدارەدان.

ژبەر ڤان کارێن گرنگ ئەم دشێن ناسناڤێ "بابێ کیمیایێ" بدەینە زانا لافوازێ.

## 21. قۆستەنتینێ مەزن Constantine the Great

## (280 ز- 337ز.)

### قۆستەنتینێ مەزن

### ئەو ئیمپراتۆرێ ڕۆمانی یێ مەسیحەت ژ ئاینەکێ نهێنی کریە ئاینەکێ ئاشکەرا

قۆستەنتینێ مەزنێ دهێتە هژمارتن ئێکەم ئیمپراتۆرێ ڕۆمانی یێ مەسیحی، ژبەر مەسیحیبوونا وی و پشتەڤانیا وی بۆ ڤی ئاینی، ئاینێ مەسیحی گەلەك بەربەلاڤ بوو لەوڕا دهێتە نیاسین وەك خودانێ مەزنترین ڕۆل د گوهۆرینا ئاینێ مەسیحیەتێ ژ باوەریەکا سادە ژبۆ ئاینەکێ فەرمی یێ دەولەتێ یێ کونترۆل ل سەر ملیونەها مرۆڤان کری.

قۆستەنتین ل سالا 280 زاینی ل گوندێ "نیبسی" ل وەلاتێ یوگیوسلافیا ژدایکبوویە، بابێ وی ئەفسەرەکێ مەزن بوو دناڤ هێزێن لەشکەرێ ئیمپراتۆریا "دیوقلوتیان"ی دا، ل سالا 305 زاینی ڤی ئیمپراتۆری دەست ژ کارێ خۆ بەردا لەوڕا قۆستەنتین بۆ دەستهەلاتدارێ نیڤەکا ئیمپراتۆریا ڕۆمانی و دەمێ ل سالا ل دویڤدا ئیمپراتۆر مری، قۆستەنتین بوو ئیمپراتۆرێ ڕۆمێ هەمیێ.

لەشکەری وی ب ناسناڤێ شاهـ گازی دکرێ و هەرچەندە ئەڤ ناسناڤە ب دلێ گەلەك سەرکردە و ژەنەڕالێن سەربازی نەبوو لەوڕا ئەڤ چەندە بوو ئەگەرێ پەیدابوونا چەندین شەڕێن ناڤخۆیی یێن مەزن و درێژ. ئەڤ شەڕێن ناڤخۆیی ل سالا 313 زاینی ب دوماهی هاتن ئەوژی پشتی قۆستەنتینی دوماهیك هێرش کریە سەر هەڤڕکێ خۆ "ماکسنتیوس"ی د شەڕەکی دا ل نێزیك ڕۆما.

ماکسنتیوس شیابوو دەستهەلاتێ ل سەر لایێ ڕۆژئاڤای یێ ئیمپراتۆریا ڕۆمانی بکەت، لێ لایێ ڕۆژهەلاتی ل ژێر دەستهەلاتا "لیکنیوس"ی ڤەبوو هەتا ل سالا 337 قۆستەنتینی هێرش کریە سەر و ب ڤی ڕەنگی ئیمپراتۆریا ڕۆمانی ب تەمامی کەفتە بن دەستهەلاتا وی.

هەرچەندە تانوکە ب دروستاهی یا ئاشکەرا نینە کەنگی ئیمپراتۆریا ڕۆمانی هاتیە گوهۆرین بۆ سەر ئاینێ مەسیحیەتێ[1]، پشتی قۆستەنتینی باوەریێ ب ئاینێ مەسیحیەتێ ئینای بریار هاتەدان ببیتە ئاینێ فەرمی یێ وەلاتی و هوسا کەسێن مەسیحی ژی شیان دووبارە مالێ و ملك و مافێن خۆ ب زڤڕینن یێن کو بەری هینگێ ژ وان هاتینە ستاندن.

توندڕەویا ڤی ئیمپراتۆری ژبۆ ئاینێ مەسیحیەتێ بوو ئەگەر هەر ل دەستپێکا دەستهەلاتا خۆ دژی جوهیان ب ڕاوەستیت و نەخۆشی و تەعدایێ لێ بکەت و کاریگەریا ڤێ چەندێ بۆ ماوێ چەندین چاخان ل ئەورۆپا ڤەکێشا.

هەرچەندە قۆستەنتینی ل دەستپێکی بریار نەدا کو مەسیحیەت ببیتە ئاینێ فەرمی ل وەلاتی بەلکو وی پشتەڤانیا بەلاڤکرنا ڤی ئاینی کر هەتا کو هژمارەکا مەزن یا خەلکی ب دویف کەفتین و هێدی هێدی چوویە دناڤ دامودەزگەهێن میری دا، ژبەر هندێ ژی ل سەردەمێ وی دێر بوو خودانا دەستهەلاتەکا مەزن و مافێن زێدە هەبوون. ل سەردەمێ وی چەندین دێرێن ب ناڤودەنگ هاتنە ئاڤاکرن وەك دێرا "ئەلمەهەد" ل باژێرێ بەیت لەحم ل فلەستینێ و دێرا "قیامە" ل باژێرێ قودسێ.

قۆستەنتین ئێکەم ئیمپراتۆرێ مەسیحی بوو ل وەلاتێ ڕۆما و ئەڤ چەندە بوو وی بەسە کو ناڤێ وی دگەل لیستا کاریگەرترین مرۆڤ د دیروکێ دا بهێتە دانان، لێ دگەل هندێ ژی وی چەندین کارێن دی یێن مەزن ئەنجامدابوون وەك دووبارە ئاڤاکرن و بەرفرەهکرنا باژێرێ بیزەنتی یێ کەڤن و ل دویڤدا ب ناڤێ وی هاتە ناڤکرن ب قۆستەنتینیە[1] و بۆ پایتەختێ ئیمپراتۆریا ڕۆمانی هەتا سالا 1453 و ل دووڤدا ژبۆ ماوێ چەندین چاخان بوو پایتەختێ ئیمپراتۆریا عوسمانیان.

قۆستەنتینێ مەزن ڕۆلەکێ بەرچاڤ هەبوو د دیروکا دێرێ دا، ژبەرکو ئەو شیا مایێ خۆ د وێ هەڤڕکیا مەزن یا دناڤبەرا دوو دویفکەفتیێن دێرێ دا بکەت ئەوژی "ئاریوس" و "ئیسناسیوس" بوون، لەوڕا ل سالا 325 زاینی قۆستەنتینی کومبوونەك ل دێرێ گرێدا کو دهێتە هەژمارتن ئێکەم کومبوونا دێرێ د دیروکێ دا و د ڤێ کومبوونێ دا

[1] دیروکنڤیس وێ چەندێ دبێژن کو ل شەڤا دوماهیێ دەمێ قۆستەنتینی شەڕ دگەل هەڤڕکێ خۆ ل نێزیک رۆما دکری ل ئەسمانی خاچەك رۆهن بوو و ئەڤ گوتنە سەر بوو: ب ناڤێ خاچێ هوین دێ ب سەرکەڤن.

[1] ل سەردەمێ ئەڤرۆکە دا دهێتە نیاسین ب باژێرێ ئیستانبولێ پایتەختێ وەلاتێ تورکیا و ئێک ژ مەزنترین باژێرێ کەڤن ل جیهانێ.

ئیمپراتۆری ڕۆلەکێ مەزن گێرا و بریارێن وی بوونە ئەگەرێ دانانا ئاینێ مەسیحی یێ ئارسوزکسی.

هەردیسان ڤی ئیمپراتۆری هندەك بریارین دی یێن گرنگ دان کو بوونە ئەگەرێ پەیدابوونا چەندین کار و شولێن باش وەك نانپێژی و جوتیاری و ڕەزڤانییێ. ئەڤ کارێن وی بەرێ بنیاتێ ژیانا جڤاکی ل ئەورۆپا ل چاخێن ناڤەڕاست دانا.

ژبەر چەند ئەگەرێن نەدیار کو د دیروکێ دا نەهاتیە زانین، قۆستەنتینی ل سالا 326 زاینی هەڤژینا خۆ و کورێ خۆ یێ مەزن سێدارەدان،

دبیت هندەك پرسیار بکەن ئەگەر ئەڤ ئیمپراتۆرە نەبا مەسیحی دا چ ل ئاینێ مەسیحیەتێ هێت؟ هەلبەت ئەڤ ئیمپراتۆرە ببوو ئەگەر کو ئاینێ مەسیحیەتێ ژ ئاینەکێ کێم دویفکەفتی و نهێنی ببیتە ئاینەکێ ئاشکەرا و گەلەك بهێتە بەلاڤکرن هەتاکو بوویە ئێك ژ مەزنترین ئاینان د دیروکێ دا لەوڕا ئەگەر ئەڤ ئیمپراتۆرە نەبایە ڕەنگە ب زەحمەت کەسەکێ دی هاتبا و ئەڤ کارە کربا.

## 22. جێمس وات James Watt

## (1736ز. – 1819 ز.)

### جێمس ۋات

### داهێنەرێ ئامیرێ هەلمێ یێ بوویە ئەگەرێ پەیدابوونا شۆڕەشا پیشەسازی ل ئەوروپا

جێمس وات ئەو زانایێ ئوسکوتەلندی یە یێ کو د دیروکێ دا وەك داهێنەرێ ئامیرێ هەلمێ و ئێك ژ پێشەنگێن شۆڕەشا پیشەسازی ل ئەوروپا دهێتە نیاسین، هەر چەندە ئەو ئێکەم کەس نەبوو هزر د داهێنان ئامیرێ هەلمێ دا کری ژبەرکو گەلەك زانایێن دی ل بەری وی بزاڤێن ڤێ چەندێ کربوون و چەندین ئامیرێن دەستپێکی یێن سادە دروست کربوون ب تایبەت ژی هیرۆنێ ئەسکەندەری ل چەرخێ ئێکێ بەری زایینی.

ل سالا 1698 زانا "تۆماس ساندی" ئامیرەکێ هەلمێ داهێنا کو دهاتە ب کارئینان بۆ پالدانا ئاڤێ. هەردیسان ل سالا 1712 ژی زانایەکێ ئینگلیزی ب ناڤێ "تۆماس نیوکەر" ئامیرەکێ دی یێ هەلمێ دروستکر، لێ ئەڤ ئامیرە گەلەك د سادەبوون و شیانێن وان د سنوردار بوون کو ب تنێ ل کانیێن ڕەژیێ ژبۆ دەرخستنا ئاڤێ دهاتنە بکارئینان.

ل سالا 1764 جێمس واتی گرنگی ب پێشئێخستنا ئامیرێن هەلمێ دا ب تایبەت ل وی دەمێ بۆ ئێکەم جار ئامیرەکێ هەلمێ یێ کەڤن چاك دکری، هەرچەندە وی گەلەك ڕاهێنان ل سەر دروستکرن و چاککرنا ڤان ئامیران نەکرن لێ شیانێن وی یێن مەزن بوونە ئەگەر ئەو ئامیرەکێ هەلمێ یێ گەلەك باش دروست بکەت تا وی ڕادەی ناسناڤێ داهێنەرێ ڕاستەقینە یێ ئامیرێ هەلمێ پێ بهێتەدان.

ئێکەم گوهۆرینا واتی ل سەر ئامیرێن هەلمێ کری ئەوبوو دەمێ جهەکێ نوو ل سەر زێدەکری ژبۆ هینکرنێ یانژی تەزیکرنێ، هەردیسان وی هندەك لوولەك ژی ل سەر زێدەکرن، و ل سالا 1772 وی ئامیرەکێ دی چێکر کو دگەل ڤان تایبەتمەندیان دشیا ئوتوماتیکی ب کارێ گڤاشتن و پالدانێ ژی ڕابیت..

پشتی چەندین گوهۆرینێن دی، ئێدی شیانێن ئامیرێن هەلمێ گەلەك زێدەبوون و دگەل بواران دا هاتە ب کارئینان. ژلایەکێ دییە وات شیا ئەو ئامیرێن هەلمێ یێن وی دروستکرتن گوهۆرینەکا دیژی تێدا بکەت ئەوژی کو بشێت ب شێوەیەکێ بازنەیی ل دور خۆ بزڤرن، و بڤێ چەندێ مفایێن ڤان ئامیران پتر لێ هاتن ب تایبەت پشتی شیایی ئامیرەکێ دی یێ بچووك دروست بکەت کو بشێت کونترۆلێ ل سەر کارکرنا ئامیرێن هەلمێ بکەت.

وات بازرگانەکێ زیرەك نەبوو، ل سالا 1775 شیا کومپانیەکێ دگەل ئەندازیارەکی و هژمارەکا کرێکاران ڤەکەت و ل سالا ل دویڤدا کومپانیا وان شیا هژمارەکا مەزن یا ڤان ئامیرێن هەلمێ بەرهەم بینیت و هوسا ئەو و هەڤپشکێ خۆ بوونە دوو کەسێن گەلەك دەولەمەند.

نابیت ئەم رۆلێ ئامیرێن هەلمێ د پێشئێخستنا شۆرەشا پیشەسازی دا بکەین ژبەرکو ئەڤ شۆرەشە ببوو ئەگەرێ پەیدبوونا چەندین داهێنانێن دی. هەرچەندە بەری داهێنانا ڤی ئامیرەی چەندین داهێنانێن دی دەست دگەل پێشئێخستنا شۆرەشا پیشەسازی هبەوو لێ رۆلێ ئامیرێ هەلمێ ژ هەمیان مەزنتر و بەرچاڤتر بوو ژبەرکو بوو ئەگەرێ بەرهەم ئینانا تێهنەکا مەزنتر ژبۆ کومپانیان،

ناهێتە ڤەشارتن کو راوەستاندنا فرێکرنا پەترۆلێ بۆ وەلاتێن رۆژئاڤایی ل شەرێ ئوکتوبەرا سالا 1973 وەلاتێن رۆژئاڤای هەست ب مەترسیا کێمبوونا تێهنی ب شێوەیەکێ ژ نیشکەکێڤە کر و ئەڤ چەندەژی بوو ئەگەر ئەو هزرا خو د هندەك ژێدەرێن دی یێن تێهنێ دا بکەن، ئاها ل ڤێرێ ب دروستاهی رۆلێ داهێنانا واتی ل سەر شۆرەشا پیشەسازی بومە خویا دبیت.

هێدی هێدی رۆلێ ئامیرێ هەلمێ د چەندین بوارێن دیدا دیاربوو، ب تایبەت ژبۆ پالدانا هندەك بەلەمێن بچووك، ل سالا 1804 "ریچارد تریفیك" شیا ئێکەم شەمەندەفەرا بازرگانی کو ب ئامیرێ هەلمێ کاربکەت دروستکر، لێ ل وی دەمی ڤان داهێنانان ژلایێ بازرگانیڤە چ پێشکەفتن ب خۆڤە نەدیت هەتا چەندین سالان پشتی هینگێ ژ نوو پاپۆر و شەمەندەفەرێن ب هەلمێ کاردکری هاتنە دروستکرن و هوسا شۆرەشەك ل سەر ئەردی و ئێك ل سەر ئاڤێ دەستپێکر.

ئێك ژ سوپرایزێن سەیر ئەوبوو کو شۆڕەشا پیشەسازی یا هەدەم بوو دگەل شۆڕەشا ئەمریکی و شۆڕەشا فرەنسی.

هەرچەندە ل وی دەمی رۆلێ شۆڕەشا پیشەسازی هند یێ بەرچاڤ نەبوو و کەسێ هەست پێ نەدکر لێ ل سەردەمێ ئەڤروکە ب رۆهن وئاشکەرایی ئەم هەست ب هندێ دکەین کا چەوا ڤێ شۆڕەشێ کاریگەری ل سەر هەمی لایەنێن ژیانا مرڤی هەبوویە پتر ژ شۆڕەشێن سەربەخۆبوونێ یێن ل فرەنسا و ئەمریکا، ژبەر ڤێ چەندێ ژی مە جێمس وات هەلبژارتیە وەك ئێك ژ کاریگەترین مرۆڤ د دیروکێ دا.

## 23. مایکل فاڕادای Michael Faraday

## (1791ز ـ 1868ز)

### مایکل فاڕادای

### ئەو زانایێ ئێکەم ئامیرێ بەرهەم ئینانا کارەبێ دروستکری

ئەڤ سەردەمە ب سەردەمێ کارەبێ دهێتە نیاسین. ڕەنگە هندەك کەس هەبن کو ڤی سەردەمی ب سەردەمێ بۆمبێن ناڤۆکی یانژی سەردەمێ گەشتێن ئەسمانی ناڤ بکەن، چەکی ناڤۆکی و پاپۆر و گەشتێن ئەسمانی، ئەگەر گرنگیا وان چەند یا مەزن بیت لێ کارتێکرنەکا سنوردار ل سەر ژیانا مە یا ڕۆژانە کریە، بەروڤاژی مفایێن کارەبێ و کارتێکرنا وێ ژبۆ سەر ژیانا مە یا ڕۆژانە چ سنور نینن لەوڕا ژی ئەگەر ئەڤ داهێنانە نەبایە نوکە پتریا ئامیرێن بووینە ئەگەرێ پێشکەفتنا شارستانیا مرۆڤایەتیێ ژ کارکەفتبان یانژی هەر نەهاتبانە دروستکرن، ژبەر ڤێ چەندێ دێ باشتر بیت ئەگەر ئەم ڤی سەردەمی ب سەردەمێ کارەبێ ناڤ بکەین.

هەر ژ سەردەمێن بەرێ وەرە گەلەك زانایان بزاڤێن مەزن ئەنجامداینە ژ پێخەمەت هندێ بشێن کارەبێ ب شێوەیەکێ ب سانەهی ب کاربینن و کونترۆلێ ل سەر بکارئینانا وێ بکەن وەك زانا "شارل ئوگوستین"، "دی کۆلۆمب"، "کۆنت ئەلساندرو فۆلتا"، "هانس کریستیان ئێرستد" و "ئەندرێ ماری ئەمپێر"، لێ ب تنێ دوو زانایێن بریتانی شیان ب شێوەیەکێ سەرکەفتی کارەبێ دروستبکەن ئەوژی مایکل فاڕادای و جێمس کلارك ماکسوێل بوون.

هەرچەندە کارێن ڤان هەردوو زانایان تەمامکەرێن ئێك و دوونە، لێ یا سەیر ئەوە کو کەسێ ژ وان هاریکاریا یێ دی نەدکر و ئاگەهـ ژ کارێن ئێکودوو نەبوو بەلکو هەر ئێکی ژلایێ خۆڤە و ب تنێ کاردکر، ژبەر هندێ ئەڤ هەردوو زانایە ژ هەژینە بهێنەدانان د ڤێ ڕێزبەندێ دا ژ لیستا کاریگەرترین مرۆڤ د دیروکێ دا.

مایکل فاڕادای ل سالا 1791 ل وەلاتێ ئینگلتەرا ژ خێزانەکا هەژار و دەستکورت ژ دایکبوویە، ژبەر هەژارییێ وی دەلیڤە نەبوو بچیتە خۆاندگەهێ لەوڕا وی ب خۆ خۆ فێری خۆاندن و نڤێسینێ کریە، دەمێ ژییێ وی 14 سالێ ل دوکانەکا بەرگکرنا پەرتووکان کاردکر و ڤێ چەندێ پتر دەلیڤە ژبۆ وی پەیداکر پەرتووکان بخوینیت و خۆ فێری خۆاندنێ بکەت.

دەمێ ژییێ وی گەهشتیە 20 سالان شیا هەڤنیاسینێ دگەل هندەك زانایێن مەزن یێن وی سەدەمی پەیدابکەت و بەردەوام گوهێ خۆ ددا وانەیێن وان یێن زانستی، ب تایبەت وانەیێن زانایێ بریتانی "هومفری دافی"، پشتی هینگێ دەلیڤە ژبۆ فاڕادای پەیدابوو وەك هاریکار دگەل زانا هومفری کاربکەت و پشتی هینگێ ب چەندین سالان فاڕادای شیا بگەهیتە ئێکەم داهێنانا خۆ یا تایبەت.

هەرچەندە فاڕادای چ پێزانینێن مەزن و بەکگڕاوەندەکێ باش ل سەر بیرکارییێ نەبوو، لێ وەك کەسەکێ سەرکەفتی و خۆدان شیان تاقیکرنێن خۆ یێن فیزیایی ئەنجامددان.

ئێکەم داهێنانا فاڕادای ل سالا 1821 بوو، بەری ڤێ مێژوویێ ب دوو سالان زانا ئورستیدی ئەو چەندە ئاشکەرا کربوو کو هەکە تەزوویەکێ کارەبێ ژ وائیرەکا لبەر دەرزیکا قیبلەنمایەکا[1] موگناتیسی یا ئاسایی ڕا بوریت دێ بیتە ئەگەرێ زڤڕاندن و لادانا وێ دەرزیکێ، بۆ فاڕادای ژ ڤێ چەندێ دیاربوو کو هەکە ئەو وی بوارێ موگناتیسی جێگیر بکەت دێ بیتە ئەگەرێ لڤاندنا وێ وائیرا کارەبێ.

ب پشت بەستن ل سەر ڤێ تیورێ، فاڕادای شیا ئێکەمین ئامیرە دروستبکەت کو وائیرا کارەبێ بەردەوام تێدا د لڤلڤیت ئەوژی دەمێ تەزوویەکێ کارەبایی ل نێزیك وی بوارێ موگناتیسی ڕا بوریت، ئەڤ ئامیرە دهێتە هژمارتن ئێکەم ماتۆرێ کارەبایی.

ڕاستە کو ئەو ماتۆرێن کارەبایی یێن ل سەردەمێ ئەڤروکە دهێنە ب کارئینان گەلەك د پێشکەفتی و ئالۆزن و هژمارەکا گوهۆرینان ل سەر هاتینەکرن، لێ ئەو ئامیرێ دەستپێکی یێ فاڕادای دروستکری، بەرێ بنیاتێ هەمی ماتۆرێن کارەبایی یە. پشتی هینگێ

---

[1] قیبلەنما Compass ئامیرەکە دهێتە ب کارئینان ژبۆ دیارکرنا ئاڕاستەیان، ب شێوەیەکێ گشتی ئاڕاستێ میلێ ڤی ئامیرەی بەرەڤ جەمسەرێ باکوریە و پشت بەستنێ دکەتە سەر بوارێ موگناتیسی یێ عەری.

زانا فارِادی هزرا هندێ کر کو پێدڤیه ئەو ل ڕێکەکێ بگەریت ژبۆ بەرهەمئینانا کارەبێ ب هاریکاریا ب کارئینانا بوارەکێ موگناتیسی.

فارِادی بەردەوام تاقیکرنێن خۆ ل سەر بوارێ موگناتیسی ئەنجامدان و تیبینیێن خۆ د نڤیسان هەتا ل سالا 1831 تاقیکرنەکا دی ئەنجامدای و بوویه ئەگەرێ دانانا پرەنسیپێن کارەبا موگناتیسی یان کارۆموگناتیسی کو دهێته نیاسین ب "یاسایا فارِادای"[1] و ئەڤ چەندەژی مەزنترین دەستکەفت بوو د ژیانا وی دا، ئەو تیبینی یێن فارِادای ل دەمێ ئەنجامدانا تاقیکرنان ل دەف خۆ نڤیسابن و ئەو یاسایێن وی دانابن بوونه ئەگەر ئێکەم دینەمویێ کارەبایی دروست بکەت.

هەرچەندە ئەو ئامیرێن بەرهەم ئینانا کارەبێ یێن ل سەردەمێ ئەڤروکه دهێنه ب کارئینان تا ڕادەیەکی نەوەکی وی دینەمویێ کارەبێ نه یێ فارِادای دروستکری، لێ ئەگەر ئەو دینەمو نەبایه ڕەنگه ئەو ئامیرێن ئەڤروکەژی نەهاتبانه دروستکرن، هەردیسان ئەڤ دینەمویه بوویه ئەگەر چەندین داهێنانێن دی یێن سەردەم پەیدابن و پرەنسیپێن زانستێن بیرکاری و فیزیایێ بهێنەدانان، لەورا ژی ئەم دشێن بێژین کو ئەو دەستکەفتێن هەره مەزن یێن فارِادای بدەستڤه ئینایین نه ب تنێ بوونه ئەگەرێ داهێنانا دینەمویێن پەیداکرنا کارەبێ بەلکو هاریکاریا زانایان کرینه چەندین داهێنانێن دی یێن زانستی پەیدا بکەن.

فارِادای نەك تنێ زانایەکێ سەرکەفتی بوون بەلکو کەسەکێ جوان و سەرنجراکێش و ماموستایەکێ خۆشتڤی ژی بوو، د هەمان دەمدا کەسەکێ گەلەك سادە و ڤەکری بوو ژبەرکو وی گرنگی نەددا پارە و ناڤودەنگی و ناسناڤێن زانستی. بەلگە ل سەر ڤێ چەندێ ژی وی پێدانا ناسناڤێ سیارچاکییێ[1] ڕەتکر، هەردیسان وی ڕەتکر ببیتە سەرۆکێ کۆمەلا شاهانه یا بەریتانی.

فارِادای ژیانەکا بەختەوەر دگەل هەڤژینا خۆ بوراند لێ وی چ زاروك نەبوون، ل سالا 1867 ل دەڤەرەکا نێزیکی باژێرێ لەندەن وەغەرکر.

---

[1] یاسایا فارِادای دهێته هەژمارتن بنەمایێ دیاردا کارۆموگناتیسی کو دیاردکەت کا چەوا بوارەکێ کارەبایی دێ کارلێکێ دگەل بازنەیەکا کارەبایی کەت ژ پێخەمەت بەرهەمئینانا هێزەکا پالدانا موگناتیسی.

[1] ناسناڤێ سیارچاکییێ Knighthood بلندترین ناسناڤێ شانازیێ یه دهێتەدان بۆ وان کەسێن داهێنانەکا زانستی یا مەزن ئەنجام دابیت

## 24. جێمس کلارک ماکسوێل James Clerk Maxwell

## (1831ز. – 1879ز.)

### جێمس کلارک ماکسوێل

### ئەڤ زانایێ پەیوەندیا دناڤبەرا پێلێن کارەبایی و موگناتیسی دا ئاشکەراکری

جێمس کلارک ماکسوێل ل سالا 1831 ل باژێرێ "ئەدەنبەرا" ل وەلاتێ ئوسکوتلەندا ژدایکبوویە، دەمێ گەهشتیە ژیێ 15 سالیێ ڤەکۆلینەك پێشکێشی زانکۆیا شاهانە ل ئەدەنبەرێ کر و پاشی ل زانکۆیا کامبریج هاتە وەرگرتن و دەست ب خواندنێ کر، ماکسوێل دهێتە هەژمارتن مەزنترین زانایێن فیزیایی دناڤبەرا ماوێ دەرکەفتنا نیوتن و ئەنیشتاینی دا.

زانایێ بریتانی ماکسوێل ل وی دەمی بناڤودەنگ کەفت پشتی کو شیایی چوار یاسایێن گرنگ دناڤبەرا کارەبێ و موگناتیسی دا بدانیت.

هەرچەندە بەری هاتنا ماکسوێلی ب چەندین سالان، زانایان گەلەك ڤەکۆلین ل سەر بوارێن کارەبێ و موگناتیسی دا کربوون، هەردیسان زانا شیابوون گەلەك ڕاستی و نهێنیان ئاشکەرا بکەن و یاسایێن گرنگ بدانن، لێ ماکسوێل زانایێ ئێکانەبوو شیایی یاسایەکا گشتی بدانیت کو دەربڕینێ ژ پەیوەندیا دناڤبەرا بوارێ کارەبێ و موگناتیسی دا بکەت، و ب ڤێ چەندێ ئەم دشێین کارو بەرهنگاریا دناڤبەرا ڤان هەردوو بواراندا ب تیورەکا سادە دەستنیشان بکەین.

ئێك ژ گرنگترین ساخلەتێن هاوکێشەیێن ماکسوێلی داناین ئەوبوو کو د گشتی بوون و هەمی لایەنان بخۆڤە دگرن، ئانکو ئەم دشێین بێژین کو گەلەك هاوکێشە و تیبینیێن دی دکەڤنە بن هاوکێشەیا وی، ب هاریکاریا ڤان هاوکێشە و یاسایان زانا شیان لەرەلەرێن کارەبایی یێن موگناتیسی ب سانەهی شرۆڤە بکەن، ئانکو پێلێن کاروموگناتیسی بەردەوام

بەربەلاڤ دبن هەتا دگەهنە ڕێگرەکێ کەرەستی یان تشەك دکەڤیتە د ڕێکا واندا و ڤان پێلان دشکێنیت.

ماکسوێل شیا وێ چەندێ دیار بکەت کو لەزاتیا پێلێن کارۆموگناتیسی دگەهیتە 300 هزار کیلومەتران د چرکەکێ دا (186 هزار میلان د چرکەکێ دا)، ئانکو هندی لەزاتیا ڕۆناهیێ، هەر ژبەر ڤێ چەندێ زانا شیان بگەهنە وی ئەنجامی کو دناڤ ڕۆناهیێ ب خۆدا پێلێن کارۆموگناتیسی یێن هەین و پشتی هینگێ ئەڤ ڕاستیە ب بەلگە هاتە پشتڕاست کرن.

هاوکێشەیێن ماکسوێلی نە ب تنێ بوونە بنیات ژبۆ بوارێ کارەبێ و موگناتیسی، بەلکو بوونە بنیات بۆ زانستی ئۆپتیکی[1] و هەمی یاسیایێن ڤی زانستی ب سانەهی ئەم دشێن ژ هاوکێشەیێن ماکسوێلی یێن بناڤوندەك وەربگرین. هەردیسان ماکسوێل پێشبینیا هەبوونا هندەك پێلێن دی یێن موگناتیسی کر کو ژلایێ درێژاهیا پێلێ و لەرەلەرێڤە یا جوودایە ژ پێلێن کارەبایی و پشتی هینگێ زانایێ مەزن "هیرنس هرتس" شیا ڕاستیا هەبوون ڤان پێلێن نەبینراو ب سەلمینیت و پێشبینیا ماکسوێلی ڕاست دەرکەفت.

پشتی هینگێ زانا "مارکۆنی" شیا ڤان پێلێن نەبینراو د ئامیرێن گەهاندنێ یێن وایەرلێسی دا بکاربینیت ئانکو ئەو ئامیرەیێن گەهاندنێ یێن بێ تێل کاردکەن ب تایبەت ئامیرێ ڕادیویێ، هەردیسان هەمان پێل دهێنە ب کارئینان ژبۆ بەلاڤکرنا پەخشێ تێلەڤزیونێ. هەمی جورێن تیشکێن ئێکس و گاما و تیشکێن بن سۆری و سەر موری دا هندەك نموونەیێن تیشکێن کارۆموگناتیسنی نە و زانا شیان ب هاریکاریا هاوکێشەیێن ماکسوێلی ڤەکۆلینان ل سەر ڤان تیشکان ژی بکەن.

کارێن ماکسوێلی ڕۆلەکێ گرنگ د پێشئێخستنا چەندین زانستێن دیژی دا هەبوو ب تایبەت زانستێن فەلەکی و دینامیکی و تیورا لڤینا فرۆکەیان، هەردیسان ماکسوێل شیا بگەهیتە وی ئەنجامی کو گەردێن گازان ب ئێك لەزاتی نالڤلڤن بەلکو هندەك گەرد ژ هندەکا بلەزتر یان هێدیتر د لڤلڤن، هندەك ژی ب لەزاتیەکا گەلەك مەزن د لڤلڤن، ب ڤێ چەندێ ئەو شیا یاسایا لڤینا گەردێن گازان د پلەیەکا گەرماتیێ یا دەست نیشانکری دا ب دانیت.

---

[1] ئۆپتیك Optic لقەکێ زانستێ فیزیایێ یە کو گرنگیێ ددەتە خواندنا تایبەتمەندیێن ڕۆناهیێ.

لێ ژ نیشکەکیڤە بەری چەند ڕوژەکێن کێم کو بگەهیتە ژیێ 48 سالیێ، وەغەرا دوماهیی کر ئەوژی پشتی تووشی نەخۆشیا پەنجەشێرێ بووی

## 25. مارتن لوتەر Martin Luther

## (1483ز. – 1546ز.)

### مارتن لوتەر

### ئەو ڤەشەیێ ڕێبازا پرۆتستانی دناڤ ئاینێ مەسیحان دا دانای

مارتن لوتەر خودانێ بیروکەیا پرۆتستانتی، ئەو کەس بوو یێ هەڤڕکیا دێرا کاسولیکی یا ڕۆمانی کری، ژبەرکو وی بەردەوام گازندە ژ دێرێ دکرن و خۆ ژێ نەڕازی دکر. مارتن ل سالا 1843 ل باژێرێ "ئیسلیبین" ل ئەلمانیا ژدایکبوویە، بابێ وی گەلەك پشتەڤانیا وی کر بچیتە زانکۆیێ و یاسایێ بخوینیت، لێ پشتی هینگێ باوەرناما دکتورایێ د ئاینزانییێ دا ب تایبەت ئاینێ مەسیحیان ل زانکۆیا "فیتبرگ" بدەستخوڤە ئینا و پاشی ل وێرێ وەك ماموستا کارکر.

گازندە و نەڕازیبوونا وی ل سەر دێرێ ب شێوەیەکێ هەڕەمەکی و هێدی هێدی دەستپێکرن، ل سالا 1510 چوو ڕۆما، ژبەر وان دیمەنێن وی ب چاڤێن خو دیتین تووشی مەندەهوشی و سوپرایزەکا مەزن بوو ژبەر سەروبەرێ زەلامێن ئاینی ل وێرێ، لێ تشتێ پتر ئەو مەندوهش کری ئەو بازرگانی بوو یان زەلامێن ئاینی ل ناڤ دێرێ بەحس دکری ئەوژی "بازگانیا سەکێن گونەهژێبرنێ". ب ڕاستی تشەکێ سەیربوو چەوا ل جهەکێ وەکی کەنیسی بەهەشت دهێتە فروتن، هەردیسان چەوا سەکێن ژێبرنا گونەها و ڕزگارکرنا مرۆڤان ژ ئاگری دۆزەخێ بەرامبەر برەکا پارەی دهێنەدان.

ل هەیڤا ئوکتوبەرا سالا 1517 بەیانامەکا نەڕازیبوونێ ل سەر دەرگەهێ دێرا باژێرێ فیتبرگێ دانا، ل دویڤدا 95 بەلگەنامێن دی یێن نەڕازیبوونێ یێن هەڤشێوە هاتنە هنارتن بۆ دێرا باژێرێ ڕۆما. ل دویڤدا مارتنی ئەڤ پێلا نەڕازیبوونا خۆ هێدی هێدی بەرفرەه و ڕۆژ بۆ ڕۆژێ خەلك پتر دهاتە پشتا وی هەتا وی ڕادەی ئێدی خەلکی ل هەمی باژێران خۆ ژ ڤان ڕەفتارێن دێرێ نەڕازیکر.

پشتی هینگێ پێلێن نەڕازیبوونا باژێرێ ڕۆما گەهشتنە دێرا "لوتەر" و ل دویڤدا بەرفرەهتر لێهاتن هەتا گەهشتینە دەف "سۆلتان پاپا"ی و جڤاکێ پاپایان. مارتنی بۆ وان دیارکر کو نابیت مرۆڤ خۆ بۆ کەسێ ب چەمینیت ب تنێ خۆدانێ پەرتووکا پیروز نەبیت، لێ دێرێ ژبەر ڤان نەڕازیبونێن وی خۆ بێدەنگ نەکر بەلکو ل دژی وی ڕاوەستیان و ب گونەها ژ دەرکەفتنا دینی و گاوربوونێ تومەتبار کر و بریار دا هەمی پەرتووکێن وی بهێنە سووتن.

مارتن ل وی دەمی د گوپیتکا چالاکی و بزاڤێن خۆدا بوو دژی بریارێن دێرێ، وی گەلەگ پەرتووك و بەیانامە بەلاڤکرن و گەهاندنە هەمی جهان، مەزنترین کارێ وی ئەوبوو دەمێ پەرتووکا پیرۆز وەرگێرایە سەر زمانێ ئەلمانی، ب هاریکاریا ڤێ چەندێ ئێدی بوو خەلکی ب سانەهی کەفت پەرتووکا پیرۆز بخوینن بێی کو پشت بەستنێ بکەنە سەر کاهنێن دێرێ، هەردیسان جوانیا دەڕبرینێن مارتنی کاریگەری ل سەر ئەدەبێ ئەلمانی یێ هەڤچەرخ کر.

مارتنی بۆ هندێ بەرەڤانیێ ژ نەڕازیبوونێن خۆ بکەت، مفا ژ بوچوونێن قەشە بۆلسی وەرگرتن دەمێ گوتی: مرۆڤ بەردەوام شاشی و گونەهان دکەت لێ ئەنجامدانا کارێن باش نابیتە ئەگەرێ ژێبرنا وان گونەهان بەلکو باوەریا مرۆڤی ب خودێ ب تنێ دشێت مرۆڤی پاقژ بکەت و گونەهێن وی ژێببەت ئانکو ڕازیبوونا خۆ ب تنێ دشێت مرۆڤی ژ گونەها ب پارێزیت، ژبەر ڤێ چەندێ ئەو دژی بریارێن دێرا ڕۆما ڕاوەستیا ب تایبەت دەمێ وان سەکێن گونەهژێبرنێ فروتینە خەلکی، هەلبەت ئەڤ کارە دژی ڕێنماییێن ئاینی یە و کارەکێ گونەهە ژبەرکو نە دێرێ و نە مرۆڤان ماف نینە ببنە ناڤەند دناڤبەرا خودێ و مرۆڤی دا بەلکو پەیوەندیا مرۆڤی دگەل خودێ یا ڕاستەوخۆیە پێدڤی ب چ ناڤبران ناکەت.

هەردیسان مارتنی ئەو چەندە ڕەتکر کو قەشە ب درێژاهیا ژیانا خۆ بمینیت زگورد و ژیانا هەڤژینیێ پێکنەئینیت، لەوڕا وی ل سالا 1525 ڕەبەنەکا دێرێ بۆ خۆ خواست و شەش زاروك ژێ هەبوون. مارتن ل سالا 1546 د سەرەدانەکێ دا ژبۆ وی باژێرێ لێ ژدایکبووی وەغەر کر.

مارتن ئێکەم کەس نەبوو دژی بریارێن دێرا ڕۆمانی ب ڕاوەستیت بەلکو ل بەر وی گەلەك کەسێن دیژی بزاڤێن بڤی ڕەنگی کربوون ب تایبەت قەشە "هویان هوس" ل

ویلایەتا "بوهیمیا". هەردیسان بەری وی ڤەکۆلەرێ ئینگلیزی "جۆن وایکلیف"ی ژی ل چەرخێ 14 ئەڤ بزاڤە کربوون، هەردیسان زانایێ فرەنسی "بیرفالدو" ئەوێ ل چەرخێ 12 زاینی ژیای، ئێك بوو ژ کەسێن دەستپێکێ یێن ئەڤ نەڕازیبوونە گەهاندینە دێرا ڕۆمانی.

لێ پێلا نەڕازیبوونا ڤام کەسان گەلەك مەزن نەبوون و ژ سنورێن ناڤخۆیی دەرنەکەفتن. ل سالا 1517 نەڕازیبوون ل سەر دێرا ڕۆمانی گەلەك مەزنتر لێهاتن و هەمی بوار ب خۆڤە گرتن و خەلك دژی هەر تشتەکێ کەڤن و کلاسیکی ڕاوەستیان، ژبەر ڤێ چەندێ ئەم دشێن بێژین کو مارتنی ماف هەیە ببیتە کەسێ هەرە مەزن یێ دەرگەهێ چاکسازیێ ل هەمبەر هزرا ئەورۆپیان ڤەکری.

ژ کاریگەرییێن نەڕازیبوونێن مارتنی دژی دێرێ ئەوبوون کو پشتی هینگێ هندەك شەڕێن ئاینی ل ئەورۆپا پەیدابوون، ژ وان شەڕان ژی شەڕێ 30 سالی ل ئەڵمانیا کو هەر ژ سالا 1618 هەتا 1648 زاینی ڤەکێشا، هەلبەت ئەڤ شەرە هەمی گەلەك د مەزن و خویناوی بوون، زێدەباری پەیدابوونا چەندین هەڤڕکیێن سیاسی یێن دژوار دناڤبەرا کاسولیك و پرۆتستانتاندا کو ڕولەکێ گرنگ و مەترسیدار ل سەر دروستبوونا سیاسەتا ئەورۆپی ب درێژاهیا چەرخێن بوری هەبوو.

د هەمان دەمدا ڤان چاکسازیان کاریگەریەکا مەزن ل سەر پێشڤەچوونا هزری ل ئەورۆپا ڕۆژئاڤای هەبوو، بەری سالا 1517 ب تنێ دێرەکا دەستهەلاتدار و بریاردەر هەبوو ئەوژی دێرا کاسولیکی بوو، لێ هەرکەسێ خۆ ژێ نەڕازیکربا دا ب کەسەکێ گاور و خڕاب هێتە ل قەلەمدان, لێ پشتی وێ چاکسازیا ب هاریکاریا مارتنی هاتیە پێش و پشتی کو گەلەك وەلاتان ئازادیا ئاینی دایە خەلکێ خۆ، ئێدی چ ترس ل سەر لێزڤڕینا هزروبیر و تیورێن کەڤن نەما ئانکو مرۆڤ ئێدی یێ ئازادبوو بەحسێ هەرتشتەکی بکەت خۆ هەکە د چ بواردا بیت.

تشتێ سەرنجڕاکێش ئەوە پتریا ئەو کەسێن مە ناڤێ وان دناڤ ڤێ لیستێ دا داناین ژ وەلاتێ برِیتانیا و پاشی ئەڵمانیا بوون، ئانکو پتریا ڤان کەسان ئەوبوون یێن ل سەر ئاینێ پرۆتستانتی ل باکورێ ئەورۆپا و ئەمریکا، لێ ب تنێ دوو کەسێن ڤان وەلاتان ل بەری سالا 1517 ژیابوون ئەوژی شاه چارلیمان و گوتەنبەرگ بوون.

لێ بەری سالا 1517، کەسێن نەمر یێن دناڤ ڤێ پەرتووکێ دا ل وەلاتێن دی یێن جیهانێ بوون، لێ وەلاتێن پرۆتستانی لێ بەلاڤبووی کاریگەریا مەزن ل سەر شارستانیا مرۆڤان کریە ب تایبەت د ماوێ هەردوو چەرخێن بوریدا.

ڕێبازا پرۆتستانی ب خۆ نەیا میانڕەوبوو، بەلکو دەمارگیریا وێ ببوو ئەگەرێ پەیدابوونا چەندین شەڕێن خویناوی ب تایبەت ل ئەلمانیا، ئەڤ شەڕە گەلەك دژواتر بوون ژ وان شەڕێن ل وەلاتێ بریتانیا ڕویداین.

مارتن دهێتە هەژمارتن مەزنترین دوژمنێ جوهیان، تا وی ڕادەی ئەم دشێن بێژین ئەو "بابێ نازیان" بوون یێن کو هژمارەکا مەزن یا جوهیان ل چەرخێ بیستێ سووتین و کوشتین.

هەردیسان شۆڕەشا نەڕازیبوونا مارتنی دژی دێرا کاسولیکی ب تنێ نەبوو بەلکو شۆڕەشەکا نەتەوەیی ژی بوو چونکی شۆڕەشا وی خەلکێ خەلك هاتە گوهۆرین و ئێدی وەلاتێ ئیتالیا و دێرا ڕۆمانیان نەشیا کونترۆلێ ل سەر وەلاتی ئەلمانیا بکەت، ژبەر ڤێ چەندێ خەلکێ ئەلمانی ب چاڤەکێ مەزن تەماشەی فەلسەفەیا مارتنی دکەن.

دبیت هندەك کەس بێژن مادەم ڕۆلێ مارتنی هندە یێ کاریگەر بوو ئەرێ پا بوچی ناڤێ وی ل جهەکێ نێزیکتر یێ لیستا 100 کاریگەرترین مرۆڤ د دیروکێ دا نەهاتیە دانان؟

ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤڕیت کو دبیت شۆڕەشا مارتنی ژبۆ وەلاتێن ئەوروپا و ئەمریکا یا گرنگ بیت، لێ ڤێ شۆڕەشێ چ گرنگیا خۆ ل وەلاتێن کێشوەرێن دی نەبوو ب تایبەت ئەو وەلاتێن ئاینێ مەسیحیەتێ لێ نەی و دەف وان یا گرنگ نەبوو کا خەلکێ مەسیحی ل وەلاتێن دی ل سەر چ ڕێبازا ئاینی نە، هەروەکی کا چەوا نوکە بۆ خەلکێ یابانی، چینی یان هندیان نەیا گرنگ بیت کا موسلمان ل سەر ڕێبازا شیعی یان سنی نە.

## 26. جۆرج واشنتۆن George Washington

## (1732ز-1799ز)

### جۆرج واشنتۆن

### ئێکەم سەروکێ ویلایەتێن ئێکگرتی یێن ئەمریکا

جۆرج واشنتۆن ل سالا 1732 ل باژێرێ ڤیرجینیا ژدایکبوویە و کورێ کەسەکێ دەولەمەند بوو کو چەندین زەڤیێن عەردی و چاندنێ هەبوون. دەمێ گەهشتیە ژیێ 20 سالیێ هژمارەکا مەزن یا پارچەیێن عەردی وەك میرات بۆ وی مان و ل سالا 1753 هەتا 1758 گەهشتە ڕێزێن لەشکەری و بەشداری د شەڕێ فرەنسا و هندێ دا کر.

دناڤ لەشکەری دا زانینەکا باش دەربارەی کاروبارێن لەشکەری ژبۆ وی پەیدابوو و پلەیەکا بلند وەرگرت. ل دوماهیا سالا 1758 ڤەگەریا ویلایەتا ڤیرجینیا و بۆ خۆ بیژنەکا دەولەمەند ئینا کو دوو زاروك هەبوون، لێ وی ب خۆ چ زاروك نەبوون.

ژبۆ ماوێ پتر ژ 15 سالان وی کار دناڤ باخچە و زەڤیێن خۆ دکر، ل سالا 1774 هاتە هەلبژارتن وەك بریکار ل پێش ویلایەتا ڤیرجینیا ژبۆ کونگرەیەکێ نێڤدەولەتی ژبەرکو ئەو زەنگینترین کەس بوو ل وێ ویلایەتێ، هەردیسان ل سالا 1775 دوبارە بەشداری وی کونگرەی بوو. ل وێ کومبوونێ دا ب پرانیا دەنگان هاتە هەلبژارتن وەك سەرکردێ لەشکەری یێن کو شەڕ ژبۆ سەربەخۆبوونا ئەمریکا دکر.

لێ ئەگەرێ سەرەکی یێ هەلبژارتنا وی ژبۆ سەربورا وی یا لەشکەری و شەڕی د زڤڕیا زێدەباری زەنگینی و ناڤودەنگی و شیانێن وی یێن لەشی و کەسایەتیا وی یا بهێز د سەرەدەریکرن و ڕێڤەبرنێ دا، ل دەمێ شەڕی دا وی بێ بەرامبەر کاردکر و ئەڤ چەندە ببوو ئەگەر ببیتە نموونەکا مەزن ژبۆ هەمی کەسان.

لێ مەزنترین سەرکەفتنێن وی ئەوبوون یێن گولانا 1775 زاینی ب دەستڤە ئینانین دەمێ سەرکێشیا لەشکەرێ سەربەخۆبوونێ د کری، ل ئادارا 1779 ماوی وی یێ

سەرکردایەتییێ یێ خۆلا دوێ ژی ب دوماهی هات، ل هەیڤا کانینا ئێکێ ل سالا 1799 ل مالا خۆ ل "مونت فرنون" ل ویلایەتا ڤیرجینیا وەغەرکر.

جۆرج واشنتۆن دهێتە هەژمارتن ئێك ژ کەسێن کاریگەر د دیروکێ دا ژبەرکو ڕۆلێ وی یێ بەرچاڤ د دروستکرنا ویلایەتێن ئەمریکی دا یێ بەرچاڤ بوو، ئەوژی ب ڕێکا سێ کارێن هەرە مەزن:

ئێك: واشنتۆن سەرکەفتیترین سەرکردێ لەشکەری بوو د ماوێ شەڕێ سەربەرخۆبوونا ئەمریکا دا، ژبەرکو کەسەکێ زیرەك و خۆدان بەکگڕاوەندەکێ لەشکەری یێ مەزن بوو، هەردیسان سەرکردەیەکێ ڤەدەر نەبوو ژ لەشکەری ًخۆ هەروەکی هندەك سەرکردێن دی مینا ئەسکەندەرێ مەزن و یولیوس قەیسەری. هەردیسان پشکەکا هەڕە مەزن یا سەرکەفتنێن وی بۆ هندێ د زڤڕیا کو هەڤڕکێن وی ژ سەرکردێن بەڕیتانی کەسێن ئاست نزم و لاواز بوون. ئەمریکیان گەلەك هێرشێن مەزن کرنە سەر دوژمنێن خۆ، هەتا واشنتۆن ب خوژی چەندین جاران بریندار بوو لێ شیا بەرامبەر هێرشێن دوژمنی یێ خۆڕاگر بیت.

دوو: واشنتۆن سەرکردێ لیژنا دەستوری بوو، هەرچەندە هزروبیرێن  وی نەبوونە ئەگەر بۆ دانانا دەستورێ ئەمریکی لێ پشتەڤانی و بوچوونێن وی ڕۆلەکێ مەزن هەبوو ل سەر ڕازیکرنا حکومەتا وی دەمی. هەرچەندە گەلەك هەڤڕکییێن دژوار دژی دەستورێ نوو هەبوون لێ کەسایەتیا واشنتۆنی بوو ئەگەر شیا هەمی بەندێن دەستوری وەکی خۆ بهێلیت و ئەگەر ئەو نەبا هەر زوی ئەو دەستور دا هێتە ژناڤبرن.

سێ: جۆرج واشنتۆن ئیکەم سەروکێ ئەمریکا بوو، وەلاتێ ئەمریکا گەلەك یێ ب بەخت بوو کو ئێکەم سەرکردێ وان یێ ب ڤی ڕەنگی بیت.

دیروك ل ئەمریکا لاتینی و ئەفریقیا بۆمە دووپات دکەت کو وەلاتەکێ ژ نوو پەیدابووی گەلەك ب ساناهی دشێت بهێتە گوهۆرین ژبۆ وەلاتەکێ دکتاتوری یێ لەشکەری، لێ ڤی سەروکی شیا ب هێزوشیانێن خۆ وەلاتێ ئەمریکا بپارێزیت و ژ ژێکڤەبوون و ناڤچوونێ دووربێخیت. وی لبەر نەبوو هەتا دوماهیا ژیێ خۆ ل سەر دەستهەلاتێ بمینیت یانژی ببیتە شاهەکێ دکتاتور لەوڕا ئەڤ کارێ ویژی بوو بنیاتێ سەرەکی یێ دەستهەلاتێ ل ویلایەتێن ئێکگرتی.

جۆرج واشنتۆن نە ژ کەسێن هزرمەند و ئەدیب بوو هەرەکی هندەك سەرکردەیێن پشتی وی هاتین وەك جیفرسون و مادیسون و هاملتون و بنیامین فرانکلینی، لێ سەرەڕای ڤێ چەندێ ژی ژ ڤان هەمی سەرکردان یێ گرنگتر و سەرکەفتی تر بوو، ل شەڕی و ئاشتیێ دا شیا بریارێن وێرەك و دروست بدەت، دبیت ڕۆلێ هاملتونی د دروستکرنا ویلایەتێن ئێکگرتی دا یێ مەزن بیت لێ ڕۆلێ واشنتۆنی یێ زیندی و کارا بوو.

دانانا ناڤێ واشنتۆنی دناڤ لیستا کەسێن کاریگەر دا بەهرا پتر ژبۆ گرنگیا ویلایەتێن ئێکگرتی دزڤڕیت، سەرەڕای هندێ کو وەلاتێ ئەمریکا شیا ل ناڤەڕاستا چەرخێ بیستێ ببیتە سەنتەرەکێ لەشکەری و سیاسی یێ مەزن و ببیتە وەلاتێ ئێکێ ل جیهانێ، لێ نەیا پشت ڕاستە کو ژیێ ڤی وەلاتی هندی یێ ئیمپراتۆریا ڕۆمانی درێژ بیت، ژبەرکو هندەك وەلاتێن دی شیاینە هندەك سەرکەفتنێن مەزنتر تومار بکەن وەك داهێنانا ئێکەم فرۆکێ و چوونا مرۆڤان بۆ سەر هەیڤێ و دروستکرنا بومبێن ناڤۆکی.

کەسایەتیا سیاسی یا واشنتونی نێزیکی کەسایەتیا ئوگوست قەیسەری بوو، لەوڕا دا یا گونجای بیت هەکە مە ناڤێن وان دانابانە ب ڕەخ ئێکڤە یان ل ل دویڤ ئێك، لێ ئەگەرێ نەدانانا ڤێ چەندێ بۆ هندێ دزڤڕیت کو ماوێ دەستهەلاتا واشنتۆنی گەلەك نەڤەکێشا، زێدەباری کو گەلەك کەسێن دی ڕۆل د دانانا ویلایەتێن ئەمریکا دا کریە.

## 27. کارل مارکس Karl Marx

## (1818ز. – 1883ز.)

### کارل مارکس

### ئەو فەیلەسوفێ ژبەر هزروبیرێن خۆ ژ گەلەك وەلاتان هاتیە دەرئێخستن

کارل مارکس یێ کو دهێتە نیاسین ب دانەرێ رێبازا "سۆشیالیزما زانستی" ل سالا 1818 ل باژێرێ "تەریر" ل ئەلمانیا ژدایکبوویە. بابێ وی پارێزەر بوو، دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 17 سالیێ، ل زانکۆیا "بۆن" یا ئەلمانی هاتە وەرگرتن لێ ل دووڤ دا هاتە ڤەگۆهاستن ژ بۆ زانکۆیا بەرلینێ و ل دوماهیێ شیا باوەرناما دکتورایێ د فەلسەفێ دا ژ زانکۆیا ڤیەنا وەربگریت.

مارکسی د بوارێ رۆژمانەڤانیێ دا کار دکر، ل دەمەکی سەرنڤیسەرێ رۆژناما "راین" بوو کو ل دەڤەرا کولۆنیا دەردکەفت لێ هەر زویکا بوچوونێن وی یێن سیاسی ئەو تووشی گەلەك ئاریشەیان کر، لەورا پشتی هینگێ بەرەڤ باژێرێ پاریسێ ل فرەنسا چوو و ل وێرێ هەڤالێ خۆ یێ نێزیك "فریدریك ئەنجل" دیت، لێ پشتی هینگێ ژ وەلاتێ فرەنسا ژی هاتە دەرئێخستن لەورا چوو وەلاتێ بەلچیکا.

ل سالا 1847 ئێکەم پەرتووکا خۆ ب ناڤێ "دەستڤالابوونا فەلسەفێ" بەلاڤکر، ل سالا ل دووڤ دا وی و هەڤالێ خۆ ئەنجلی "بەیاناما شیوعی" بەلاڤکر، پشتی هینگێ بەرەڤ دەڤەرا کولۆنیا چوو، لێ ل وێرێ ژی هاتە دەرئێخستن لەورا نەچاربوو بچیتە باژێرێ لەندەن و هەتا دوماهیا ژیانا خۆ ل وێرێ ما.

مارکسی پتریا دەمێ خۆ ب خواندن و نڤیسنێ ڤە دبوراند، هەڤالێ وی یێ نێزیك ئەنجلی بەردەوام ژلایێ دارایی ڤە هاریکاریا وی دکر، چونکی کەسەکێ زەنگین بوو. ل سالا 1867 کارل مارکسی پشکا ئێکێ ژ پەرتووکا خۆ یا ب ناڤودەنگ "سەرمایەداری" بەلاڤکر و لێ پشتی وەغەکرنا وی ژ نوو هەردوو پشکێن دی هاتبوونە بەلاڤکرن.

گومان تێدا نینه کو پەرتووکێن مارکسی و ئەو بنەمایێن وی ژبۆ سیستەمێ شیوعیەتێ دانایین جهەکێ بلند دایه وی دناڤ ڤێ لیستێ دا، لێ پرسیار ئەوە ئەرێ ب دروستاهی ناڤێ وی ژ هەژی ڕێزا چەندێ یە؟

هەلبەت لایەنەکێ مەزن ژ بهایێ مارکسی پشت بەستنێ دکەتە سەر بوچوونا وی یا تایبەت ل دور شیوعیەتێ، هەردیسان ڤان بوچوونان کارتێکرنەکا مەزن ل سەر هزرا مرۆڤایەتی و شرۆڤەکرنا ڕێرەوێ مێژوییێ و ئابوری و پەیوەندیێن جڤاکی کریه. پشتی پتر ژ 100 سالاڵن ژ مرنا مارکسی لێ ئەڤروکە ل سەرانسەری جیهانی هژمارا ئەو کەسێن باوەریێ ب ڕێبازا وی دئینن پترە ژ ملیار مرۆڤان و ئەم دشێن بێژین ئەڤ هژمارە مەزنترین هژمارا دویکەفتیانە کو ڕێبازەکا سیاسی ب درێژاهیا دیروکی شیابیت ل دووڤ خۆ بێخیت.

لێ کەس نەشێت گرنتیا هندێ بدەت کو ئەڤ ڕێبازە هەتا هەتا دێ وەکی خۆ مینیت چونکی گەلەك جوداهی و ناکوکیێن دژوار و تێکچوون دناڤ ڤێ ڕێبازێ دا پەیدابووینە.

دەمێ ئەم دانپێدانێ ب مەترسیا ڕێبازا شوعیەتێ ل جیهانێ بکەین، دڤێت ئەم پرسیارا گرنگیا هەبوونا مارکسی ب خۆ دناڤ ڤێ ڕێبازێ دا بکەین ، ژبەرکو ئێکەتیا سوڤیەتی یا بەرێ تا ڕادەیەکێ ئەڤ ڕێبازە پێش ئێخستبوو کو ب تەمامی یا جودابوو ژ وێ ڕێبازا مارکسی نڤێسایی، هەردیسان گەلەك ژ وان یاسا و چوارچووڤەیان یا دووربوو یێن مارکسی دانایین، لەوڕا چ شینوار ژبۆ وان تشتان نامینن یێن مارکسی ناڤکرین وەك: فەلسەفا ماددەخوازی و بهایێ سەرێژ یان زێدە.

ژبەر ڤێ چەندێ ئەم دشێن بێژین کو ڕێبازا شیوعی ل ئێکەتیا سوڤیەتی یا بەرێ گەلەك دەینداری هزروبیرێن هەر ئێك ژ "ستالین" و " لینین"ی یە پتر ژ دەینداریا کارل مارکسی. د هەمان دەم دا گەلەك ژ وان ڕێنمایێن مارکسی دانایین بەری هینگێ ژلایێ هژمارەکا مەزن یا فەیلەسوفێن ئەورۆپی ڤە هاتبوونە دیارکرن، لێ بیرتیژی و زیرەکیا مارکسی د هنێرا دیاربوو کو ئەو شیا ڤان ڕێنمایان ب شێوەیەکێ گەلەك بهێز پێکڤە گرێبدەت.

سەرکردێن شیوعی هەمیان ئەو چەندە ئاشکەراکریە کو وان پەرتووك و بوچوونێن مارکسی خواندینە و ل دووڤ چووینە و گەلەك تشت ژی ل سەر زێدەکریە، ژ

وان کەسان ژی "لینین" و "ماوتسی تونج" بوون یێن ئەڤ چەندە ئاشکەرا کری، هەروەکو کا چەوا هندەك دویکەفتیێن ئاینێن ئیسلام و مەسیحی و بودی پێگیری ب ڕێنماییێن ئاینیٚ خۆ کرینە و چەندین تشت ل سەر زێدەکرینە.

گومان تێدا نینە هەڤالێ مارکسی، فریدریك ئەنجلی پشکداری د دانانا پەرتووکا وی یا ب ناڤێ "سەرمایەداری" دا کریە، و وی ب خۆژی چەندین پەرتووکێن تایبەت بەلاڤکرینە، لێ هزروبیرێن مارکسی گەلەك کویرتر و بهێزتربوون، لێ نابیت دەمێ ئەم بەحسێ مارکسی و ڕێبازا وی دکەین ئەم ڕۆلێ ئەنجلی ژی ژبیربکەین چونکی ویژی تا ڕادەیەکی کاریگەری هەبوویە ل سەر هزرا سیاسی یا جیهانی.

مارکسی د پەرتووکێن خۆ دا پێشبینیا گەلەك تشتان کربوو، لێ گەلەك ژ ڤان پێشبینیان ڕاست دەرنەچوون، بەلکو هندەك ژ وان ب تەمامی بەروڤاژی دەرکەفتن، مارکسی پێشبینی دکر کو تەخا کارکەران ل ناڤ جڤاکێن پیشەسازی و سەرمایەداری دێ بەرەڤ هەژاریێ چن، لێ ئەڤ چەندە ڕاست نەدەرکەفت، هەردیسان وی پێشبینی دکر کو چینا ناڤەڕاست ژی دێ ووندابیت و دێ ژبۆ هەتا هەتایێ ژناڤچیت ئەوژی ژ ئەگەرێ زێدەبوونا چینا کرێکار و هەژاران، هەلبەت ئەڤ چەندەژی وەکی وی نەدەرکەفت.

دیسان مارکسی هزرکر کو ب کارئینانا تەکنیك و ئامیرێن پێشکەفتی دێ بیتە ئەگەرێ هەژاربوون و ژدەستدانا پارێ سەرمایەداران لێ ئەڤ پێشبینیا وی ب تەمامی بەروڤاژی ڕاست دەرکەفت و سەرمایەردار زەنگینتر لێ هاتن.

کارتێکرنا فەلسەفا مارکسی یان هەر فەیلەسوفەکێ دی ل سەر بنەمایێ وان شاشیێن ئەو کەفتیێ ناهێتە هەڵسەنگاندن بەلکو ل سەر بنەمایێ وێ کاریگەریا ل سەر خەلکی دهێتە کرن دهێتە هەڵسەنگاندن خۆ هەکە هندەك شاشی ژی تێدا هەبن، لەوڕا ژی ئەم دشێن بێژین کارل مارکس ئێکە ژ مەنترین فەیلەسوفێن جیهانی و مە ناڤێ دانایە دگەل ڤێ لیستێ.

## 28.برایێن ڕایت wright brothers

## ئورڤێل ڕایت (1871ز.- 1948ز.)

## ویلبور ڕایت (1867ز.-1912ز.)

### برایێن ڕایت

### ئەو هەردوو برایێن ئێکەم فرۆکە ل جیهانێ دروستکری

ژیانا ڤان هەردوو برایان ژ گەلەك لایەنانڤە یا پێکڤە گرێدایە و هەردووکان د ئێك بواردا کارکریە و سەرکەفتنا وان یا وەکهەڤ بوو لەوڕا ئەم دێ بەحسێ هەردووکان پێکڤە کەین هەروەکی کەسەکێ ب تنێ، ئەڤ هەردوو برایە پێکڤە چووینە قوناغا سەرەتایی و ناڤنجی لێ پشتی هینگێ وان هەردوو خواندن هێلا و نەگەهشتنە قۆناغا زانکۆییێ، لێ وان هەردووکان پێکڤە کارەك کر کو هەتا هەتا ناڤێ وان نەمریت.

ئورڤێل و ویلبور هەردوو برایێن ئێك بوون و هەر ژ بچووکاتی گەلەك حەز ژ هونەرێ میکانیکی دکر و بەردەوام هزرا خو د هندێ دا دکر کارەکی بکەن یان ئامیرەکی دروست بکەن کو هاریکاریا مرۆڤی بکەن بشێن بفڕن.

ل سالا 1892 وان ژبۆ خۆ دوکانەك ڤەکر ژبۆ فروشتنا پایسکلان و پارچەیێن وان، ئەو پارێ بۆ وان ژ ڤێ دوکانی هاتی هاریکاریا وان کر ئەو بشێن دەست ب پرۆژێ خۆ بکەن و خەونا خۆ بکەنە ڕاستی، ل دەستپێکێ وان ڤەکۆلین و پەرتووکێن زانایێن بەری هینگێ خواندن یێن بەحسێ فڕینێ دکر وەك بەرهەمێن زانا "ئوفیل لینەتالٚ" و "ئوکناف" و "ساموئیل لانگلی". ل سالا 1899 ژی وان دەست خواندنا وان ئاڕیشەیان کر یێن دبنە ڕێگر هەمبەر فڕینێ.

ل هەیڤا کانونا دوێ ل سالا 1903 زاینی، و پشتی چوار سالێن خۆاندن و ڤەکۆلینان ئەو هێدی هێدی نێزیکی سەرکەفتنێ بوون، ڕاستی تشتەکێ سەیر بوو کو ئەڤ هەردوو برایە هوسا ب سانەهی سەرکەفتنێ تومار بکەن ل دەمەکی گەلەك کەسێن دی یێن

بەری هینگێ بزاڤا ڤێ چەندێ کری د سەرکەفتنی نەبوون، هەلبەت ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی ژبۆ هندێ دزڤریت کو دەمێ دوو مێشك پێکڤە هزردکەن باشترە ژ هزرکرنا مێشکەکی ب تنێ لەورا ژی وان بەردەوام پێکڤە کاردکر.

ژبۆ فێربوونا فڕین و هاژووتنا فرۆکەیان، ل سالا 1902 وان خۆ ل سەر فرۆکەیێن پەڕی یێن بێ مەکینە خۆ فێرکر، وان نێزیکی هزار جاران تاقیکرن ل سەر ڤان فرۆکەیان کر و هەمی جاران ژی تێدا د سەرکەفتنی بوون، ل وی سەردەمی ئەڤ هەردوو برایە بوونە زیرەکترین و بناڤودەنگترین فرۆکەڤانێن پەڕی ل جیهانێ هەمیێ.

بەری ڤان هەردوو برایان گەلەك کەسان هزرا هندی دکر کا چەوا دێ شێن فرۆکەیەکێ ژ سەر ئەردی بلند کەن لێ ڤان هەردوو برایان پتر هزرا خو د هندێ دا دکر کا چەوا دێ شێن کونترۆلێ ل سەر فرۆکێ کەن دەمێ ژ ئەردی بلند دبیت و ل دویڤدا ئەو شیان بگەهنە چارەسەریێ. ل دویڤدا ئەو شیان فرۆکەیەکێ دروست بکەن ئەوژی پشتی پتر ژ 100 دیزاینان بۆ پەرێن فرۆکێ دانایین داکو خۆ لبەر فشار و لەزاتیا هەوای بگریت.

هەردیسان ئەو سەردەمێ ئەڤ هەردوو برایە تێدا ژیاین یێ هاریکاربوو ئەو بگەهنە ڤێ سەرکەفتنێ ژبەرکو ل چەرخێ نۆزدێ زاینی ئامیرێن هەلمێ دەرکەفتن، هەرچەندە ئەڤ ئامیرە ڕاستەخۆ ژبۆ فرۆکێ نەهاتنە ب کارئینان ژبەر قەبارێ وان یێ مەزن و سەنگا وان یا گران، لێ ڤان هەردوو برایان پەیوەندی ب ئەندازیارەکێ میکانیکی کر داکو بزوێنەرەکێ باش ژبۆ فرۆکەیان دروست بکەت کو دگەل قەبارێ فرۆکێ بگونجیت و یێ سڤك بیت.

ل ڕۆژا 17 کانونا ئیکێ ل سالا 1903 وان دەست ب ئێکەم گەشتا خۆ ب فرۆکێ کر و هەر ئێك ژ وان د وێ ڕۆژێ دا دوو گەشت ئەنجامدان، گەشتا ئێکێ ئورڤیل پێ ڕابوو کو د ماوێ 12 چرکەیاندا نێزیکی 120 پێیان فڕی. گەشتا دوێ ژی برایێ وی ویلبور پێ ڕابوو کو ئەوژی د ماوێ 59 چرکەیاندا نێزیکی 852 پێیان فڕی.

فرۆکا وان یا ئێکێ نێزیکی هزار دولاران لێ هاتبوونە مەزاختن و درێژاهیا پەڕێن وێ نێزیکی 40 پێیان بوون و گرانیا وێ 750 پاوندان بوون و هێزا بزوێنەرێ وێ 12 هەسپ بوون و گرانیا وی 170 پاوندان بوون، نوکە ئەڤ فرۆکە ل مۆزەخانا ئەسمانی ل واشنتۆن هاتیە پاراستن.

هەرچەندە خەلك یێ ئامادەنەبوو دەمێ ڤان هەردوو برایان گەشتێن خۆ یێن ئێكێ ئەنجامداین ب تنێ پێنچ كەس نەبن، لەورا ژی ل ڕۆژا ل دویڤدا چ ڕۆژنامەیان بەحسێ فرۆكا وان نەكر و چ پێزانین ل سەر بەلاڤ نەكرن ژبەر هندێ كەسێ نەزانی بوو كو ئێدی د شیانێن مرۆڤی دا هەیە ل ئەسمانی بفڕیت.

ل سالا 1905 وان فرۆكەكا دی چێكر و نێزیكی 150 گەشتان پێكرن لێ هەر كەسێ چ گرنگی پێ نەدا، ب تنێ ڕۆژنامەیەكا فڕەنسی ڕاپۆرتەك ل سەر بەلاڤكر ب ناڤێ "فرۆكەڤان یان ژی درەوین" ؟!

ژبۆ هندێ ئێدی خەلك درەو و پرۆپاگندەیان ب دویڤ ڤان هەردوو برایاڤە نەنن، برایەكێ ژ وان فرۆكا خۆ برە فڕەنسا و ل پێشچاڤ ێن خەلكی چەندین گەشت ئەنجامدان، پشتی هینگێ هەر زوی ئەڤ دەنگوباسە بەلاڤ بوو و خەلكی ئێدی ب چاڤێن خۆ دیت كو مرۆڤ ژی دشێن بفڕن، وان كومپانیەكا دامەزراند ژبۆ فروشتنا ڤێ داهێنانا خۆ.

برایێ ئورڤیل ل ئەمریكا مابوو و تاقیكرن ل سەر فرۆكەیان دكر هەتا ڕۆژا 17 ئیلونا 1908 فرۆكا وی تووشی ڕۆیدانەكێ بووی و پێیەكی وی شكەست و نەفەرەكێ دگەل گیانێ خۆ ژدەستدا. لێ سەركەفتنا ڤان تاقیكرنان باوەری ژبۆ حكومەتا ئەمریكا چێكر كو فرۆكەیێن وان ب بهایێ 30 هزار دولار ژێ بكرن.

ل سالا 1912 ویلبور تووشی نەخۆشیا تیفویێ بوو و هەر ل وێ سالێ دژیێ 45 سالیێ دا گیانێ خۆ ژدەستدا و ل دویڤدا برایێ ویژی بەهرا خۆ یا كومپانیا دروستكرنا فرۆكەیان فرۆت و لێ ئەو  هەتا 1948 ژیا و ژیانا هەڤژینیێ پێكنەئینا.

## 29. چەنگیزخان Genghis Khan

## (1162ز. – 1227ز.)

### چەنگیزخان

### ئەو سەرکردێ شیای هەمی هوزێن مەنگولی بکەتە ئێك

چەنگیزخان سەرکردەیەکێ مەنگولی یێ بناڤدونگ بوو، بابێ وی سەروکێ هوزەکا مەنگولی بوو، دەمێ هێشتا یێ زاروك ناڤێ وی کربوو تیموگین. دەمێ ژیێ وی گەهشتیە نەهـ سالێ بابێ وی ژلایێ هوزەکا دیڤە هاتە کوشتن لەورا هەمی ئەندامێن خێزانا وی د ڕەوشەکا نەخۆش و بترس و دوودلیێ دا ژیان. لێ پشت هینگێ تیموگین ژلایەکێ هوزەکا دیڤە هاتە دزین و زینداکرن.

داکو تیموگین بزاڤێن ڕەڤینێ نەکەت ڤێ هوزێ چارچوڤەکێ داری یێ گروڤر و مەزن کرە ستویێ وی، ئەڤ چەندە ببوو ئەگەر هەر ژ بچووکاتی کەربوکین و هەڤڕکی بچیتە دناڤ دلێ ویدا و بوو ئەگەر ببیتە ئێك ژ بهێزترین زەلامێن جیهانێ.

هێزا تیموگینی وی دەمێ دەستپێکر دەمێ بزاڤ دکرین وی چارچوڤێ داری ژ ستویێ خۆ بینتە دەر و ژ زیندانێ ب ڕەڤیت، ل دویڤدا ڕەڤی دەڤ شێخەکێ هوزا خۆ ب ناڤێ "توگریل" کو بەری هینگێ هەڤاڵەکێ بابێ وی یێ نێزیك و دلسوز بوو.

چەندین سالێ بورین لێ هوزێن مەنگولی بەردەوام شەڕێ ئێکودوو دکرن و د کاودانێن دژوار و نەخۆشدا ژیان. د ماوێ ڤان شەڕێن خویناوی دا گەنجەکێ بهێز و خودان شیان دەرکەفت و هەمیان هزرکر کو ئەو دێ بیتە سەرکردەیەکێ چەلەنگ و پاشەڕۆژا هەمی هوزێن مەنگولی دێ کەڤیتە د دەستێن ویدا داکو هەمیان بکەتە ئێك.

دیروك بومە دووپات دکەت کو سیارچاکێن مەنگولی زیرەکترین شەڕکەرێن سەردەمێ خۆ بوون، لێ دوژمنایەتی و هەڤڕکیا دناڤبەرا ڤان هوزاندا وەلێ کربوو وەلاتێن جیرانێن وان چ هزرێ بۆ نەکەن، لێ تیموگین ب زیرەکی و چاڤنەترسی و دبلوماسیا خۆ شیا

ڤان هوزان هەمیان بکەتە ئێك و ببیتە سەرکردێ وان. ل سالا 1206 سەروکێن هەمی هوزان خڕڤەبوون و بریاردا تیموگینی بکەنە شاهێ خۆ و ناسناڤێ وی کرە جەنگیزخان، ئانکو ئیمپراتورێ دونیایێ!

پشتی جەنگیزخانی شیای شەڕێن ناڤخۆیی دناڤبەرا هوزێن مەنگولی دا نەهێلیت و لەشکەرەکێ ئێکگرتی دروستبکەت، بریاردا شەڕێ ببەتە دەرڤەی وەلاتێ خۆ، ل دەستپێکێ شەڕەکێ مەزن دگەل ویلایەتەکێ ل باکورێ چینێ کر و شیا داگیربکەت، ل وی دەمی کو هێزێن وی ژلایێ باکور و ڕۆژئاڤایی ڤە هێرش دکرنە سەر چینێ، هندەك هێزێن وی بەرەڤ وەلاتێ فارسان هاتن و ل سالا 1219 و پشتی شەڕەکێ مەزن هێزێن وی شیان سەرکەفتنەکا مەزن تومار بکەن و ئیمپراتۆریا فارسان ژناڤ ببەن.

هەردیسان دەمێ لەشکەری وی بەرەڤ ڕۆسیا چووی داکو داگیربکەت، د ڕێکا خو دا شیان کونترۆلێ ل سەر وەلاتێن ئەڤگانستان و باکورێ هندێ بکەن و بێخنە ژێر دەستهەلاتا خۆ. ل سالا 1225 جەنگیزخان زڤڕی وەلاتێ خۆ مەنگولیا و ل سالا 1227 ل وێرێ وەغەر کر.

بەری مرنا خۆ، جەنگیزخانی بریاردا دا پشتی مرنا وی کورێ وی یێ سیێ "ئوجادی" جهێ وی بگریت، هەلبەت ئەڤ بریارا وی گەلەك یا د جهێ خۆدا بوو چونکی بۆ وی دووپات بوو کو کورێ وی دێ بیتە سەرکردەیەکێ بهێز و چەلەنگ، پشتی هینگێ کورێ وی هێزێن خۆ ژ چینێ زڤڕاندن و بەرەڤ ڕۆسیا چوون و هەتا گەهشتینە ئەورۆپا. ل سالا 1241 لەشکەرێ وی چوونە دناڤ وەلاتێن ئەلمانیا و پولەندا. لێ پشتی هینگێ هێزێن مەنگولی پاشڤە زڤڕین و کورێ ویژی وەغەکر.

پشتی مرنا ئوجادی هەڤڕکی و دووبەرەکی کەفتە دناڤبەرا سەرکردێن هوزێن مەنگولی کا دێ کی بیتە سەرکردێ وان، ئەرێ دێ "مانجوخان" یانژی "کویلای خان" بیتە سەرکردێ هێزێن مەنگولی کو هەردووژی نەڤیێن جەنگیزخانی بوون.

لێ پشتی ڤان هەردوو نەڤیان، هێزێن مەنگولی دووبارە زڤڕینە وەلاتێ چینێ و شیان ب تەمامی داگیربکەن، ل وی دەمی مەنگولی شیان کونترۆلێ ل سەر وەلاتێن چین و کوریا و هند و تبت و ئاسیا ناڤەڕاست و باشورێ ڕۆژهەلاتێ ئاسیا و ڕۆسیا و پولەندا بکەن، ئەڤ چەندەژی دهێتە هەژمارتن مەزنترین ئیمپراتۆری د دیروکێ دا.

لێ چ پێنەڤێت ئەڤ ئیمپراتۆریا مەزن کو هندەك کەس ب شێوەیێن کەڤن و دەستپێکی ڕەفتار و دەستهەلاتێ بکەن دێ زویکا ژناڤ چیت، لەوڕاژی وەلاتێ چینێ شیا ل سالا 1368 هێزێن مەنگولی ژ وەلاتێ خۆ دەربێخیت، لێ دەستهەلاتا وان هەتا چەرخێ شازدێ ل ڕۆسیا و هەتا سالا 1783 گزیرتا قەرەم ما.

هژمارەکا شاهێن نەڤیێن جەنگیزخانی هێشتا مابوون دەستهەلاتێ ل ئاسیا ناڤەڕاست و وەلاتێ فارسان بکەن، ل ڤان وەلاتان سەرکردێ مەنگولی "تەیمور لەنگ" کو نەڤیێ جەنگیزخانی بوو ل چەرخێ چواردێ زاینی فەرمارڕەوایی دکر لێ پشتی هینگێ ئەڤ وەلاتە ب تەمامی ژبن دەستێ وی دەرکەفتن، لێ ئەڤ چەندە دوماهیا مەنگولیان نەبوو ژبەرکو پشتی هینگێ نەڤیەکێ تەیمولەنگی کو ناڤێ وی "بابیر"بوو شیا شەڕەکێ مەزن دگەل وەلاتێ هندێ بکەت و شاهنشینەکا نوو بۆ مەنگولیان ب دانیت، مەنگولیان هەر دناڤبەرا ماوەیەکی بۆ ئێکی دی شەڕێ هندێ دکر هەتا چەرخێ هەژدێ زاینی.

د دیروکێ دا گەلەك کەسێن دی یێن وەکی جەنگیزخانی هەبووینە کو هژمارەکا مەزن یا وەلاتان داگیرکربیت و سەرکەفتنێن لەشکەری یێن مەزن تومار کربن، ژ وان کەسێن بەرچاڤ ژی ئەلیکساندەرێ مەزن و ناپولیون و هیتلەر. لێ دبیت هندەك کەس بێژن بوچی ئەڤ هەر چوار کەسە هاتینە دانان دناڤ لیستا کاریگەرترین مرۆڤ د دیروکێ دا، ئەرێ ما پێدڤی نەبوو ل شوینا وان هندەك هزرمەند و ئەدیب هاتبانە دانان؟

گومان تێدا نینە کو هەمی گاڤان هێزا پێنوسی گەلەك ژ یا شیری و چەکی مەزنتربوویە، لێ ئەڤ هەر چوار کەسە شیان عەردەکێ مەزن داگیربکەن و حوکمی ل گەلەك نەتەوە و وەلاتان بکەن، ئەڤێ چەندێ ژی کاریگەریەکا مەزن ل سەر پاشەڕۆژ و ژیانا خەلکێ وان دەڤەرا هەبوویە ژبەر هندێ ڕۆلێ وان ناهێتە بەرزەکرن. ئەگەر خۆ هەستێ مە بەرامبەر وان یێ چەوان بیت، حەژێ بکەین یان کەربێن خۆ ژێڤەکەین، ڕێزێ لێ بگرین یان ژبیربکەین.

لێ پرسیار ئەوە ئەرێ بوچی جەنگیزخان ژ هەسێ کەسێن دی گرنگترە؟

ژبەرکو کاریگەریا وی درێژتر و مەزنتر بوو ژ یا هەرسێ کەسێن دی، ژبلی ڤێ چەندێ ژی ئەو کارتێکرنا وی ل پشت خۆ هێلای بۆ ماوەیەکێ گەلەك درێژ مابوو، ناپولیون و هیتلر هەردوو هێشتا زیندی و ساخ د شەڕی دا شکەستن، هەروەسا

ئەليكساندەری ژ جهگرێن باش ل دويف خۆ نەهێلابوون لەورا هەرزوی و پشتی مرنا وی ئيمپراتۆريا وی ژناڤچوو، لێ بەروڤاژی وان هەميان، جەنگيزخانی شەرێن خۆ ب شێوەيەکێ گەلەك رێکخستی ئەنجامددان، هەرديسان کورێ وی و نەڤيێن ويژی کەسێن سەرکەفتی و خودان شيان بوون و شيان بۆ ماوێ چەندين چەرخان حوکمی ل گەلەك وەلاتان بکەن.

ل ڤێرێ ژ ئەنجامێ شەرێن جەنگيزخانی ئەنجامەکێ ديژی ب شێوەيەکێ نەراستەخۆ پەيدابوو، ئەوژی بازرگانی دناڤبەرا وان وەلاتاندا گەلەك ب هێز کەفت يێن ژلايێ لەشکەرێ ويڤە هاتينە داگيرکرن ب تايبەت دناڤبەرا وەلاتێ چينێ و ئەورۆپا. بازرگانێن وەکی "مارکو پولو"ی شيان بچنە چينێ و پاشی ڤەگەرنە ئەورۆپا و بەحسێ چيرۆکێن ئەفسانەيی يێن وان وەلاتان بکەن، ئەڤ چالاکيا بازرگانی ببوو ئەگەر هژمارەکا مەزن يا ئەورۆپيان بەرەڤ ئاسيا بچن و تشتێن نوو ئاشکەرا بکەن.

جەنگيزخان دهێتە هەژمارتن ئێك ژ وان سەرکردێن مەزن يێن گوهۆرين د رێرەوێ ديروکا مرۆڤايەتيێ دا کرين و ئەگەر ئەو نەبايە رەنگە چ کەسين نەشيابان هوزێن مەنگولی هەميان بکەتە ئێك و ئيمپراتۆريەکا مەزن ژێ دروست بکەت ژبەر ڤێ چەندێ مە ناڤێ وی دگەل ليستا کەسێن کاريگەر دانايە.

## 30. ئادەم سمیس Adam Smith

## (1723ز-1790ز.)

### ئادەم سمیس

### ئەو کەسێ دژی مایتێکرنا حکومەتێ د بازرگانی و بازارێ ئازاد ڕاوەستیای

ئادەم سمیس ئەو کەس بوو یێ شیایی تیورێن ئابوری تا ڕادەیەکێ مەزن پێشبێخیت، ل سالا 1723 زاینی ل بازێرێ "کیرکلادی" ل وەلاتێ ئوسکوتلەندا ژدایکبوویە و ل دویڤدا ل زانکۆیا ئوکسفۆرد خۆاندنا خۆ ب دوماهی ئینایە و د ماوێ دناڤبەرا سالێن 1751 هەتا 1754 وەك ماموستایێ فەلسەفێ ل زانکۆیا گلاسگو کارکریە.

د ماوێ کارێ خۆیێ ماموستایەتییێ دا پەرتووکا " تیورا هەستێن ڕەوشتی" بەلاڤکر کو بوو ئەگەرێ ناڤودەنگبوونا وی دناڤ تەخا ڕەوشنبیراندا ل وی سەردەمی. لێ ناڤودەنگیا وی یا جیهانی پشتی بەلاڤبوونا پەرتووکا وی یا ناڤدار "سامانێن مللەتان" هات کو ل سالا 1776 هاتبوو بەلاڤکرن، ئەڤ پەرتووکە هەر زوی گەلەك بەربەلاڤبوو و ئادەم ژبەر ڤێ پەرتووکێ ب درێژاهیا ژیانا خۆ بۆ کەسەکێ ناڤدار.

ئادەم سمیس هەر ل وی بازێری وەغەر کر یێ لێ ژدایکبووی و ژیانا هەڤژینیێ ژی پێکنەئینابوو، هەرچەندە ئادەم کەسێ ئێکانەبوو یێ ژیانا خۆ هەمی تەرخاکری ژبۆ پێشخستنا تیورێن ئابوری، لێ بوچوونێن وی تا ڕادەیەکێ مەزن د باش نەبوون، ئێکەم کەس بوو یێ شیای ڕێبازەکا ئابوری یا پێشکەفتی ب دانیت، ئانکو ئەم دشێن بێژین وی بەرێ بنیاتێ هەمی پێشکەفتنەکا ئابوری دانا.

هەردیسان ئەم دشێن بێژین کو پەرتووکا وی ل دور سامانێن مللەتان خالا دەستپێکێ یا خۆاندنا زانستێ ئابوریا سیاسی یا سەردەمێ ئەڤروکە بوویە.

ژ گرنگترین ئەنجامێن ڤێ پەرتووکێ ئەبوو ئەو ڕابوو ب دروستکرن و ڕاستڤەکرنا گەلەك بوچوونێن شاش د زانستێ ئابوری دا، ئادەم ل هەمبەر تیورا بازرگانی یا کەڤن

ڕاوەستیا و دژایەتیا وێ کر، هەردیسان دژی تیورێن ئابوریێن کشتۆکالی ژی ڕاوەستیا کو ئەو کەسێن ل باوەر ب ڤێ تیورێ هەی هزردکر "عەرد" ب تنێ ژێدەرێ ب دەستڤەئینانا پاریێ ژیانێ یە، لێ ئادەمی گرنگیا کاری دیارکر و کو هەر کەسەك دڤێت کار بکەت ژ پێخەمەت دابینکرنا پاریێ ژیانا خۆ و هێرش کرە سەر هەمی وان ڕێگران یێن حکومەتێ دژی پێشکەفتن و بەرفرەهبوونا پیشەسازیێ دانایین.

لێ ناڤەرۆکا ڤێ پەرتووکا وی کو دهێتە ناڤکرن ب "بەرەلاّیا بازارێ ئازاد"، دەربڕینێ ژ ئامرازەکێ هویر و دروست دکەت یێ کو ئەو ب خۆ ب ڕێکخستنا خۆ ڕادبیت، و بازار ژی ڕادبیت ب ڕێکخستنا فرۆشتن و بەرچاڤکرنا ئەو تشتێ خەلك پێدڤی دبیتێ.

بۆ نموونە: ئەگەر ئەم بێژین هندەك کەلوپەك وشتومەك ل بازاری کێمبوون، هەر ئێکسەر دێ بهایێ وان بلند بیت، ئەڤ بهایێ بلند ژی دێ بیتە ئەگەر ئەو کەسێن ڤان کەلوپەلان بەرهەم دئینن پتر پاران ب دەستخۆڤە بینن، ژبەر ب دەستڤەهاتنا ڤی پارێ زێدە هندەك کەسێن دی دێ ڕابن ب بەرهەم ئینانا ڤان کەلوپەلان ب بڕەکا مەزنتر و هوسا ئەڤ کەلوپەلە ل بازاری دێ زێدەبنەڤە.

هەڤڕکیا دناڤبەرا خودانێن ڤان کەلوپەلان بەرهەم دئینن دێ بیتە ئەگەر ئەڤ کەلوپەلە ب سانەهی بکەڤنە بەر دەستێ گەلەك خەلکی هەتا وی ڕادەی بهایێ وان جارەکا دی دهێتە خوارێ هەتا د گەهیتە بهایێ خۆ یێ ئاسایی. لێ لڤینا بازاری و بەرهەم ئینان و هەڤڕکی و بەرچاڤکرن و فرۆتن و داخوازیا کرینێ ب ڤێ چەندێ ڕادبیت، ئانکو ب ڤی ڕەنگی ئەم دشێن بێژین کو ڤێ ئاریشێ خۆ ب خۆ چارەسەرکر.

ئادەم سمیس دبێژیت: هەر مرۆڤەك ل دویف مفایێ خۆ و ڕزقێ خۆ دگەریت بێی کو ئەو هزربکەت د هەمان دەمدا ئەو یێ ئارمانجا هندەك کەسێن دیژی بجھ دئینیت، ئانکو ژبەرکو مرۆڤ بەردەوام بزاڤێ دکەت ئارمانجێن خۆ بجھ بینیت، ئەڤ خەباتا ی یا بەردەوام دبیتە ئەگەر ئەو ئارمانجێن جڤاکێ خۆژی بجھ بینیت خۆ هەکە د هزرا ویژی دا نەبیت.

ئەڤ هێزا ڕاستەڤینە یا مرۆڤی پالّددەت ئارمانجێن جڤاکێ خۆ بجهبینیت د شیاندا هەیە بهێنە لادان یان ڕاوەستاندن ئەگەر هندەك مەرج ل هەمبەری وی هاتنە دانان و ڕێگری لێ هاتەکرن، لەوڕا ئادەمی باوەری ب هەبوونا بازارێ ئازاد هەبوو و دژی هندێ بوو بهایەکێ مەزن ل گومرکا بهێتە وەرگرتن.

هەردیسان ئەوژی دژی مایتێکرنا حکومەتێ بوو د کاروبارێن بازرگانی و لڤینا بازاری دا ژبەرکو ئەڤ مایتێکرنا حکومەتێ دێ بیتە ئەگەرێ لاوازکرنا چالاکیا بازرگانی و بەرهەم ئینانێ و ل دوماهیێ دێ بیتە ئەگەر بەکاربەر ئانکو ئەو خەلکێ ئاسایی یێ پێدڤی ب ڤان کەلوپەلان دبیت باجا ڤێ چەندێ بدەن.

هندەك کەس د وێ باوەرێ دانە کو ئادەم سمیسی ب تنێ گرنگی دایە مفایێن بازرگانی، لێ ئەڤ چەندە ڕاست نینە ژبەرکو ئەوب هەمی ڕەنگان دژی هەمی جورێن قورخکرنێ بوو.

هەردیسان ئادەم دژی گەلەك بوچوونێن ئابوری یێن بەری هینگێ ڕاوەستیا، لێ ئەو شیان دەستکاریێ دڤان بوچووناندا بکەت و ڕێکبێخیت و ڕێبازەکا ئابوری یا سیاسی یا تەماکەر ژێ دروستبکەت، پشتی وی چەندین فەیلەسوفێن دی هاتن و شیان شاشیێن وی دروست بکەن وەك "توٚماس مالٹوٚس" و زانایێ ئابوری "داڤێد ڕیکاردو". هەژی گوتنێ یە کو تیورێن ئابوری یێن کارل مارکسی تەمامکەرێن تیورێن ئادەم سمیسی نە.

پەرتووکا وی ل دور سامانێن ملەتان پێشبینی ب تیورێن مالٹوسی کریە دەربارەی زێدەبوونا هژمارا ئاکنجیێن جیهانێ و کاریگەریا وان ل سەر ژیانا گشتی یا مروٚڤان، لێ هەر ئێك ژ کارل مارکس و ڕیکاردوی هوسا هزردکر کو فشارا جەماوەری و زەحمەتا وان دهێتە گوهوٚرین بێی زێدەبوونا بهایێ کریا وان. لێ ئادەمی هزرکر زێدەبوونا بەرهەمی دێ بیتە ئەگەرێ زێدەبوونا کریێ و ڕوٚژانێن پشتی هینگێ ئەو چەندە دووپاتکر کو ئادەم یێ ڕاستبوو و هەر ئێك ژ مارکس و ڕیکاردوی د شاش بوون.

هەردیسان ئادەم سمیسی کاریگەری ل سەر دەستهەلاٚتا تەشریعی و مایتێکرنا حکومەتێ ژی هەبوو، ژبەرکو وی پەرتووکا خوٚ گەلەك ب ڕوٚهن و ئاشکەرایی نڤێسابوو و ب سانەهی دشیا باوەریێ ژبوٚ خەلکی دروست بکەت و ب سانەهی دکەفتنە بەر دەستێ هەمیان، تیورا ئادەمی دەربارەی نەمایتێکرنا حکومەتێ د بازرگانی و بازارێ ئازاد دا کاریگەریەکا مەزن ب درێژاهیا چەرخێ نوٚزدێ هەبوو و هەتا سەردەمێ ئەڤروکە ژی ئەڤ کاریگەریە یا بەردەوامە.

هەرچەندە ل سەردەمێ ئەڤروکە گەلەك ژ تیورێن وی هاتینە گوهوٚرین و کاریگەریا وان لاواز بوویە تا وی ڕادەی گەلەك کەس هزر دکەن ئادەم سمیس نەژ هەژی ڤی

جهی یه دناڤ لیستا مرۆڤێن کاریگەر د دیروکێ دا، لێ ژبەرکو ئەو شیابوو هزر و بوچوونێن خۆ و یێن کەسێن دی ڕێکبیخێت و شێوازەکێ لوژیکی یێ تەمامکەر دروست بکەت کو کەس بەری وی نەشیابوو ڤی کاری بکەت لەوڕا ئەو یێ ژ هەژیە ل ڤێ ڕێزێ بهێتە دانان.

## 31. ویلیەم شکسپیر William shakespeare

## (1564ز-1616ز.)

### ویلیەم شکسپیر

### ئەو هونەرمەندێ هەتانوکەژی شانوگەریێن وی دهێنە زێندیکرن

هوزانڤان و نڤیسەرێ شانوگەریان یێ مەزن ویلیەم شکسپیر کو ناڤێ وی یێ دروست (ئێدوارد دی ڤێری) ل سالا 1564 زاینی ل باژێرێ ئیسترانفۆرد ل سەر ڕۆیبارێ ئاڤون ل ئینگلتەرا ژدایکبوویە. هەرچەندە خۆاندنا وی یا ئاسایی بوو و قوتابیەکێ ناڤنجی بوو لێ ژبەر هەژاریێ نەشیابوو بچیتە زانکۆیێ. ل ژیێ 18 سالیێ ژیانا هەڤژینیێ دگەل کچەکا 16 سالی پێکئینا و بەری ژیێ وی ببیتە 21 سالی بوو بابێ سێ زاروکان.

پشتی هینگێ بەرەڤ باژێرێ لەندەنڤە چوو و ل وێرێ بوو ئەکتەر و نڤیسەرێ شانوگەریان، دەمێ گەهشتیە 30 سالیێ چەندین سەرکەفتنێن مەزن دبواری هونەری دا تومارکرن و ل ژیێ 34 سالیێ بوو ئێك ژ هونەرمەندێن ناڤودەنگ و خەلك بەردەوام ل هیڤیا بەرهەمێن وی بوون، پشتی دەهـ سالێن دی یێن ژیانا وی چەندین بەرهەمێن ئەدەبی یێن مەزن پێشکێشکرن وەك شانوگەریێن ڕۆمیو جولیێت و هاملێت و یولیوس قەیسەر و ماکبس و شاهـ لیر.

د ماوێ بیست سالێن ژیانا خۆ ل باژێرێ لەندەن، هەڤژینا وی مابوو ل باژێرێ ئیسترانفۆرد، شکسپیر ل جەژنا ژداکیبوونا خۆ یا 52 سالیێ وەغەرکر و بێی کو د وی ماوەی دا زاروکێن خۆ بینیت.

ئەو کارێن ئەدەبی یێن شکسپیری یێن ئەڤروکە لبەر دەستێ مە نێزیکێ 38 شانوگەریانە زێدەباری چەندین شانوگەریێن دی یێن هەڤپشك دگەل کەسێن دی، هەردیسان وی نێزیکی 145 هوزانێن کورت و سێ هوزانێن گەلەك درێژ ڤەهاندینە.

سەرەڕای زیرەکی و مەزناهیا ڤی هوزانڤانێ مەزن، لێ مە ناڤێ وی نەدانایە دگەل دەستپێکا کەسێن کاریگەر یێن ڤێ لیستێ دا، بەلکو مە ناڤێ وی ل ڤێ ڕێزێ یێ دانای و

مەرەم ژڤێ چەندێ نەکێمکرنا بها و مەزناهیا ناڤودەنگیا ویە ، لێ ب بووچونا مە کەسێن ئەدیب و هونەرمەند کاریگەریەکا هوسا یا مەزن د دیروکێ دا نینە.

لێ د هەمان دەمدا زەلاٚمێن ئولی و زانا و سیاستەڤان و داهێنەر و فەیلەسوفان کاریگەریەکا مەزن ل سەر پێشکەفتنا و گوهۆرینا هیڤیێن مرۆڤایەتیێ هەیە، بۆ نموونە داهێنانێن زانستی کاریگەریەکا مەزن هەیە ل سەر پێشکەفتنا ئابوری و سیاسی و کاروبارێن ئاینی و فەلسەفی و کارێن هونەری.

دبیت هونەرمەندەکێ مەزن بشێت کاریگەریێ ل سەر هونەرێ سەردەمێ خۆ یان پشتی خۆ بکەت، لێ مەرج نینە هونەرمەندەکێ شێوەکاری بشێت کاریگەریێ ل سەر هونەرێ موزیکێ یان بوارێ ئەدەبی و داهێنانێن زانستی و بوارێن دی یێن مرۆڤایەتیێ بکەت، ئەم دشێن ڤێ ئاخفتنێ ژبۆ هوزانڤان و موزیکژەن و نڤیسەران ژی بێژین. ژبەر ڤێ چەندێ ژی ب تنێ ناڤێ هژمارەکا کێم یا ئەدیب و هونەرمەندان دناڤ ڤێ لیستێ دا هاتینە و ناڤێن وان دناڤ هەر 30 کەسێن دەستپێکێ نەهاتینە دانان.

لێ دبیت هندەك کەس پرسیار بکەن بوچی ناڤێن هونەرمەندان دناڤ ڤێ لیستێ دا هاتینە؟

ئەگەرێ ڤێ چەندێ بۆ هندێ دزڤڕیت کو هونەری کاریگەریەکا ڕاستەخۆ ل سەر وی کەسی هەیە یێ حەز ژ هونەری بکەت، مرۆڤ هندەکێ ژ دەمێ ب تەماشەکرنا کەڤالێن هونەری و شانوگەریان و گوهدانا مزیك و سترانانڤە د بورینیت یانژی هندەك داستان و هوزانان دخوینیت، لێ ژبەرکو ژیانا مرۆڤان هەمی ب هونەری ڤی یا گرێدای نینە لەوڕا کاریگەریا وان ژی وەکی یا داهێنانێن سیاسی و کاودانێن سیاسی و ژیانا ئولی ڤە کێمترە.

گومان تێدا نینە کو شکسپیر ژ گەلەك هوزانڤان و ئەدیبێن دی مەزنتر وکاریگەرتر بوویە وەك هۆمیروس و چوسر و فرجیلی، دبیت کەسی بەرهەمێن ڤان کەسان نەخوینیت یان ل دویڤ نەچیت ئەگەر تایبەتمەندیا وی نەبیت، لێ بەروڤاژی ڕەنگە کەس ژمە نەبیت شانوگەریەکا شکسپیری نەدیت بیت یان تەماشەی فلمەکێ سینەمایی یێ ل سەر شانوگەریێن وی هاتینە چێکرین نەکربیت.

ژبلی ڤێ چەندێ ژی شکسپیری چەندین گوتن وپەیڤێن جوان و پڕی ڕامان ل پشت خۆ هێلاینە و خەلك ڕۆژانە ڤان گوتنێن وی د ڤەگۆهێرن بێی کو بزانن کا خۆدانێ ڤان

گوتنان کیە. سەرەڕای بورینا چەندین سالاًن ل سەر مرنا ویژی لێ هەتا سەردەمێ ئەڤروکەژی کارێن وی ب بەدەوام دهێنە زیندیکرن و خەلك تەماشەی شانوگەرییێن وی دکەن.

هەژی گوتنێ یە کو شکسپیری کارێن خۆ ب زمانێ ئینگلیزی دنڤێسان، لێ کارێن وی یێن هونەری و شانوگەرییێن وی ژبۆ پتریا زمانێن جیهانی هاتینە وەرگێڕان.

گەلەك ئەدیب و هونەرمەند هەنە کارێن وان کەفتینە بەر ڕەخنەییێن دژوار و ڕەخنەگران بوچوونێن جوداجودا ل سەر هەبووینە، لێ ب تنێ شکسپیر نەبیت کو کێمتر کەفتیە بەر پێلێن ڕەخنەکران، بەروڤاژی کارێن وی بووینە ئەگەر ڕێزەکا مەزن لێ بهێتە گرتن و گەلەك بەرەباکان کارێن وی یێن هونەری خواندینە و تا ئەڤروکەژی کارێن وی بابەیتێن سەرەکینە ل پەیمانگەهە و ناڤەندێن هونەری. ژبەر ڤێ کاریگەریا وی یا مەزن و ناڤودەنگیا وی یا بەرفەرەهە مە ناڤێ شکسپیری دانایە دگەل کەسێن کاریگەر د دیروکێ دا.

## 32. جۆن دالتۆن John Dalton

## ( 1844 ـ 1766 )

### دالتۆن

### ئەو زانایێ ئێکەم تیورا ئەتومان دانای

جۆن دالتۆن ئەو زانایێ بەریتانی بوو یێ بۆ ئێکەم جار تیورا گەردی "ئەتوم" ئینایە دناڤ ڤەکۆلینێن زانستی دا، ژ هینگێ وەرە ئەتوم بووینە کلیلکێن پێشکەفتنا زانستێ کیمیایێ.

دالتۆن ئێکەم کەس نەبوو یێ دیارکری کو هەر کەرەستەك ژ هندەك دندكێن گەلەك بچووك پێکدهێت تا وی ڕادەی کو ئێدی ئەڤ دندکە ناهێنە پرت پرت کرن کو ئەوژی ئەتومێن وی کەرەستەینە، بەری وی گەلەك فەیلەسوفان ئەڤ چەندە دیارکربوو ب تایبەت فەیلەسوفێ مەزن دیموکریتس (460 – 370 ب.ز)ی زێدەباری گەلەك زانا و فەیلەسوفێن دی یێن کەڤن.

هەردیسان ئەتوم ئێك بوو ژ وان تیوران یێن فەیلەسوفێ گریکی "ئەبیقور"ی پشت بەستن دکریە سەر دکارێن خۆ یێن زانستی دا، بەری ڤان فەیلەسوفان ژی نڤیسەرێ ڕۆمانی یێ ناڤدار "لوکرشیوس" ئەوێ ل سالا 550 ب.ز وەغەرکری د هوزانەکا خۆ دا بەحسێ ڤێ چەندێ کر بوو ب ناڤێ "سروشتێ تشتان".

ئەو تیورا ئەتومێ یا دیموکریتسی پشت بەستن دکریە سەر، بەری وی ژلایێ ئەڕستۆی ژی دهاتە بکارئینان، لێ ب درێژاهیا چەرخێن ناڤین ئەڤ تیورە یا بەرزەبوو لەوڕا چ کارتێکرن ل سەر پێشکەفتنا زانستێ سەردەم نەبوو، لێ دگەل هندێ ژی گەلەك زانایێن چەرخێ هەڤدێ پشتەڤانیا تیورا ئەتومێ دکر ب تایبەت زانایێ مەزن ئیسحاق نیوتنی لێ دگەل هندێ ژی هەتا وی سەردەمی چ تیورێن ئێکگرتنی نەبوون کو ب شێوەیەکێ بابەتی سەرەدەریێ دگەل ئەتومان بکەت و شرۆڤە بکەت، هەردیسان کەس نەشیابوو پەیوەندیا

دناڤبەرا ئەو وێنەیێ فەلسەفی یێ بۆ ئەتومێ دهاتە دانان دگەل سروشتێ زانستێ کیمیایێ ڕوهن بکەت.

دالتۆن ئێکەم کەس بوو یێ شیایی ڤێ چەندێ بکەت، ڤی زانای شیا ب شێوەیەکێ زانستی بەحسێ ئەتومێ بکەت و پێکهاتنا وێ شرۆڤە بکەت، هەردیسان ب ڕێکا وێ شیا کارلێکێن کیمیایی ژی شرۆڤەبکەت و وی ئەڤ چەندە د تاقیکرنێن خۆ یێن زانستی دا دووپات کر.

هەرچەندە ئەو شێوازێ دالتۆنی بکادرئینا بۆ شرۆڤەکرنا چالاکیا ئەتومێ و لڤینێن ئەتومان گەلەك ژ وی شێوازی یێ جودایە یێ سەردەمێ ئەڤروکە دهێتە بکارئینان، وی هندەك پەیڤێن وەکی گەرد، گەردیلە، تۆخم و پێکهاتەیێن کیمیایی بکاردئینان.

هەردیسان وی دیاکر هەرچەندە هژمارا ئەتومان دناڤ فەلەکێ دا ناهێنە هەژمارتن لێ جورێن ئەتومان دسنوردارن، دالتۆنی ئاماژی ب بیست تۆخمێن کیمیایی یان جورێن ئەتومان کربوو، لێ دڕاستی ل سەردەمێ ئەڤروکەدا پتر 100 جورێن ئەتومان (تۆخمێن کیمیایی) هاتینە ئاشکەرا کرن.

هەردیسان سەنگا ئەتومان د ژێکجوودانە، هەر دوو ئەتومێن ئێك جورێ تۆخمێ کیمیایی سەنگا وان هندی ئێکە و هەمی تایبەتمەندیێن وان ژی د وەکهەڤن، هەردیسان دالتۆن شیابوو جوداهیا دناڤبەرا ئەتومێن جوداجودا تومارکبەت، ئەڤ چەندە ژی ئێکەم جاربوو د دیروکێ دا زانایەك بشێت جوداهیێن جوری و چەندێتی یێن ئەتومان تومارکبەت.

دالتۆن شیا یاسایێن تیورا دەربارەی ئەتومێ و پێکهاتەیێن کیمیایی ب باشی شرۆڤە بکەت ب ڕەنگەکێ هوسا پشتی بورینا 20 سالان ئێدی ئەڤ یاسایە بوونە بنەمایەکێ ب هێز د زانستێ کیمیایی یێ سەردەم دا، ڤان یاسایان دەربڕین ژ سەنگا جوری یا ئەتومان و شرۆڤەبوونا پێکهاتەیێن کیمیایی و زانینا پێکهاتنا ئەتومان یێن هەر تۆخمەکی دکر.

پشتی دیاربکرنا ڕۆلێ ئەتومان ئێدی پێدڤی ناکەت ئەم ب درێژاهی ل سەر باخڤین چونکی ل سەردەمێ ئەڤروکی ئەتوم بووینە بابەتێ سەرەکی یێ زانستێن کیمیا و فیزیایێ، لێ دانانا ناڤێ دالتۆنی ل ڤی جهی بۆ هندێ دزڤڕیت کو بەری وی گەلەك کەسان ب درێژاهی بەحسێ ئەتومان کربوو.

جۆن دالتۆن ل سالا 1766 ل گوندێ ئینگلیزفێلد ل باکورێ وەلاتێ ئینگلتەرا ژدایکبوویە، دژیێ 11 سالێیێ دا خواندن ب دوماهی ئینا و پاشی ل سەر خواندنا پەرتووکان یێ بەردەوام بوو، دەمێ ژیێ وی بوویە 26 سال چوو باژێرێ مانچیستەر و هەتا مری ل وێرێ ژیا لێ ژیانا هەڤژینیێ پێکنەئینابوو.

ل سالا 1787 دالتۆنی دەست ب خواندنا ستێر و ئەختەران کرو پاشی پەرتووکەك ل دور بەلاڤکر، پاشی هندەك ڤەکۆلین ل سەر هەوایی و گازان کرن وبزاڤ دکر پێکهاتنا هەوایی دیاربکەت و ڤێ چەندێ هاریکاریا وی کر دوو یاسایان ب دارێژیت یێن کو کونترولێ ل سەر لڤینا گازان دکەن.

ل سالا 1801 دالتۆنی دیارکر کو ئەو قەبارێ گازێ یێ دبیتە ئاگر دگەل پلا گەرماتیا وێ دگونجیت، ئەڤ یاسایە یا ناڤدار بوو ب یاسا شارلی، شارل زانایەکێ فرەنسی بوو بەری دالتۆنی ئەڤ یاسایە دانابوو لێ وەغەکر و نەگەهشت ڤێ یاسایا خۆ بەلاڤ کەت و بۆ خەلکێ شرۆڤە بکەت. یاسایا دوێ یا دالتۆنی د هەمان سالێدا بەلاڤکر کو یا ناڤدار بوو ب یاسایا فشارا پارچەیی.

ل سالا 1804 دالتۆن دووبارە ل تیورا ئەتومێ زڤڕی و لیستەکا سەنگێن ئەتومان د پەرتووکەکێ دا بەلاڤکرن ب ناڤێ "سیستەمەکێ نوو ژبۆ فەلسەفەیا کیمیایی" لێ ئەڤ پەرتووکە ل سالا 1808 شنی هاتە بەلاڤکرن و بوو ئەگەرێ ناڤداربوونا وی و گەلەك ناسناڤ و دیاری ژبەر ڤێ پەرتووکێ وەرگرتن.

تشتێ سەیر د ژیانا دالتۆنی دا ئەوبوو کو وی نەخۆشیا کورەبوونا ڕەنگان[1] هەبوو، ڤێ چەندێ ئەو پالێدا ڤەکۆلینەکێ ل دور ڤێ چەندێ بکەت کا بوچی ئەو نەشێت هەمی ڕەنگان ب دروستاهی ببینیت، ئەڤ ڤەکۆلینا وی دهێتە هەژمارتن ئێکەم ڤەکۆلین د دیروکێ دا دەربارەی نەخۆشیا کورەبوونا ڕەنگان.

---

[1] نەخۆشیا کورەبوونا ڕەنگان نەخۆشیەکا بۆماوەیی تووشی هندەك کەسان دبیتن کەسێن توشوبووی نەشێن جوداهیێ دناڤبەرا هندەك ڕەنگاندا بکەن بۆ نموونە دبیت ڕەنگێ شین ل جهێ ڕەنگێ کەسك ببینیت یانژی ڕەنگی سۆر ل جهێ ڕەنگەکێ دی ببینیت.

# 33. ئەسکسندەرێ مەزن Alexander the Great

## (356 ب.ز. – 323ب.ز.)

### ئەسکەندەرێ مەزن

### ئەو سەرکردێ شیایی شارستانییێن گریکی و فارسی بکەتە ئێک

ئەسکەندەرێ مەقدوونی دهێتە نیاسین وەك ناڤودەنگترین شەرڤکەر د دیروکێ دا، ل سالا 356 بەری زاینی ل باژێرێ "بێلا" پایتەختێ مەقدونیا ژدایکبوویە. بابێ وی فیلیپ، دووەم شاهێ مەقدونیا بوو و ژبەرکو کەسەکێ زیرەك و چەلەنگ بوو لەورا شیابوو سنورێن شانشینا خۆ گەلەك بەرفرەهـ بکەت و لەشکەرەکێ ب هێز دروست بکەت.

ل دەستپێکێ بابێ ب هاریکاریا لەشکەرێ خۆ شیا شەرێ وەلاتێن دەوروبەری خۆ بکەت ب تایبەت یێن دکەفتینە باکورێ یونانێ و ل دووڤدا بریاردا شەرێ ئیمپراتۆریا فارسان بکەت لەورا ژی ل سالا 336 بەری زاینی هێرشەك دەستپێکر لێ دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 46 سالیێ هاتیە کوشتن ل وی دەمی ژیێ ئەسکەندەری ب تنێ 20 سال بوون و ب سانەهی شیا ببیتە میراتگرێ بابێ خۆ ژبەرکو بەری هینگێ هەمی بەرهەڤی ژبۆ هاتبوونە کرن و شارەزاییەکا لەشکەری یا مەزن پەیداکربوو.

هەردیسان بابێ وی ئەو ژلایێ ڕەوشەنبیرکرنا مێشکی ژی ڤە ژبیرنەکربوو لەورا باشترین فەیلەسوفێ وی سەردەمی کو ئەرستۆ بوو کربوو ماموستایێ وی.

پشتی مرنا بابێ وی فیلیپی، یونانێ و وەلاتێن دی یێن بچووك یێن ژێر دەستهەلاتا ویڤە هزرکر ئەڤە باشترین دەلیڤەیە بۆ وان ژبن کونترۆلا مەقدونیا دەرکەڤن، لێ ل دوو سالێن ل دویڤدا ئەسکەندەر شیا ب تەمامی دەستێ خۆ بدانتە سەر ڤان دەڤەران و ب پارێزیت و خۆ ژبۆ شەرێ ئیمپراتۆریا فارسان ئامادەبکەت کو ل وی دەمی دەستهەلاتا وان ژ دەریا سپی هەتا هندێ یا بەربەلاڤبوو.

هەرچەندە ل وی سەردەمی ئەڤ ئیمپراتۆریە نە د گوپیتکا هێزا خۆدا بوو لێ دگەب هندێ ژی ب هێزترین و مەزنترین و زەنگینترین ئیمپراتۆری بوو ل سەر ڕۆیێ ئەردی.

پشتی هینگێ ئەسکسندەری بریارا دا ل سالا 334 بەری زاینی هێرشەکێ بکەتە سەر ڤێ ئیمپراتۆریێ و نێزیکی 34 هزار سەربازان دگەل خۆ برن لێ هژمارەکا مەزن یا لەشکری ل پشت خۆژی هێلا. هەرچەندە هژمارا ڤان سەربازان ب هەڤبەرکرن دگەل لەشکەرێ فارسان گەلەگ یێ کێمبوو لێ ئەسکەندەر شیا سەرکەفتنێ د هەمی شەڕێن دژی ئیمپراتۆیا فارسان تۆماربکەت.

سەرکەفتنا لەشەکرێ ئەسکەندەری ب وێ هژمارا کێمڤە ل سەر ئیمپراتۆیا فارسان ژبۆ سێ ئەگران دزڤڕیت:

- ئێك: ئەو لەشکەرێ بابێ وی فیلیپی ل پشت خۆ هێلای گەلەك یێ ڕێکخستی و ب هێز و خۆدان سەربوربوو وبەری هینگێ بەشداری د چەندین شەڕان دا کربوو.
- دوو: ئەسکەندەر کەسەکێ بیرتیژ و چەلەنگ بوو و لبەر دەستێ ناڤدارترین فەیلەسوفێ چاخێ خۆ مەزن ببوو.
- سێ: چاڤنەترسیا وی یا بێ وێنە د شەڕان دا، ئەسکەندەری بەردەوام سەرکێشیا لەشکەرێ خۆ دکر و ل پێشیا وان بوو و ڤێ چەندێ ژی مەترسیەکا مەزن ل سەر ژیانا وی هەبوو لەوڕا ژی د گەلەك شەڕان دا ئەو بریندار دبوو لێ ڤێ چەندێ کارتێکرنەکا ئەرێنی ل سەر دەروونێ لەشکەرێ وی هەبوو.

ل دەستپێکێ ئەسکەندەرێ مەزن هێرشێن خۆ بەرەڤ وەلاتێ ئاسیا بچووك[1] ئینااین و هێرشکرە سەر وان هێزێن فارسی یێن کەفتینە د ڕێکا ویدا، ل دویڤدا بەرەڤ سوریێ چوو و لەشکەرێ فارسان ل وێرێ ژی شکان و پاشی بەرەڤ باشوری چوو و نێزیکی حەفت هەیڤان بازێرێ سۆر[2] دورپێچکر و د ڤی ماوەی دا نامەك ژ دەڤ ئیمپراتۆرێ فارسان گەشتە وی و داخازا ئاشتیێ ژێکر بەرامبەر نیڤەکا ئیمپرتۆریا فارسان.

---

[1] ئاسیا بچویک ئانکو وەلاتێ تورکیا یێ ئەڤرۆکە

[2] بازێرێ سۆر ئەڤرۆکە دکەڤیتە وەلاتێ لوبنانێ

ل وی سەردەمی ئێك ژ سەركردێن لەشكەرێ ئەسكەندەری ب ناڤێ "بارمینو"ی گوت ئەگەر ئەز ل جهێ ئەسكەندەری بام دا ڤێ داخازیێ قەبیل كەم، لێ ئەسكەندەری ژی بەرسڤا وی دا و گوت ئەگەر ئەز ژی ل جهێ بارمینوو بامە دا ڤێ چەندێ قەبیل كەم، لەورا وی ئەڤ چەندە ڕەتكر وپاشی بەرەڤ باژێرێ "غەزە" چوو و داگیركر و ل دویڤدا بێ شەڕ وەلاتێ مسرێ ژی داگیركر و بریاردا بۆ ماوەیەكی بێهنا لەشكەرێ خۆ ل ل مسرێ ڤەدەت. ل وی دەمی ب تنێ ژیێ وی 24 سالێ بوون.

ل دویڤدا هێزێن خۆ ڕێكخستن بەرەڤ ئاسیا ب ڕێكەفت و ل دەڤەرا ئەربیلێ[3] د شەڕكێ مەزندا دگەل هێزێن فارسان ل سالا 331 بەری زاینی سەركەفتنەكا مەزن تۆماركر و ئیمپراتۆریا فارسان شكاند.

پشتی ڤێ سەركەفتنێ بەرەڤ باژێرێن بابل و سوس و برسیولیس ڤە چوو، ل ڤی دەمی سەركردێن لەشكرێ فارسی شاهێ خۆ "واریوسێ سیێ" ل سالا 330 بەری زاینی كوشت داكو خۆ ب دەست ئەسكەندەری ڤە نەبەردەت. لێ دگەل هندێ ژی ئەسكەندەر شیا هەمی هێزێن فارسی بشكێنیت و شاهێ وان یی ئنوو ژی سێدارە بدەت و پشتی سێ سالا شیان ب ئێكجاری هەمی عەردێ ئیرانێ و ئاسیا ناڤەڕاست داگیربكەت.

پشتی ژناڤبرنا ئیمپراتۆریا فارسان ل وی دەمی ئەسكەندەر دشیا دووبارە زڤڕیتەڤە وەلاتێ خۆ و ئاریشێن خۆ یێن ناڤخۆیی چارەسەربكەت لێ حەزا وی یا بەردەوام بۆ شەڕان و سەركەفتنان بەرێ وی دا ئەڤگانستانێ و ل دویڤدا بەرەڤ هندێ چوو و چەندین دەڤەرێن وێ داگیركرن، لێ لەشكەرێ وی یێ واستیای ئێدی بریاردا زێدەتر شەڕی نەكەن لەورا ئەسكەندەر نەچاربوو ب زڤڕیتەڤە وەلاتێ فارسان.

پشتی ئەسكەندەر زڤڕیە وەلاتێ فارسان دەست ب ڕێكخستنا ئیمپراتۆریا خۆ كر، ژبەركو بەری هینگێ هوسا ژ ماموستاییێ خۆ ئەڕستۆی فێربوو كو شارستانیا گریكی شارستانیا ئێكانەیە ل جیهانێ و مللەتێن دی هەمی دڕندەنە، لێ دگەل هندێ وی دیت كو فارس نە مللەتەكێ دڕندەنە بەلكو مرۆڤێن ڕەوشەنبیرو زیرەك یێ دناڤدا و هەژی ڕێزگرتنێ نە لەورا وی بریاردا ئەو هەردوو شارستانییێن گریكی و فارسی بكەتە ئێك و

---

[3] ئەربیل یانژی ئەربائیلو ئەڤرۆكە پایتەختێ هەرێما كوردستانێ یە.

بریاردا دهواتەکا ب کوم بهێـتە ئەنجامدان و ب هزارەها کچێن فارسی ل لەشکەرێ خۆ مارکرن و وی ب خۆژی کچەکا شاهـ داریوسی ل خۆ مارکر.

هەرچەندە ئەسکەندەری پلانەك دانابوو داکو هێرشێ بکەتە سەر گزیرتا عەرەبان و ڕۆما و قرتاجە و ڕۆژئاڤایێ دەریا سپی، لێ ل سالا 232 بەری زاینی ل باژێرێ بابل تووشی تایەکا دژوار بوو و پشتی 10 ڕۆژان د ژیێ 33 سالیێ دا گیانێ خۆ ژدەستدا، لێ ژبەرکو چ کەسێن زیرەك ل پشت وی نەمابوون لەوڕا هەر زوی ئیمپراتۆریا وی دناڤبەرا سەرکردێن وی یێن لەشکەریدا هاتە دابەشکرن و دەیکا وی و خێزان و زاروکێن وی هاتنە کوشتن.

ئەسکەندەرێ مەقدوونی هەرچەندە کەسەکێ دلنازك و نەرم بووم دگەل دوژمنێن خۆ لێ دگەل هندێ کەسەکێ سەرڕەق و هاربوو ، ڕۆژەکێ دەمێ یێ سەرخۆش هەڤالەکێ خۆ یێ نێزیك ب ناڤێ کلاتیوس کوشت کو بەری هینگێ وی هەڤالێ ژیانا وی ژ مرنێ قۆرتالکربوو.

ئێك ژ مەزنترین کارێن ئەسکەندەری کرین ئەوبوو شیا شارستیانا گریکی و شارستانیا فارسان ل ئاسیا نێزیکی ئێك بکەت و ئەڤ نێزیکبوونە بوو ئەگەرێ زەنگیبوونا هەردوو شارستانیان و پشتا مرنا ویژی هێدی هێدی شارستانیا گریکی بەربەلاڤبوو و هاتە ڤەگوهاستن ژبۆ وەلاتێن سوریا و عیراق و فلەستین و مسرێ.

د ماوێ شەڕێن خۆدا ئەسکەندەرێ مەقدوونی چەندین باژێر ئاڤاکرن و باژێرێ ژ هەمیان ناڤداتر باژێرێ ئەسکەندەریە بوو ل وەلاتێ مسرێ کو هەر زوی بۆ ئێك ژ مەزنترین باژێرێن دونیایێ و سەنتەرێ ڕەوشەنبیری و خواندنێ، زێدەباری ئاڤاکرنا باژێرێ هیرات ل ئەڤگانستانێ.

## 34. ناپولیون بۆناپەرت Napoleon Bonaperte

## (1769ز-1821ز.)

### ناپولیون بۆناپەرت

### ئەو سەرکردێ لەشکەری یێ د دیروکێ دا دووبارە نەبووی

ئیمپراتۆرێ فرەنسی یێ ناڤدار ناپولیون بۆناپەرت ل سالا 1769 زاینی ل باژێرێ "ئاجاکسیو" ل گزیرتا "کۆرسیکا" ژدایکبوویە، بەری ژدایکبوونا وی ب 15 هەیڤان ئەڤ گزیرتە ژلایێ فرەنسا هاتبوو داگیرکرن لەورا هەر ژ بچووکاتی کەسەکێ نیشتیمانپەوەر و تۆندرەو بوو و بەردەوام ئەو چەندە ل بیرا وی بوو کو فرەنسا وەلاتێ وی یێ داگیرکری. لێ دگەل هندێ ژی خێزانا وی ئەو فرێکربوو ئەکادیمیا لەشکەری ل فرەنسا، ل سالا 1785 د ژیێ 16 سالیێ دا ب پلەیا ملازمێ دووێ دەرچوو.

پشتی چوار سالان ژ دەرچوونا وی شۆرەشا فرەنسی دەستپێکر و ل سالێن ل دویڤدا فرەنسا تووشی چەندین شەرێن خویناوی بوو دگەل وەلاتێن دی.

ل وی دەمی دەلیڤە ژبۆ ناپولیونی هەلکەفت دەمێ فرەنسیا ل سالا 1793 باژێرێ "تۆلۆن" دورپێچکری و ژ دەستێن برێتانیان رزگارکری. ناپولیون سەرکێشێ چەکێ توپاهاڤێژێ بوو، هەر ل وی دەمی دەست ژ تۆندرەویا خۆ بەردا و بوو کەسەکێ فرەنسی یێ دلسوز، زیرەکیا ناپولیونی دناڤ لەشکەری دا و پاشقەبرنا هێزێن برێتانی هەر زوی بوونە ئەگەر خەلك رێزەکا مەزن لێ بگریت و پلەیا وی بهێتە بلندکرن. ل سالا 1796 بوو سەرکردێ لەشکەرێ فرەنسی ل ئیتالیا و گەلەك سەرکەفتنێن مەزن تومارکرن و ل دویڤدا زڤری باژێرێ پاریس.

ل سالا 1798 ناپولیونی هەوا خۆ یا مەزن ل سەر مسرێ دەستپێکر، ئەڤ هەوە کارەساتەکا مەزن بوو، هەرچەندە هێزێن وی یێن سەر هشکاتی د سەرکەفتی بوون، لێ پاپۆرێن وی یێن دەریایی ژلایێ لەشکەرێ برێتانی ب سەرکێشیا "نیلسۆن"ی تووشی

شکەستنێ بوو. لەوڕا ل سالا 1799 ناپولیونی هێزێن خۆ هێلانە ل مسڕێ و ئەو زڤڕی فڕەنسا.

ل فڕەنسا ناپولیونی هەست ب هندێ گر کو هێشتا خەلك یێ هزرا سەرکەفتنێن وی یێن ئەورۆپی دکەت و کەسێ ئاگەهـ ژ شکەستنا پاپۆرێن وی ل مسڕێ و ئەسکەندەریە نینە، پشتی چەند هەیڤەکا ناپیلونی دگەل کومەکا هەڤالێن خۆ پشکداری د کودەتەیەکا لەشکەری دا کر و حکومەتەکا نوو پێکئینا و ناپولیون بۆ کونسلێ ئێکێ، پشتی هینگێ دەستورێ نوو یێ وەلاتی هاتە دانان و د ڕاپرسینەکێ دا خەلکی دەنگێ خۆ دایێ لێ هەر زوی ئەڤ دەستورە بەرەڤ دکتاتورییێڤە چوو و دەلیڤە ژبۆ ناپولیونی هەلکەفت کونترۆلێ ل سەر هەمی دوژمێن خۆ بکەت و خۆ بگەهینتە کورسیکا دەستهەلاتێ.

ل سالا 1793 و بەری کو باژێرێ تۆلۆن بهێتە دورپێچکرن، ناپولیون گەنجەکێ ڤەشارتی بوو و ناسناما وی یا دیارنەبوو، هەرچەندە فڕەنسیەکێ ڕەسەن نەبوو لێ پشتی هینگێ ب شەش سالان ئانکو دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 30 سالیێ شیا بێی هەڤڕکی ببیتە دەستهەلاتدارێ فڕەنسا و بۆ ماوێ 14 سالان ما ل سەر کورسیکا دەستهەلاتێ.

د ماوێ دەستهەلاتا خۆدا، ناپولیونی چەندین گوهۆرینێن ڕیشەیی ئەنجامدان ب تایبەت د بوارێ سیستەمێ یاسادانانێ دا، ل دویڤدا شیا سیستەمێ دارایی و قەزایی یێ دەولەتێ چاك بکەت و پاشی بەنك و زانکۆیا فڕەنسا دامەزراند و دەستهەلاتا دەولەتێ کرە دەستهەلاتەکا ناڤەندی. هەرچەندە ڤان گوهۆرینان کاریگەریەکا مەزن ل سەر فڕەنسا هەبوو لێ چ گوهۆرینێن بەرچاڤ ل سەر جیهانێ نەبوون.

لێ گوهۆرینەکا ناپولیونی کاریگەریەکا مەزن ل سەر جیهانێ هەبوو ئەوژی "دەستورێ ناپولیونی"بوو، ژبەرکو ڤی دەستوری هەمی بنەماییێن شۆڕەشا فڕەنسی هەمبێزکربوون، دڤی دەستوری دا هوسا هاتبوو دیارکرن کو هەمی خەلك د وەکهەڤ و یەکسانن د هەمی ئەرك و مافاندا، دوور ژ بنەمایێ ژ ڕەگەز و جور و ڕەنگێ وان.

ئەڤ دەستورە یێ هەڤسەنگ بوو و ب شێوەیەکێ گەلەك ڕۆهن و ئاشکەرا هاتبوو نڤێسین. ئەڤ دەستورە نە ب تنێ ل فڕەنسا بەلکو ل جیهانێ هەمیێ هاتە ب جهئینان، ئەم دشێن بێژین دەستورێ وەلاتێ فڕەنسا یێ سەردەمێ ئەڤروکە چ جوداهیێن مەزن ژ دەستورێ ناپولیونی نینن.

سیاسەتا ناپولیونی ئەوبوو کو وی بەردەوام دووپاتی ل هندێ دکر ئەو پارێزڤانێ شۆڕەشا فڕەنسیە، لێ دگەل هندێ ژی وی ب خۆ ل سالا 1804 خۆ کرە ئیمپراتۆرێ فڕەنسا و سێ برایێن خۆ کرنە شاهێن وەلاتێن ئەوروپی و ڤێ چەندێ ژی نەڕازیبونەکا مەزن ل ناڤ خەلکی پەیداکر ژبەرکو وان هزرکر ئەڤ چەندە خیانەتە ل شۆڕەشا فڕەنسی، لێ ئەڤێ چەندێ چ مەترسی ل سەر ناپولیونی پەیدانەکر بەلکو مەترسیا مەزن ئەوبوو یا ژ ئەگەرێ شەڕێن وی دگەل وەلاتێن بیانی پەیدابووی.

ل سالا 1802 ناپولیونی ڕێکەفتنەکا ئاشتیێ دگەل ئینگلتەرا ل باژێێ "ئامین" ئیمزاکر، لێ پشتی سالەکێ ل سەر بورینا ڤێ ڕێکەفتنامێ فڕەنسا تووشی هژمارەکا شەڕان بوو دگەل بڕیتانیا و وەلاتێن دی، هەرچەندە ناپولیون شیا سەرکەفتنێ د پتریا شەڕێن سەر هشکاتی دا توماربکەت لێ پاپۆرێن وی یێن دەریایی ل سالا 1805 ژلایێ لەشکەرێ بڕیتانیڤە تووشی شکەستنێ بوون، ئینگلتەرا شیا کونترۆلەکا بێ سنور ل سەر دەریایێ بکەت، هەرچەندە پشتی هینگێ ب شەش هەیڤان ناپولیون شیا سەرکەفتنێ ل سەر لەشکەرێ نەمسا و ڕۆسیا توماربکەت ژی لێ ڤێ سەرکەفتنێ نەشیا شکەستنا وی یا دەریایی ڤەشێریت.

سەرگەرمیا ناپولیونی بوو ئەگەر ل سالا 1818 هێرشێ بکەتە سەر ئیسپانیا و ئەڤ شەڕە بوونە ئەگەر ئەو لەشکەرێ فڕەنسی تووشی شکەستنەکا مەزن بکەت ژبەرکو بۆ ماوەیەکێ درێژ ڤی شەڕی ڤەکێشا. لێ مەزنترین شاشیا وی ئەوبوو دەمێ شەڕ دژی ڕۆسیا ڕاگەهاندی، ل سالا 1807 ناپولیون و قەیسەرێ ڕۆسی یێ وی سەردەمی ل باژێرێ "تلیست" هەڤدیتنەك کر و هەردووکان سویند خوار هەڤالێنیەکا بەردەوام گرێدەن لێ ڤێ هەڤالێنیێ بۆ ماوەیەکێ درێژ نەڤەکێشا چونکی ل سالا 1812 ناپولیونی لەشکەرێ خۆ یێ مەزن برە ڕۆسیا و داگیرکر.

لەشکەرێ ڕۆسی خو تووشی چ شەڕان نەکر و هەر زوی پاشڤە زڤڕین لەوڕا ناپولیون ب سانەهی چوو دناڤ وەلاتێ ڕۆسیا دا و ل هەیڤا ئیلونێ باژێرێ موسکو داگیرکر لێ خەلکێ ڕۆسی بریاردا خۆ بدەستڤە نەبەردەن وباژێرێ خۆ سووت، هەرچەندە ناپولیونی نێزیکی پێنچ حەفتیان چاڤەرێی وان بوو خۆ ب دەستڤەبەردەن لێ خەلك ل سەر هەلویستێ خۆ یێ بەردەوام بوو لەوڕا ناپولیونی بریاردا خۆ ڤەکێشیت لێ ئەڤ بریارا وی یا

درەنگ بوو ژبەرکو ل وی دەمی گەلەك هەڤپەیمانی دژی وی هاتنە گرێدان. لەشکەرێ ڕۆسی دەست ب شەڕی کر و بارینا بەفرەکا مەزن ل سەنگەرێن شەڕی و نەمانا کەرەستێن خۆارنێ و چەکی، زیانەکا مەزن گەهاندە لەشکەرێ فرەنسا و پاشڤە زڤرین لێ ب تنێ 10٪ ژ لەشکەری شیان ڤورتال بن و یێن دی هەمی مرین.

ل دویڤدا وەلاتێن دی یێن ژێر داگیرکەرێن فرەنسا ئەڤ چەندە ب دەلیڤە دیت خۆ رزگاربکەن، وەلاتێن ڕۆسیا و نەمسا دژی ناپولیونی بوونە ئێك، ل سالا 1813 شەرەکێ مەزن ل دەڤەرا "لیبزج" پەیدابوو و لەشکەرێ ناپولیونی تێدا شکەت و هاتەگرتن و هنارتن بۆ گزیرتا "ئیلبا" ل نێزیك کنارێن ئیتالیا لێ ل سالا 1815 ناپولیون شیا ژ ڤێ گزیرتێ بڕەڤیت و بچیتە فرەنسا و پێشوازیەکا مەزن لێ هاتەکرن و شیا دووبارە هێزێن خۆ رێکبێخیت، لێ پشتی 100 ڕۆژان ژ دەستهەلاتا وی یا نوو وەلاتێن دی یێن ئەورۆپا شەر دژی وی ڕاگەهاند و د شەڕێ "واترلو" دا دیسان شکەت و ژلایێ هێزێن ئینگلیزی ڤە هاتە گرتن و ل گزیرتا "سانت هیلان" هاتە زیندانکرن کو گزیرتەکا بچووکە دکەڤیتە باشورێ زەریا ئەتلەنتی، ل سالا 1821 پشتی تووشی نەخۆشیا پەنجەشێرێ بووی گیانێ خۆ ژ دەستدا.

مێژوویا لەشکەری یا ناپولیونی یا پڕە ژ سەرکەفتنێن مەزن، ژبەرکو زانینەکا مەزن د ئەتەتیکێن شەری دا هەبوو کو چ وەکهەڤ وەکی وی د دیروکێ دا نەبووینە، ئەگەر ئەم ڤێ چەندێ بکەینە پیڤەر، ئەم دشێن بێژین کو ناپولیون مەزنترین سەرکردێ لەشکەری بوو د دیروکێ دا. لێ د ستراتیژیا شەری دا وی هندەك شاشیێن گەلەك مەزن کربوون ب تایبەت ل شەڕێ مسرێ و شەڕێ ڕۆسیا لەوڕا ئەڤ شاشیین وی دبنە ئەگەر ئەم ناڤێ وی نەدانینە دگەل سەرکردێن مەزن د دیروکێ دا ژبەرکو ژ پیڤەرێن مەزناهیێ ئەوە نابیت وی کەسی چ شاشیێن گەلەك مەزن کربن، لێ ژبەرکو مرۆڤ نزانیت کا ئەو سەرکردێن مەزن د دیروکێ دا تووشی ل دماهیێ تووشی شکەستنێ نەبووی چ د هزرا وان دابوو وەك ئەسکەندەرێ مەقدوونی و جەنگیزخان و تەیمور لەنگی. لێ ژبەرکو ناپولیون ل دوماهیێ تووشی شکەستنێ بوو لەوڕا بریاردان ل سەر سەرکەفتنێن وی بوویە بابەتێ گەنگەشە و گومانێ.

پشتی شکەستنا ناپولیونی ل سالا 1815، ئێدی فرەنسا ببوو خودانا عەردەکێ کێمتر ژ وی عەردێ بەری شۆرەشا فرەنسی ل سالا 1798 هەی.

ناپولیون کەسەکێ سەرگەرم بوو گەلەك حەز ژ مەزناهیێ دکر لەورا گەلەك کەس وی دگەل هێتلەری هەڤبەر دکەن لێ جوداهیەکا مەزن دناڤبەرا واندا هەبوو ژبەرکو هێتلەر یێ خودان فەلسەفەکا سادە بوو لێ ناپولیون کەسەکێ دەلیڤەبینێ خودان هیڤی بوو. لێ هژمارا لەشکەرێ دشەرێن ناپولیونی دا مرین نێزیکی نیڤ ملیون مرۆڤان بوون لێ هژمارا لەشکەرێ هێتلەری یێن هاتینە کوشتن پتر ژ هەشت ملیون مرۆڤان بوون.

ناپولیونی کارتێکرنەکا نەڕاستەخۆ ل سەر ئەمریکا لاتینی هەبوو ژبەرکو دەمێ شەرێ وەلاتێ فرەنسا بۆ چەندین سالاًن کری، ئەڤ شەرە ببوونە ئەگەر حکومەتا ئیسپانی ئاگەهـ ژ سەربازگەهێن خۆ ل کێشوەرێ ئەمریکا لاتینی نەمینیت و ب شەریڤە یا مژیل بیت.

ژ گرنگترین کارێن ناپولیونی ئەنجامداین ئەوبوو دەمێ ڕۆبەرەکێ مەزن یێ عەردی فروتیە ویلایەتێن ئێکگرتی یێن ئەمریکا ژبەرکو وی شیانێن کونترۆلکرنا ڤی عەردی دژی هێزێن دەریایی یێن ئینگلتەرا نەبوون، هەردیسان ئەو پێدڤی ب ژێدەرکێ دارایی ژی بوو، ئەڤ کریارا فروتنا عەردی د دیروکێ دا دهێتە نیاسین ب "سەوداگەریا لویزیانا" کو مەزنترین کریارا فروتنێ یە د دیروکێ دا و پشتی هینگێ ویلایەتێن ئەمریکا هاتە گوهۆرین بۆ کێشوەرەکی ئانکو بۆ وەلاتەکێ خودان کێشوەر.

دبیت بۆمە یا ب زەحمەت بیت هزرا خو بکەین کا ل سەردەمێ ئەڤروکە ئەمریکا دا ل چ ئاست بیت هەکە ئەڤ عەردە نەکریبا. هەرچەندە ناپولیونی ب تنێ دەست دگەل ڤێ فروتنا عەردی نەبوو بەلکو حکومەتا ئەمریکا ژی تا ڕادەیەکێ مەزن یا هاریکار بوو لێ فروتنا عەردێ لویزیانا تشتەك بوو کەسێ نەدووریا بەحسێ وێ بکەت ب تنێ زەلامەك نەبیت ئەوژی ناپولیون بوو.

# 35. تۆماس ئەدیسون Thomas Edison

## (1847ز-1931ز)

### تۆماس ئەدیسون

### ئەو زانایێ هەتا هەتایێ جیهان ڕۆهن كری

داهێنەرێ مەزن تۆماس ئەدیسون ل سالا 1847 زاینی ل باژێرێ میلانو ل ویلایەتا ئوهایو یا ئەمریكی ژدایكبوویە، وی ب تنێ ژبۆ ماوێ سێ هەیڤان ل خواندنگەهێن حكومی خواندیە، ماموستایێن وی ئەو ژ قوتابخانێ دەرێخست ژبەركو وان هزر دكر ئەو ژلایێ مێكشیڤە نەیێ تەمامە.

ئێكەم داهێنانا ئەدیسونی ل ژیێ 21 سالQیێ بوو دەمێ ئامیرەكێ كارەبایی دروستكری ژبۆ تومارکرنا دەنگان ل هەلبژارتنان لێ كەسێ چ گرنگی ب ڤێ داهێنانا وی نەدا، ڤێ چەندێ ئەو پالدا كارەكێ دی یێ مەزن بكەت كو بشێت ل بازاری بفرۆشیت و پارەیەكێ مەزن ژێ ب دەستڤەبینیت. ل دویڤدا وی ئامیرێ خۆاندنا پلێتێن شەمەندەفەران داهێنا و وی ئەڤ داهێنانا خۆ ب 40 هزار دولاران فرۆت كو ل وی دەمی پارەیەكێ گەلەك مەزن بوو.

ل دویڤدا وی چەندین داهێنانێن دی یێن مەزن ئەنجامدان كو بوونە ئەگەر ئەو ببیتە كەسەكێ زەنگین و ناڤدار، هەتا وی سەردەمی مەزنترین داهێنانا ئەدیسونی "فونوگراف" بوو كو ل سالا 1877 ب ناڤێ وی هاتبوو تومارکرن. لێ ناڤدارترین داهێنانا وی گلۆپا كارەبایی بوو ل سالا 1879.

هەرچەندە ئەدیسون ئێكەم كەس نەبوو بزاڤا دروستكرنا گلۆپەكا كارەبێ بكەت بەلكو گەلەك كەسان بەری وی بزاڤا ڤێ چەندێ كربوو بۆ نموونە بەری هینگێ هندەك گلۆپێن كارەبایی هاتبوونە دروستكرن ژبۆ ڕۆهنكرنا جادەیێن پاریسێ، لێ ئەو گلۆپا ئەدیسونی داهێنای دگەل وی سیستەمێ بەلاڤكرنا كارەبێ بوو ئەگەر ئێدی ب سانەهی گلۆپێن كارەبێ ل هەمی مالان بهێنە هەلكرن.

کومپیانیا ئەدیسون ل سالا 1882 ڕابوو ب بەرهەمئینانا کارەبێ بۆ باژێرێ نیویورك و ل دویڤدا هەر زوی گلوپێن کارەبێ ل ئەمریکا و جیهانێ بەلاڤبوون.

پشتی کو کارەب چوویە دناڤ هەمی مالاندا، ئەدیسونی بنەمایێ ڕاستەقینە ژبۆ پێشخستنا پیشەسازیێ دانان، زێدەباری بنەمایێن بەلاڤکرنا کارەبێ ب شێوەیەکێ دروست و بێ مەترسی هەتا کو کارەب بوویە ڕویدانەکا مەزن د دیروکا مرۆڤایەتیێ دا.

هەردیسان ئەدیسونی ڕۆل هەبوو د پێشخستنا کامیرێن سینەمایی دا زێدەباری هاریکاریا وی د داهێنانا تێلەفونێ دا ژبەرکو وی کەرەستێ کاربونی ب کارئینا کو دبیتە ئەگەرێ ڤەگۆهاستنا دەنگی. ئەدیسونی ئامیرێن تلیگراف و ئامیرێ نڤیسینێ داهێنان، زێدەباری بەرهەمئینانا پاتری یێن هشك و مایکرۆفونان. هەژی گوتنێ یە کو نێزیکی 1000 داهێنانان ب ناڤێ ئەدیسونی هاتینە تومارکرن کو چ کەسان د دیروکێ دا ئەڤ کارە نەکریە.

ئێك ژ ئەگەرێن سەرەکی یێن هاریکاریا ئەدیسونی کری ڤان داهێنانان هەمیان ئەنجامبدەت ئەوبوو کو هێشتا د ژیێ گەنجاتیێ دا بۆ خۆ کارگەهەکا بچووك ڤەکر و چەندین کرێکار وەك هاریکار ل دەڤ خۆ دابوونە کاری، ئەڤ کارگەهە وەك نموونە بوون ژبۆ وان کارگەهێن مەزن یێن پشتی هینگێ هاتینە دامەزراندن.

ناهێتە ڤەشارتن دروستکرنا ڤان کارگەهان و کارکرنا هژمارەکا مەزن یا خەلکی وەك ئێك تیم و گرۆپ دهێتە هژمارتن ئێك ژ مەزنترین داهێنانێن ئەدیسونی و ئێکە ژ نیشانێن پێشکەفتنێ و ئەڤ چەندە داهێنانا ئێکانەیە کو ناهێتە تومارکرن یان دزین.

ئەدیسون کەسەکێ داهێنەر ب تنێ نەبوو، بەلکو یێ هەڤپشك بوو دگەل هژمارەکا مەزن یا کارگەهێن پیشەسازی و ژ گرنگترین ڤان کومپانیان، کومپانیا جینیرال ئەلیکتریك بوو.

ئەدیسونی ب درێژاهیا ژیانا خۆ گازندە ژ هەستا گوهلێبوونا خۆ دکرن و ڤێ چەندێ هاریکاریا وی کر ئەو شیانێن خۆ هەمیان د کاری و شولکرنێ دا ب مەزێخیت و ب شێوەیەکێ تەمام ژ جیهانا دەرەکی دەرکەڤیت. ئەدیسونی د ژیانا خۆدا دوو جاران ژیانا هەڤژینیێ پێکئینا، هەڤژینا وی یا ئێکێ د ژیەکێ بچووك دا وەغەرکر و سێ زاروك هەبوون، لێ ئەدیسون ب خۆ ل سالا 1931 ل نیوجێرسی وەغەکر.

مە گومان ل سەر زیرەکی و مەزناهیا ئەدیسونی نینن و ئەم دشێن بێژین ئەو مەزنترین داهێنەر بوو د دیروکێ دا، لێ ئەگەر ئەم تەماشەی داهێنانێن وی یێن ئێک ل دویڤ ئێکێ بکەین دێ بینین کو گەلەك د مەزن نەبوون و کاریگەریەکا هەرە مەزن ل سەر هزرا مرۆڤایەتی و پیشەسازیێ نەبوو، بۆ نموونە بەری داهێنانا گلۆپێن کارەبایی، هندەك ژێدەرێن دی یێن ڕۆناهیێ هەبوون کو تێرا هندێ دکر خەلك ب سانەهی بشێت بخوینیت و جادەیان ڕۆهن بکەت وەك گلوپێن گازێ و شەماڵکان.

هەردیسان داهێنانا وی فۆنۆگراف گەلەك یا مەزن بوو لێ ئەم نەشێن بێژین بێی هەبوونا ڤێ داهێنانێ ژیان دا یا بزەحمەت بیت ژبەرکو نەدگەهشتە ئاستێ تێلەفون و ڕادیو و تێلەڤزیونێ، هەردیسان ل سەردەمێ ئەڤروکە ئەم گەهشتینە هندەك داهێنانێن دی ژبۆ تومارکرنا دەنگی بێی کو پێدڤی ب تۆمارکرنا دەنگی بین ل سەر وان دێسکێن دهێنە دانان دناڤ فونوگرافێ دا، ژبەرکو ئامڕازین ئەڤروکە پشت بەستنێ دکەنە سەر دێسکێن موگناتیسی و لێزەری لەوڕا بۆ سەردەمێ ئەڤروکە هەبوونا فۆنۆگرافێ نە گەلەك یا گرنگە.

ژبەر ڤێ چەندێ ئەم دشێن بێژین کو خۆ ئێك ژ داهێنانێن وی هند د مەزن نەبووینە هەتا ناڤێ وی بکەینە دناڤ لیستا کەسێن کاریگەردا، لێ ژبەرکو وی نێزیکی 1000 ئامیران داهێناینە و ئەڤ هژمارا مەزن یا داهێنانان ئەم پاڵداینە ناڤێ وی بدانینە دگەل کەسێن کاریکەر د دیروکێ دا لێ دگەل هندێ ژی ناڤێ وی ل بەری هندەك داهێنەرێن دی مە دانایە وەك داهێنەرێ ڕادیویێ مارکۆنی و داهێنەرێ تێلەفونێ گراهام بیلی.

## 36. ئەنتۆنی ڤان لیڤەنهۆك Antony Van Leeuwenhoek

## (1632ز-1723ز.)

### ڤان لیڤەنهۆك

### ئەو زانایێ ژبۆ ئێکەم جار جیهانا زیندەوەرێن هویر و میکرویان ئاشکەرا کری

ئەنتۆنی ڤان لیڤەنهۆنك یێ کو ژبۆ ئێکەم جار هەبوونا میکرۆب و زیندەوەرێن هویر ئاشکەراکری، ل سالا 1632 ل باژێرێ "دیفت" یێ هۆلەندی ژ خێزانەکا ناڤنجی و سادە ژدایکبوویە. وی ژیانا خۆ هەمی وەك فەرمانبەرەکێ بچووك و ئاسایی دناڤ حکومەتێ دا بوراندیە.

لێ ئەگەرێ ئاشکەراکرنا وی ژبۆ میکرۆبان بۆ هندێ دزڤڕیت ل وی سەردەمی نەیا ب سانەهی بوو کەسەك بشێت مایکرۆسکوپەکێ ژ جهەکێ گشتی یان کومپانیەکێ بکریت لەوڕا ئەو ڕابوو ب دەستێن خۆ مایکرۆسکوپەك چێکر داکو ژبۆ کارێن خۆ یێن تایبەت ب کاربینیت، هەرچەندە وی چ پێزانین ل سەر دروستکرنا ئاوێنە و هونەرێ دروستکرنا شویشەیان نەبوو، لێ دگەل هندێ ژی شیا هندەك ئاوێنەییان چێکەت و ب ڕێکەکێ هوسا ب دانیتە سەر ئێك و مایکرۆسکوپەکێ ژێ دروست بکەت کو هێزەکا مەزنکرنێ یا مەزن هەبوو، هەتا وی سەردەمی د شیانێن چ مایکرۆسکوپاندا نەبوو هند تشتان مەزن بکەت هندی وێ مایکرۆسکوپا لیڤەنهۆکی ژبۆ خۆ چێکری.

هەر ئێك ژ وان ئاوێنەیێن لیڤەنهۆکی چێکرین د شیا هەتا 270 جاران تشتان مەزنتر لێبکەت، ب ڤێ چەندێ ئەو شیا هندەك ئاوێنەیان دروست بکەت کو شیانێن مەزنکرنا وان بۆ تشتان گەلەك ژ ئاوێنەیێن دی ب چەند جارەکان باشتربوو.

لیڤەنهۆك کەسەکێ بێهنفرەه و خۆڕاگر و بیرتیژبوو و ب هویراتی تیبینیا تشتان دکر، ب ڤان ئاوێنەیێن وی دروستکرین شیا تەماشەی گەلەك تشتێن بچووك و هویر بکەت وەك داڤێن پرچا مرۆڤی و چپکێن خوینێ و چپکێن ئاڤێ و مێشومور و شانەیێن پیستێ

لەشێ مرۆڤی و هەستیکان، وی تیبینیی یێن خۆ ل سەر ڤان تشتان ب هویری د نڤێسان، هەردیسان ئەو تشتێ وی ل بن مایکرۆسکوپێ د دیتی وێنە دکر.

هەر ژ سالا 1673 وێڤە لیڤەنهۆکی تیبینی و وینەیێن وان تشتێن وی د دانایینە بن مایکرۆسکوپێ ژبۆ کۆمەلا شاهانە ل ئینگلتەرا فرێدکرن کو ل وی سەردەمی کۆمەلەکا زانستی یا ناڤداربوو ل جیهانێ هەمیێ، سەرەڕای هندێ کو ئەو نەچوبوو زانکۆیی و ژبلی زمانێ هۆلەندی چ زمانێن دیژی نەدزانین لێ هاتە هەلبژارتن وەك ئێك ژ ئەندامێن ڤێ کۆمەلێ ل سالا 1680، هەردیسان بۆ ئێك ژ ئەندامێن پەیامنێران ل ئەکادیمیا زانستی ل پاریسێ.

لیڤەنهۆکی د ژیانا خۆدا دوو جاران ژیانا هەڤژینیێ پێکئینا و شەش زاروك هەبوون. ساخلەمیا وی گەلەك یا باش بوو و تووشی چ نەخۆشیان نەبوو و هەتا بەری بمریت ب چەند دەمژمێرەکان ژی ب ساخلەمیەکا باش و لەشەکێ چالاك کاردکر، ل سەردەمی وی گەلەك ژ زانا و سیاسەتمەدار و ئەدیبان سەرەدانا وی ل مالێ دکر وەك قەیسەرێ ڕۆسی بۆتڕسێ مەزن و شاها ئینگلتەرا، دژیێ 70 سالێیێ دا هەر ل وی باژێری وەغەر کر یێ لێ ژدایکبووی.

لیڤەنهۆك ئێکەم کەس بوو پێکهاتنا سپێرمان[1] دیارکری، هەردیسان ئێکەم کەس بوو تەپکێن سۆر یێن خوینێ وەسفکرین، هەردیسان دژی تیورا ژدایکبوونا ژدەڤخۆ[2] ڕاوەستیا و چەندین بەلگەیێن زانستی ژبۆ ڤێ چەندێ دیارکرن، دیسان وی دیارکر کو کێچ ژی ب هەما ڕێك زێدەدبن یێن کو مێشومورێن ب پەڕ وەکی مێش و پێشی و پەلاتینکان پێ زێدەدبن.

لێ مەزنترین کارێ وی یێ زانستی ئەوبوو دەمێ ل سالا 1674 تیبینی یێن خۆ ل سەر میکرۆبان بەلاڤکرین کو دهێتە هەژمارتن مەزنترین داهێنان د دیروکا مرۆڤایەتیێ دا،

---

[1] سپێرم یانژی تووڤێ زەلامی، دناڤ هەر چپکەکا ئاڤا زەلامی دا ب ملیونەها سپێرم هەنە و پشتی کریارا سیکسی ئێک ژ ڤان سپێرمان ب تنێ دشێت هێکا ژنکێ ب پیتینیت و کو ژئەنجامێ ڤێ ئیککرتنێ زاروك ژێ پەیدادبیت.

[2] تیورا پەیدابوونا ژدەڤخۆ دبێژیت کو هەر زیندەوەرەك ژ چنەیێ و ژ دەڤخۆ دروست دبیت، لێ لیڤەنهوکی دیاکر کو هەر زیندەوەرەك ژ دەیکوبابێن خۆ پەیدادبیت نەك ژ دەڤخۆ.

ئەوژی پشتی کو چپکەکا ئاڤێ ب تنێ لیڤەنهۆك ژ کەسەکێ سادە کریە مەزنترین زانا د دیروکێ دا.

هەرچەندە وی ب دروستاهی نەدزانی کا ئەڤە چیە وی ئاشکەراکری لێ دگەل هندێ ژی ڤێ ئاشکەراکرنا وی گرنگیەکا هەرە مەزن د دیروکا مرۆڤایەتیێ دا هەبوو، ژبەرکو لیڤەنهۆك ئێکەم کەس بوو ب چاڤێن خۆ ژیانەکا دی ل سەر ڕۆیێ عەردی دیتی و ئاشکەراکری ئەوژی هەبوونا جیهانا زیندەوەرێن گەلەك هویر و بچووکە کو ب چاڤ ناهێنە دیتن. ئەڤ زیندەوەرە ل هەمی جهێنە دەوروبەری مە دژین وەك ناڤ ئاڤێ و هەوای و سەر ئاخێ و هەتا دناڤ لەشێن مەدا.

ل دویڤدا ئەو شیا گەلەك جورێن بەکتریا ئاشکەرا بکەت و ل دویڤ قەباری وان ب ڤاڤێریت، لێ ل وی سەردەمی خەلکی گەلەك گرنگیا ڤان زیندەوەرێن بچووك نەدزانی هەتا زانایێ فرەنسی لویس پاستۆر هاتی ئانکو پشتی مرنا وی ب 100 سالاڽ و پشتی هینگێ زانستێ میکرۆبان ما نڤستی هەتا چەرخێ نۆزدێ ئەوژی پشتی کو گەلەك جورێن پێشکەفتی یێن مایکرۆسکوپان هاتینە دروستکرن.

ئەم دشێن بێژین هەکە لیڤەنهۆکی ئەڤ میکرۆبە ئاشکەرا نەکریان ڕەنگە ئەڤ چەندە ببا ئەگەرێ گیروبوونا پێشکەفتنا زانستی خواندنا میکرۆبان یێ دبێژنێ مایکرۆبایۆلوژی، لێ گەنگەشە ل سەر هندێ ناهێتە کرن کو ئاشکەراکرنا ڤان میکرۆبان بوویە ئەگەر زانستێ سەردەم پتر پێنگاڤان بەرەڤ تێگەهشتنێن باشتر دەربارەی چەوانیا پەیدابوونا ژیانێ و مرنێ ل دەڤ مرۆڤی ب هاڤێژن و باشتر د ڤێ چەندێ بگەهن.

گەلەك کەس هوسا هزردکەن کو ئاشکەراکرنا میکرۆبان ژ نیشکەکێڤەبوو، هەلبەت ئەڤ چەندەژی بێ بەختیەکە ل ڤی زانایی دهێتەکرن چونکی ئاشکەراکرنا وی ژبۆ میکرۆبان ژ ئەنجامێ پێشکەفتنا ئاوێنە و مایکرۆسکوپان هاتیە، زێدەباری هویربینیا وی د تەماشەکرنا تشتێن بچووك دا و تیبینیکرنا وی ژبۆ ڤان تشتان و بێهن فرەهیا وی یا زێدە ژبۆ دویفچوونا ڤان تشتان، ئانکو نەکو ب بەختی یان ژی ژ نیشکەکێڤە وی ئەڤ چەندە ئاشکەرا کریە.

هەردیسان ئەم دشێن بێژین کو ئاشکەراکرنا میکرۆبان ئێك بوو ژ وان تشتێن بەرچاڤ و گرنگ یێن مرۆڤەکی ب تنێ ئاشکەرا کرین ئانکو کەسێ پشکداری دگەل نەکربوو

یان هاریکاریا وی نەکربوو، چونکی لیڤەنهۆکی ژ نەچاری و هەژاریا خۆ بزاڤ کر بۆ خۆ مایکرۆسکوپەکا سادە دروست بکەت و ڤەکۆلینان ل سەر ئەنجامبدەت، ژبەر ڤێ چەندێ مە ناڤی وی کریە دگەل لیستا کەسێن کاریگەر د دیروکێ دا.

## 37. ويليەم مۆرتۆن William T. G. Morton

## (1819ز ــ 1868ز)

### ويليەم مۆرتۆن

### ئەو نوژدارێ مرۆڤ ژ ئێشانا ددانی ڤورتال کرین

دبیت ناڤێ ڤی کەسی بۆ گەلەك ژ مە یێ نوو بیت و بەری نوکە مە گوهـ لێ نەبیت، لێ ئەو کارتێکرنا ڤی نوژداری ل پشت خۆ هێلای ژ کارتێکرنا گەلەك کەسێن دی یێن زانا و بەرنیاس مەزنتربوویە، ژبەرکو ئەو ئێکەم کەس بوو بەنج د نشتەگەریاندا بکارئیناى کو بەری هینگێ ئەنجامدانا نشتەگەریان کارەکێ گەلەك نەخۆش و ب ئێشان بوو.

ڕەنگە کێم جار د دیروکێ تشتەکێ هوسا ڕویدابیت کو داهێنانەکا زانستی یا نوو ببیتە ئەگەرێ پەیدابوونا چەندین گوهۆرینێن مەزن و ژیانا گەلەك مرۆڤان ژ مرنێ ڤۆرتال کربیت، هەروەکی کا چەوا دەمێ بەنج هاتیە ب کارئینان ل دەمێ نشتەگەریان، ژبەرکو تشتەکێ گەلەك ب مەترسی و پڕی ئێشان بوو دەمێ کەسەك پێدڤی ئەنجامدانا نشتەگەریەکێ ببا، چونکی ل دەمێ ئەنجامدانا نشتەگەریێ دا چاڤێن وی د ڤەکری بن و ئاگەهـ ژ خۆ هەبیت و نوژدار ل پێشچاڤ ێن وی دا زکێ وی ڤەکەن و هەستیکێن وی ئینتە دەرێ و کارێ خۆ ئەنجامدەن.

هەلبەت کەسێ نەساخ ئەڤ تشتە هەمی ب چاڤێن خۆ ددیتن و هەست ب وێ ئێشانا مەزن دکر و دەنگێ گری و هەوارێن گەلەك بلند دبوو، لێ خۆشبەختانە داهێنانا بەنجێ ئەڤ نەخۆشیە هەمی ب دوماهی ئینان لەوڕا کەسێ ئەڤ داهێنانە کری ژ هەژی سوپاسی و ڕێزگرتنەکا مەزنە.

ویلیەم مۆرتۆن ل ڕۆژا 9 تەباخا سالا 1819 ل باژێرێ شارلتۆن ل ویلایەتا ماساچوستس یا ئەمریکی ژ دایکبوویە، بابێ وی جوتیار بوو لێ هاریکاریا کورێ خۆ کر کو بچیتە زانینگەهێ بخوینیت، مۆرتۆن ل زانینگەها بالتیمۆرێ ل پشکا نشتەگەریا ددانان هاتە وەرگرتن.

ل سالا 1842 پشتی زانینگەهـ ب دوماهی ئیناى دگەل نۆژدارەکێ دی یێ ددانان ب ناڤێ "هۆراس وێل" کارکر، ڤی نۆژداری ژی گەلەك گرنگی ددا ب کارئینانا بەنجێ د نشتەگەریان دا، لێ کارێ وی چ کارتێکرن و پەیوەندی ب داهێنانا مۆرتۆنی ڤە نەبوو.

ڤی نوژداری گازا ئوکسیدا نیترۆزی[1] ژبۆ بەنجکرنا ددانان ب کاردئینا و شیا سەرکەفتنێ تێدا بینیت، لێ ژ بەختڕەشیا وی دەمێ ڤیایی ڤێ گازێ ل پێشچاڤ ێن کومەکا دی یا نوژداران د نشتەگەریەکێ دا ب کاربینیت، ڤێ گازێ چ کارتێکرن ل کەسێ نەساخ نەکر لەورا داهێنانا وی نەشیا جهێ خۆ بگریت و کەسێ دانپێدان پێنەکر.

دەمێ مۆرتۆنی ددانێ نەساخەکی ئینابا دەر، پێدڤی بوو ل دەستپێکێ ڕها ددانی قەتاندبا و پاشی ددانێ کرمی ئینانبا دەر، ئەڤێ چەندێ ژی ئێشانەکا گەلەك مەزن پەیدادکر و کەسێ خۆ لبەر نەدگرت، هەتا گازا کەنیێ ژی نەدشیا ئێشانا ڤێ نشتەگەریێ کێم بکەت، مۆرتۆن نەچاربوو هزرا خو د تشتەکێ نوو دا بکەت ژ پێخەمەت کێمکرنا ئێشانێ ئەوژی ب کارئینانا کەرەستێ ئیسەر بوو.

بەری سەردەمێ مۆتونی ب 300 سالاًن، نوژدارێ سویسری پارسیلوسی کەرەستێ ئیسەری ئاشکەرا کربوو و گەلەك نوژداران دزانی کو ڤی کەرەستەی کارتێکرنەکا مەزن ل سەر بەنجکرنێ یا هەی لێ کەسێ هێشتا د نشتەگەریاندا ب کارنەئینابوو، بەلکو مۆرتۆن ئێکەم کەس بوو ئەڤ کەرەستە ژبۆ بەنجکرنا سەیێ خۆ ب کارئینایی دەمێ ڤیایی نشتەگەریەکێ بۆ ئەنجام بدەت

ل ڕێکەفتی 31 چریا دووێ ل سالا 1846 دەلیڤە ژبۆ مۆرتۆنی پەیدابوو ڤی کەرەستەی ژبۆ بەنجکرنا ددانێ کەسەکێ نەساخ ب کاربینیت، ئەوژی پشتی کو کەسەك هاتیە دەڤ وی و گازندە ژ ئێشانا ددانەکێ خۆ یێ کرمی دکرن و یێ ئامادەبوو خۆ لبەر هەر نەخۆشیەکێ بگریت ژپێخەمەت هندێ بەس ئەو ژ ئێشانا ددانێ خۆ قورتال بیت، مۆرتۆنی ددانێ وی یێ کرمی ب کەرەستێ ئەسیری بەنجکر و پشتی ب دوماهی هاتنا نشتەگەریێ نەخۆشی گوتە مۆرتۆنی کو وی هەست ب ئێشانێ نەدکر ل دەمێ نشتەگەریێ.

---

[1] ئەڤ گازە دهێتە نیاس ب گازا کەنیێ Laughing Gas ژبەرکو دەمێ مرۆڤ ڤێ گازێ هەلدکێشیت دبیتە ئەگەر مرۆڤ دەست ب کەنیێ بکەت و کونترۆلا خۆ ژدەست بدەت

پشتی هینگێ مۆرتۆنی گەلەك نشتەگەرییێن دی ل پێشچاڤ ێن نوژداران ئەنجامدان کو تێدا کەرەستێ ئەسیری ژبۆ بەنجکرنێ ب کاردئینا، ئەڤ داهێنانە هەر زوی لناڤ ناڤەندێن زانستی و ڕۆژنامەییێن وی سەردەمی بەلاڤبوو و ئێدی گەلەك نوژداران ژی ئەڤ کەرەستە د نشتەگەرییێن خۆ دا بکارئینا، لێ کەسێ ئاماژە ب ناڤێ مۆرتۆنی و ڕۆلێ وی یێ گرنگ نەکر و ئەو خەلات نەکر، لەوڕا مۆرتۆن تووشی بێ ئومێدیەکا مەزن و هەتا ل سالا 1868 د ژیێ 49 سالییێ دا ب هەژاری و دەستکورتی وەغەرکر.

هەتا سەردەمێ ئەڤروکەژی چ گەنگەشە ل سەر گرنگیا بەنجکرنێ د نشتەگەریاندا نینن، لێ پرسیار ئەوە: ئەرێ هەتا چ ڕادە کەرەستێ ئەسیری ڕۆل د گرنگیا بەنجکرنێ دا هەبوویە، زێدەباری ڕۆلێ نوژدار مۆرتۆنی د ئاشکەراکرنا گرنگیا ڤی کەرەستەی و ب کارئینانا وی د نشتەگەریاندا؟

تشتێ گومان تێدا نەیی ئەوە کو ئەو نشتەگەریا مۆتونی ل سالا 1846 ئەنجامدایی کو تێدا ژبۆ ئێکەم جار کەرەستێ ئەسیری وەك بەنج ب کارئینایی بۆ ئەگەرێ گوهۆرینا ئاڕاستێ زانستێ پزیشکی و نشتەگەرییان و پشتی هینگێ زانا شیان کونترۆلێ ل سەر ئێشانێ بکەن، لێ کەسێ ژبەر ڤی ڤی کارێ ئەو خەلات نەکر و هەتا ل سەر گورێ ویژی چ ئاماژەکرن بۆ داهێنانا وی نەهاتینە کرن.

## 38. گوليلمۆ مارکۆنی Guglielmo Marconi

## (1874ز-1937ز)

### مارکۆنی

### ئەو زانایێ ئێکەم ئامیرێ ڕادیویێ دروستکری

داهێنەرێ ڕادیویێ گولیلمۆ مارکۆنی ل سالا 1874 زاینی ل باژێرێ پۆلۆنیا ل وەلاتێ ئیتالیا ژ خێزانەکا دەولەمەند ژدایکبوویە، مارکۆنی خواندنا خۆ ل مالێ وەرگریتە ژبەرکو مالباتا وی ماموستایێن تایبەت بۆ دئینانە مالێ، دەمێ ژیێ گەهشتیە 20 سالیێ دەست ب خۆاندنا ڤەکۆلین و تاقیکرنێن زانا "هنێری هرچس" کر یێن کو بەری وی ب چەندین سالان ئەنجامدابن، تاقیکرنێن ڤی زانای دیارکربوو هندەك پێلێن کارۆموگناتیسی یێن نەبینراو یێن هەین و ئەڤ پێلە دناڤ هەوای دا بلەزاتیا ڕۆناهیا ڕۆژێ د لڤلڤن.

مارکۆنی بزاڤا هندێ کر کا چەوا دێ شێت ڤان پێلان ب کارئینیت ژ پێخەمەت هنارتنا هێمایێن دەنگی بۆ جهێن دوور بێی کو پێدڤی ب هەبوونا گەهێنەرکی یان وائێران بیت. ئەڤ چەندەژی دێ بیتە ئەگەر کریارا پەیوەندیکرنێ ب سانەهیتر بیت ژ ئامیری تەلەگرافێ ئەوێ ئەدیسونی داهێنای.

هەردیسان ب ڕێکا ڤان پێلان دشیاندایە نامەیێن دەنگی ژبۆ پاپۆرێن دناڤ دەریایاندا بهێنە هنارتن، ل سالا 1895 و پشتی سالەکا تەمام ژ کارکرنەکا بەردەوام مارکۆنی شیا ئامیرەکێ تایبەت ژبۆ خۆ دروست بکەت. ل سالا 1896 چوو وەلاتێ ئینگلتەرا و ل وێرێ ئەڤ ئامیرە بەرچاڤکر وب ناڤێ خۆ تومارکر و هەر زوی کومپانیەك دامەزراند.

ل سالا 1898 هندەك پێل ب ڤی ئامیرەی هنارتن و ناڤێ وان کرە "مارکۆنی گرام" و پشتی سێ سالان شیا نامەیێن وایەرلێس ئانکو بێی بکارئینانا وایرەکێ فرێکەت. ل دویڤدا مارکۆنی یێ بەردوام بوو ل سەر پێشخستنا ئامیرێ خۆ.

ل سالا 1901 شیا نامەیێن وایەرلێسی بەرەڤ زەریایا ئەتلەسی ب هنێریت، گرنگیا هەرە مەزن یا ڤی ئامیرەی ل سالا 1909 دیاربوو دەمێ پاپۆرا "ربیلیك" نقومبووی ژبەرکو ب هاریکاریا نامەیێن وایەرلێسی یێن ڤی ئامیرەی شیان هژمارەکا مەزن ژ ڕێڤینگێن ڤێ پاپۆرێ ڤۆرتال بکەن. هەر ل وێ سالێ مارکۆنی هاتە خەلاتکرن ب خەلاتێ نۆبل ژبەر ڤێ داهێنانا وی یا مەزن. ل سالا 1910 مارکۆنی شیا نامەیێن وایەرلێسی بۆ جهێن گەلەك دوورتر ب هنێریت ئەوژی پشتی شیایی نامەیان دناڤبەرا ئێرلەندا و ئەرژەنتینێ ب گوهۆریت ئانکو نامە ب دووراتیا پتر ژ 1000 میلان هنارتن.

مارکۆنی د وێ هیڤیێ دا بوو بشێت دەنگێ خۆ ب شێوەیەکێ ڕاستەخۆ بۆ جهێن گەلەك دوور ب هێنریت لێ ئەو نەشیا ڤێ چەندێ بکەت هەتا سالا 1915، ل دویڤدا ل سالا 1920 ژ نوو بۆ ئێکەم جار دەزگەهێن ڕادیوێ ل جیهانێ پەیدابوون. ل سالێن دوماهیێ یێن ژیێ خۆ مارکۆنی شیا هندەك پێلێن کورت و هندەك پێلێن دی یێن گەلەك کورت ب کاربینیت، مارکۆنی ل سالا 1937 ل باژێرێ ڕۆما وەغەرکر.

مارکۆنی وەك داهێنەرێ ڕادیوێ ناڤدار بوو، هەرچەندە وی ئامیرێ تێلەڤزیونێ دروستنەکر، لێ ژبەرکو هزرا دروستکرنا تێلەڤزیونێ ژی ب تەمامی پشت بەستنێ دکەتە سەر ئامیرێ ڕادیوێ ئەوژی پشتی هندەك تشتێن سادە ل سەر هاتینە زێدەکرن لەوڕا ئەم دشێن بێژین ئامیرێ ڕادیوێ بوویە ئەگەرێ پەیدابوونا تێلەڤزیونێ ژی.

گومان تێدا نینە ل سەردەمێ ئەڤروکەدا ئامیرێ ڕادیوێ گرنگیەکا مەزن هەیە دبوارێ گەهاندنێ دا ژبەرکو ڕادیو بوویە ئامرازەکێ سەرەکی ژبۆ گەهاندنا دەنگوباس و خزمەتێن پولیسی و ڤەکۆلینێن زانستی و چەندین بوارێن دی یێن گرنگ، هەرچەندە ئامیرێ تەلەگرافێ بەری ڕادیوێ ب چەرخەك و نیڤان هاتبوو داهێنان لێ ب چ ڕەنگان نەشێت جهێ ڕادیوێ بگریت ژبەرکو ب سانەهی ئەم دشێن ئامیرێ ڕادیوێ دناڤ پاپۆر و ترۆمبێل و فرۆکە و گەمیێن ئەسمانی دا بدانین هەتا وی ڕادەی ل سەردەمێ ئەڤروکە دناڤ ئامیرێن تێلەفونێن هەلگر دا ئامیرێ ڕادیوێ ب سانەهی دناڤدا کاردکەت ژبەر ڤێ چەندێ مە ناڤێ مارکۆنی دانایە بەری ناڤێ داهێنەرێ تێلەفونێ گراهام بیلی.

لێ ژبەرکو ئامیرێن ڕادیو و تێلەڤیزنێ دەربڕینێ ژ کارئینانەکا پراکتیکی یا تیورێن فاڕادای و ماکسوێلی دکەن لەوڕا مە ناڤێ ڤان هەردوو زانایان دانایە بەری یێ مارکۆنی.

هەژی گوتنێ یە گەلەك كەسێن سیاسەتمەدار ل جیهانێ هەمان كاریگەری ل سەر مرۆڤایەتیێ كریە یا ماركۆنی كری لەورا ڕێزبەندا ناڤێن وان دڤێ لیستێ نێزیكی ئێكە.

## 39. ئەدۆلف هێتلەر Adolf Hitler

## (1889ز. - 1945ز.)

### ئەدۆلف هێتلەر

### ئەو کەسێ ئێکەم چریسکا شەڕێ جیهانی یێ دووێ هەلکری

دڤێت ئەم دانپێدانێ ب هندێ بکەین کو ب لێبورینەکا مەزنڤە مە ناڤێ هێتلەری کریە دگەل لیستا کاریگەرترین مرۆڤ د دیروکێ ژبەرکو وی کاریگەریەکا خراب ل سەر مرۆڤایەتیێ بجه هێلایە، من لبەر نەبوو رێزێ ل کەسەکی بگرم یێ بوویە ئەگەرێ کوشتنا پتر ژ 35 ملیون مرۆڤان ل سەر رویێ عەردی، لێ نابیت ئەم ژبیربکەین کو کاریگەریا ڤی مرۆڤی ل سەر هژمارەکا مەزن یا مرۆڤان تا ئەڤروکەژی یا بەدەوامە لەورا ئەم نەچاربووین ناڤێ وی ژی بدانیە دگەل ڤێ لیستێ.

ئەدۆلف هێتلەر ل سالا 1889 زاینی ل باژێرێ "برادناو" ل وەلاتێ نەمسا ژ دایکبوویە، ل دەستپێکا ژیانا وی گەنجەکێ هونەرمەندێ شێوەکاری یێ سەرکەفتی نەبوو، هەردیسان کەسەکێ نیشتیمانپەروەرێ ئەلمانی یێ تۆندرەو بوو، ل شەرێ جیهانی یێ ئێکێ وەك سەرباز دناڤ لەشکەرێ ئەلمانی دا کارکر و بریندار بوو لێ ل دویڤدا ب دوو مەدالیێن رێزگرتنێ ژبەر چاڤنەترسیا وی د شەری دا هاتە خەلاتکرن.

لێ شکەستنا ئەلمانیا د ڤی شەری دا بوو ئەگەر ئەو گەلەك تۆرەبیت و کەربێن وی گەلەك ژ خەلکێ ئەلمانیا و گەلێن دی یێن ئەوروپی ڤەبن، ل سالا 1919 چوو دناڤ رێزێن پارتا یەمینی یا تۆندرەو ل باژێرێ میونیخ و هەر زوی ڤێ پارتێ ناڤێ خۆ گوهارت و کرە پارتا کارکەرێن ئەلمانی یا نیشتیمانی یا سوسیالیست و کورتیا وێ دهێتە نیاسین ب پارتا "نازی" و پشتی دوو سالێن ل دویڤدا هێتلەر بوو سەرکردێ ڤێ پارتێ کو دگوتنێ فوهور.

ب سەرکێشیا هێتلەری ئێدی پارتا نازی هێدی هێدی ب هێزکەفت، ل چریا دوێ یا سالا 1923 بزاڤکر ب کودەتایەکا لەشکەری دژی حکومەتا وی سەردەمی یا ئەلمانی رابیت

کو ئەڤ هاتە ناڤکرن ب "کودەتایا گازینوا میوینخ"، لێ ڤێ بزاڤا وان سەرنەگرت و هێتلەر هاتەگرتن و ب تاوانا خیانەتێ هاتە زیندانکرن، لێ پشتی کێمتر ژ سالەکێ هاتە ئازادکرن.

ل سالا 1828 پارتا نازی یا بچووك بوو، لێ قەیرانا جیهانی وەل ئەلمانیا کر کو کاودانێن هەمی پارتێن دی یێن سیاسی بەرەڤ نەباشیێ ڤە بچیت، لێ دگەل هندێ ژی پارتا نازی هەر د گەشەکرنێ دا هەبوو، ل کانونا دوێ یا سالا 1933 ئانکو د ژیێ 44 سالییێ دا هێتلەر شیا ببیتە شیرەتکارێ ئەلمانیا.

پشتی بوویە شیرەتکار ئێدی نیشانێن دکتاتوریێ ل دەف هێتلەری دیاربوون و بزاڤکر کونترۆلێ ل سەر هەمی ئامرازێن نهێنییێن دەولەتێ بکەت و هەر زوی گەهشتە وی تشتێ وی ڤیایی، وی گرنگی ب چ دادگەهان نەددا و هەر کەسێ خۆ نەرازیکربا ژ رێکا خۆ ددا پاش یانژی دکوشت، بەری دەستپێکرنا شەرێ جیهانی یێ دووی هێتلەر شیا رەزامەندیا گەلێ ئەلمانی ب دەستخۆڤە بینیت ژبەرکو هەژاری و بێکاری نەهێلا و گەشەکرنەکا ئابوری یا بهێز ل وەلاتی پەیدابوو.

هێتلەری چریسکا ئێکێ یا شەرێ جیهانی یێ دووێ هەلکر، ل دەستپێکی چەندین سەرکەفتنێن هەرێمێ بێی شەرکرن تومارکرن. ل وی سەردەمی هەردوو وەلاتێن فرەنسا و بریتانیا نەشیان مایێ خۆ د هێتلەری بکەن و دژی وی ب راوەستن ژبەرکو تووشی قەیرانەکا دارایی یا مەزن ببوون، لەورا هێتلەری پەیمانا "فۆرسای" هەلوەشاند و لەشکەرەکێ مەزن دروستکر و دەڤەرا "راین" ل سالا 1936 داگیرکر، هەردیسان ل سالا 1938 نەمسا ئینا ب سەر وەلاتێ ئەلمانیاڤە، هەر دڤێ سالێ دا هەردوو وەلاتێن فرەنسا و بریتانیا رازیبوون دەڤەرا "سودیت" کو بەشەك بوو ژ ئاخا وەلاتێ چیکوسلوڤاکیا بهێتە ب سەر وەلاتێ ئەلمانیاڤە.

پشتی هینگێ ئەڤ هەردوو وەلاتە نەچاربوون ب هەر بهایەکێ هەبیت پەیمانەکا ئاشتیێ دگەل ئەلمانیا ئیمزا بکەن، لەورا پەیمانا میونیخ یا بناڤودەنگ هاتە ئیمزاکرن کو تێدا عەردێ مای ژ ئاخا چیکوسلوڤاکیا هاتە ب سەر وەلاتێ ئەلمانیاڤە.

ژبەرکو هێتلەر کەسەکێ زیرەك و چەلەنگ بوو لەورا هەر گاڤا داخوازیێن وی نەهاتبانە بجهئینان وی گەفێن شەری دکرن و ژبەر ڤێ چەندێ ژی گەلەك وەلاتێن رۆژئاڤی لبەر داخوازیێن وی دهاتن، لێ هەردوو وەلاتێن فرەنسا و بریتانیا ب هیچ رەنگەکی

ڕازینەبوون وەلاتێ پۆلەندا بدەست هێتلەریڤە بەردەن کو خۆ بەرهەڤدکر بچیت داگیربکەت، لەورا هێتلەری پەیمانەک دگەل ستالینێ ڕۆسی گرێدا کو پۆلەندا دناڤبەرا خۆدا دابەش بکەن.

پشتی نەهـ ڕۆژان ژ ڤێ پەیمانێ هێتلەری هێزێن خۆ برنە سەر سنورێ پۆلەندا و پشتی 16 ڕۆژان ڕۆسیا ژی هێزێن خۆ فرێکرنە سەر سنورێ پۆلەندا، هەرچەندە فرەنسا و برێتانیا شەڕ دژی هێتلەری ڕاگەهاند لێ دەم ب سەرڤەچوبوو و وەلاتێ پۆلەندا ب تەمامی کەفتبوو. ل دویڤدا هێتلەری شەڕەکی دی مەزن ل سالا 1940 دژی دانیمارك و نەرویج ئەنجامدا و هێزێن وان شکاندن.

ل هەیڤا گولانا هەمان سالێ شیا دەستێ خۆ بدانیتە سەر هۆلەندا و بەلچیکا و لوکسمبۆرگ و ل هەیڤا تیرمەهێ ژی وەلاتێ فرەنسا داگیرکر. لێ پشتی هینگێ وەلاتێ برێتانیا شیا خۆ لبەر گەلەك هێرشێن ئەسمانی یێن ئەلمانی بگریت، ئەڤ هێرشێن دژوار هاتنە ناڤکرن ب "شەڕێ برێتانیا" و دڤان هێرشاندا هێتلەری نەشیا سەرکەفتنێ تومار بکەت.

ل نیسانا 1941 لەشکەرێ هێتلەری هێرش کرە سەر وەلاتێن یونان و یوگیوسلافیا و ل تیرمەها هەمان سالێ پەیمانا خۆ دگەل ڕۆسیا بەرێ هەلوەشاند و هێرش کرەسەر، هەرچەندە لەشکەرێ وی شیا ڕۆبەرەکێ مەزن ژ عەردێ ڕۆسیا داگیربکەت لێ هەتا بەری هاتنا وەرزێ زڤستانێ و بارینا بەفرێ هێزێن وی نەشیان کونترۆلێ ل سەر لەشکەرێ ڕۆسی بکەن.

هەرچەندە ل وی دەمی هێتلەری شەڕ دژی وەلاتێن ڕۆسیا و برێتانیا پێکڤە دکر، لێ د هەمان دەمدا وی شەڕ دژی ویلایەتێن ئیکگرتی یێن ئەمریکا ڕاگەهاند ئانکو پشتی چەند ڕۆژەکان ل سەر هێرشێن لەشکەرێ ئەسمانی یێ یابانێ ژبۆ سەر گەشتییێن ئەمریکی ل بەندەرێ "بیرل هاربور". ل ناڤەڕاستا سالا 1942 ئەلمانیا شیا دەستێ خۆ بدانیە سەر نیڤەکا کێشوەرێ ئەورۆپا کو بەری هینگێ چ وەلاتان نەشیابوو ڤێ چەندێ بکەن، هەردیسان شیابوو گەلەك دەڤەرێن باکورێ کێشوەرێ ئەفریقیا داگیربکەت.

لێ خالا وەرگەریانێ د شەڕێ جیهانی یێ دووێ دا ل نیڤا دووێ ژ سالا 1942 دەستپێکر دەمێ ئەلمانیا د دوو شەڕاندا ل مسرێ و ڕۆسیا تووشی شکەستنێ بووی، ل

دویڤدا هێدی هێدی هێزێن لەشکەرێ ئەڵمانی لاوازبوون، هەرچەندە یا ڕۆهن و ئاشکەڕابوو کو وەلاتێ ئەڵمانیا ل سەر لێڤا کەفتنێ بوو لێ هێتلەری قەت خۆ ب دەستڤە بەرنەدا، سەرەڕای شکەستنێن مەزن و زیانێن لەشکەری و کەرەستی یێن مەزن لێ ئەڵمانیا شیا ژبۆ ماوێ دوو سالێن دیژی ل سەر شەڕی یا بەردەوام بیت.

ل دوماهیێ ل 30 نیسانا 1945 هێتلەری خۆ کوشت و پشتی هینگێ ب حەفیتەکێ وەلاتێ ئەڵمانیا کەفت.

ل سەردەمێ دەستهەلاتا هێتلەری، ئەڵمانیا ڕابوو ب ژناڤبرنا ڕەگەزێ مرۆڤایەتیێ کو چ وەکهەڤ وەکی وێ د دیروکێ دا نەبوون، هێتلەر گەلەك یێ توندڕەو بوو ژبۆ ڕەگەزێ "ئاری" و دژی جوهیان بوو، ئارمانجا وی سەرەکی ئەوبوو هەمی جوهیێن ل دونیایێ بکوژیت. ل سەردەمی وی ئەڵمانیا چەندین سەربازگەهێن کوشتنا جوهیان ڤەکربوون، ل ڤان سەربازگەهان چەندین ژورێن مەزن هەبوون و جوهی ب کوم دکرنە تێڤە و ب گازێن ژەهراوی د کوشتن، د وان سالێن کێمدا وی نیزیکی شەش ملیون جوهیان کوشتن.

ل سەردەمی وی جوهی ب تنێ نەبوونە ئارمانجا وی، بەلکو وی هژمارەکا مەزن یا سەرکردە و خەلکێ دی یێ بێگونەهـ هاتنە کوشتن، هەلبەت هێتلەری ئەڤ چەندە د ماوێ شەڕی دا ئەنجام نەددا بەلکو کوشتارگەهێن وی ب شێوەیەکێ هێمن و ل سەر خۆ کاردکر کو ب شێوەیەکێ تەمام د سەربەخۆبوون و پەیوەندی ب لەشکەریڤە نەبوو، پتریا کەلەخێن کوشتیان د پیشەسازیا دروستکرنا سابینێ دا دهاتنە ب کارئینان، هەتا ل وی دەمێ ئەڵمانیا تووشی کێمبوونا ژێدەرێن سووتەمەنیێ ژی بووی لێ ترۆمبێلێن ڤەگۆهاستنا کەلخێن مریان ب شێوەیەکێ ڕێکوپێك کارێ خۆ دکر.

ژبەر چەندین ئەگەران، ناڤودەنگیا هێتلەری هەتا دەمەکێ درێژ دێ مینیت:

ئێك: هێتلەر دهێتە نیاسین ب دڕندەترین مرۆڤ د دیروکێ دا، هەکە هەردوو ئیمپراتۆر "نیرۆن" و "کالیگوالا" هەتا بەری چەرخێ بیستێ ژی دڕندەترین مرۆڤ بن د دیروکێ دا، لێ هەکە ئەم وان دگەل هێتلەری هەڤبەر بکەین دێ بینین کو کارێن وان ل پێش یێن هێتلەری ڤی وەکی چپکەکا ئاڤێ بوون ژ دەریایی.

دوو: ناڤێ هێتلەری د دیروکێ دا هاتیە تومارکرن وەك ئێکەم کەسێ چریسکا شەڕێ جیهانی یێ دووێ هەلکری کو مەزنترین شەڕبوو د دیروکێ دا هاتیە تومارکرن و بوویە ئەگەر ڕێکێ ل هەلکرنا چەندین شەڕێن دی ڤەکەت.

سێ: ناڤودەنگیا هێتلەری دێ ژبەر چیرۆکا ژیانا وی یا سەیر و پڕی نهێنی هەر مینیت ژبەرکو ئەو بۆ خۆ کەسەکێ نەمساوی بوو نەك ئەلمانی، بەری هینگێ چ سەربورێن سیاسی و پارە و پەیوەندی نەبوون لێ د ماوێ کێمتر ژ 14 سالاندا شیا ببیتە سەرکردێ مەزنترین هێزا لەشکەری ل سەر ویێ عەردی، هەردیسان شیانێن وی یێن گوتاربێژیێ گەلەك د مەزن بوون و هەر زوی شیا کونترۆلێ ل سەر خەلکی بکەت و ب خۆڤە گرێدەت لەوڕا ژی دهێتە نیاسین باشترین گوتاربێژ د دیروکێ دا.

# 40. ئەفلاتون Plato

## (427ب.ز.-370ب.ز.)

## ئەفلاتۆن

## ئەو فەیلەسوفێ پتر ژ 23 چەرخان کاریگەری ل سەر شارستانیا ڕۆژئاڤایی کری

ئەفلاتۆن ئەو فەیلەسوفێ گریگی بوو یێ کو دەستپێکا فەلسەفا سیاسی ل ڕۆژئاڤایی ل سەر هزروبیرێن وی هاتیەدانان زێدەباری دەستپێکا هزرا ڕەوشتی و خوداوەندی. بۆ پتر 2300 سالان هزرۆبیرێن ڤی فەیلەسوفی ل سەرانسەری جیهانێ هاتینە خۆاندن لەورا دهێتە هەژمارتن مەزنترین هزرمەندێ ڕۆژئاڤایی.

ئەفلاتۆن ل سالا 427 بەری زاینی ل باژێرێ ئەسینا ژدایکبوویە. هەر ژ بچووکاتیا خۆ فەیلەسوفێ مەزن سوکرات نیاسی و بوونە هەڤالێن ئێك، ل سالا 399 بەری زاینی سوکرات د ژیێ 70 سالییێ ژلایێ دەستهەلاتدارێن وی سەردەمیڤە ب تاوانا سەردابرنا مێشکێ گەنجان هاتە سێدارەدان، ڤێ چەندێ کارتێکرنەکا مەزن ل سەر ئەفلاتۆنی کر ژبەرکو ب دیتنا وی سێدارەدانا سوکراتی ئانکو سێدارەدانا دیموکراتییێ بوو.

پشتی هینگێ ئەفلاتۆنی باژێرێ ئەسینا بجهـ هێلا و بۆ ماوێ پتر ژ 12 سالان ژیانا خۆ ل دەرڤەی وەلاتی بوراند، ل سالا 387 بەری زاینی جارەکا دی زڤڕی باژێرێ ئەسینا و قوتابخانەیەکا ئەکادیمی ڤەکر، ڤێ ئەکادیمیێ بۆ ماوێ پتر ژ نەهـ چەرخان کارێ خۆ بەردەوام دکر و هژمارەکا مەزن یا قوتابیان لێ د خۆاند، ژ مەزنترین قوتابیێن ئەفلاتۆنی، فەیلەسوفێ ناڤدار ئەڕیستۆ بوو کو دەمێ هاتیە ڤێ ئەکادیمیێ ژیێ وی 17 سالێ بوون. ئەفلاتۆن د ژیێ 80 سالییێ دا ل سالا 347 بەری زاینی وەغەرکر.

د ژیانا خۆدا ئەفلاتۆنی نێزیکی 34 پەرتووکان بەلاڤکربوون کو پتریا وان دەربارەی سیاسەت و ڕەوشت و سەرەدەری و کاروبارێن ئولی و خوداناسیێ بوون، ئێك ژ گرنگترین پەرتووکێن ئەفلاتۆنی ب ناڤێ "کومار" بوو کو تێدا بەحسێ جڤاکەکێ نموونەی دکر یێ کو وی خەون پێڤە ددیتن.

ئەفلاتۆنی هزر دکر باشترین حکومەت ئەو حکومەتن یێ ل سەر بنەمایەکێ ئەرێستوکراتی دهێنە دامەزراندن، ل ڤێرێ مەرەما وی ئەو نەبوو کەسێن ئەرێستوکراتی یانژی ئەو شاهێن دەستهەلات ب شێوەیەکێ بۆماوەیی بوو مای دەستهەلاتێ بگرنە دەست، بەلکو مەرەما وی ئەرێستوکراتیا هزروبیران بوو ئانکو دەستهەلات بکەڤیتە د دەستێ کەسێن ژ هەژی و چەلەنگدا.

ل ڤێرێ نابیت ئەڤ کەسە ل سەر بنەمایێ هەلبژارتنان یان ڕاپرسیان بهێتە دەستنیشانکرن بەلکو ب ڕێکا هەلبژارتنەکا پێکگوهۆرك دناڤبەرا دەستهەلاتداران بخۆڤە بیت، ئەڤ کەسێن دهێنە هەلبژارتن دێ بنە پارێزڤانێن وەلاتی و دڤێت ئەو کەسێن دی ژبۆ ناڤ حکومەتێ ل سەر بنەمایێ ژێهاتی و زیرەکیا وان بهێنە هەلبژارتن.

هەردیسان ئەفلاتۆنی هزردکر دڤێت دەلیڤەیەکا یەکسان ژبۆ زەلام و ئافرەتان بهێتەدان د ڕێڤەبرنا کاروبارێن وەلاتیدا. ژبۆ پەیداکرنا دەلیڤەیەکا یەکسان ل هەمبەر هەمی کەسان، ل سەر دەولەتێ پێدڤیە زاروکان ب خۆدان بکەت، دڤێت ئەڤ زاروکە وانەیێن وەرزشی و شیانێن لەشیڤە وەربگرن و نابیت ژ وانەیێن موزیك و ماتماتیکێ بهێنە بێبەهرکرن. ل دویڤدا دڤێت تاقیکرن ل سەر ڤان زاروکان د هەمی قوناغێن گەشەکرنا ژیێ واندا بهێنە ئەنجامدان، قوتابیێن نەسەرکەفتی دڤێت بهێنە ڤەگۆهاستن ژبۆ خواندنێن ئابوری و قوتابیێن سەرکەفتی ژی دڤێت بەردەوام ژلایێ دەولەتێڤە بهێنە پەروەدەکرن و زێدەباری وەرگرتنا وانەیێن ئاسایی دڤێت وانەیێن فەلسەفی ژی بخوینن.

پشتی ژیێ ڤان زاروکان دگەهیتە 35 سالیێ، دڤێت دەولەت جارەکا دی بۆ ماوێ 15 سالان وان فێری هونەرێ کارگێری و ڕێڤەبرنا کاروبارێن وەلاتی بکەت و ئەو کەسێن سەرکەفتی ب تنێ دێ ژ هەژی هندێ بن ببنە پارێزڤانێن وەلاتی.

دبیت کارێ پارێزڤانێن وەلاتی ب شیانێن هەمی کەسانڤە نەبیت یانژی هەمی کەسان حەز ل سەر نەبیت ژبەرکو نابیت ئەڤ پارێزڤانە ببنە کەسێن دەولەمەند بەلکو دڤێت کێم پارە و مال هەبیت، هەردیسان دڤێت مووچەکێ کێم ژی بۆ بهێتە تەرخانکرن و نابیت وان ژیانا خۆ یا تایبەت هەبیت و ژیانا هەڤژینیێ پێکبینن بەلکو دڤێت هەمی پێکڤە بخۆن و بژین.

ئەگەر ئەڤ چەندە هاتە بجهئینان ل وی دەمی کومارەکا نموونەیی یان وەلاّتەکیّ نموونە دیّهیّتە دروستکرن.

ئەڤ پەرتووکە بوّ ماویّ پتر 23 سالاّن ژلاییّ خەلکیڤە دهاتە خوّاندن، سەرەرای هەمەجوریا دەستهەلاّتیّ هەر ژ سەردەمیّ ئەفلاّتوّنی و هەتا سەردەمیّ ئەڤروکە، لیّ هەتا نوکە چ کەسان ئەڤ سیاسەتا ڤیّ کومارا نموونەیی بجهنەئینایە یاکو ئەفلاّتوّنی خەون پیّڤە ددیتن، د هەما دەمدا ئەڤ کومارا ئەفلاتوّنی نەبوویە بنیاتیّ دانانا چ سیستەمیّن سیاسی ل جیهانی.

لیّ نابیت ئەم ویّ چەندیّ ڤەشیّرین کو هندەك حکومەتیّن ئەوروّپی دەربرینیّ ژ ویّنەیەکیّ سادە ییّ کومارا ئەفلاّتوّنی دکەن، بوّ نموونە هەڤچوونەك دناڤبەرا کاودانیّن دیّرا کاسولیکی ل چەرخیّن ناڤەراست ل ئەوروّپا و تەخا پاریّزڤانیّن وەلاّتی ل کومارا ئەفلاّتوّنی هەیە، چونکی دیّرا کاسولیکی ژ هندەك قەشەیان پیّکدهات کو وان خوّ ئیّکو دوو د هەلبژارت و هەمی ل سەر فیّربوون و خواندنا فەلسەفیّ مەزن بوون، ل دەستپیّکیّ ڤان کەسان بیّی جوداهی دەست ب خوّاندنیّ کربوو پشتی هینگیّ ژیانا خوّ هەمی ژبوّ خزمەتکرنا دیّریّ تەرخان کربوو و ژیانا هەڤژینییّ پیّك نەدئینا.

ژلایەکیّ دیڤە پارتا شیوعی ل ئیّکەیا سوڤیەتا بەریّ گەلەگ خالیّن هەڤپشك دگەل پاریّزڤانیّن کومارا ئەفلاّتوّنی هەبوون، هەردیسان لیّکچوونەکا مەزن دناڤبەرا دانەریّن دەستوریّ ئەمریکا و دەستهەلاّتداریّن کومارا ئەفلاّتوّنی هەنە ژبەرکو ئارمانجا ڤی دەستوری ئەوە وان بەهرەیان ئاشکەرا بکەت ییّن شیانیّن ب ریّڤەبرنا کاروباریّن گەلیّ ئەمریکا هەین.

د ڤیّ لیستیّ دا مە ناڤیّ ئەفلاّتوّنی دانایە پشتی ناڤیّ قوتابییّ وی ئەریستوّی، ئەگەریّ ویّ بوّ هندیّ دزڤریت کو ئەریستوّ فەیلەسوفەکیّ خوّدان میّشکەکیّ زانستی و پراکیتکی بوو و ئیّك بوو ژ وان زانایێن کاریگەریەکا مەزن ل سەر هزرا مروّڤایەتییّ کری، لیّ د هەمان دەمدا ناڤیّ ئەفلاّتوّنی بەری ناڤیّ هندەك هزرمەندیّن دی هاتیە دانان وەك "جوّن لوك" ییّ ئینگلیزی و "توّماس جیفرسون"یّ ئەمریکی و "ڤوّلتیّر"یّ فرەنسی، ئەگەریّ ڤیّ چەندیّ بوّ هندیّ دزڤریت کو هزروبیریّن ڤان فەیلەسوفان ب تنیّ بوّ ماویّ نیّزیکی دوو هەتا سیّ چەرخان کاریگەری ل سەر هزرا ئەوروّپی کریە لیّ هزروبیریّن ئەفلاتوّنی بوّ ماویّ پتر ژ 23 چەرخان کاریگەری ل سەر شارستانیا روّژئاڤایی کریە.

## 41. ئولیڤەر کرۆموێل Oliver Cromwell

## (1599ز.-1658ز.)

### ئولیڤەر کرۆموێل

### ئەو سەرکردێ حوکمێ پەلەرمانی ل ئینگلتەرا دانای

ئولیڤەر کرۆموێل ئەو سەرکردێ سیاسی بوو یێ کو شیایی هێزێن پەرلەمانی ل شەرێ ناڤخۆیی ل ئینگلتەرا سەربێخیت، دهێتە هەژمارتن بەرپرسیارێ ئێکێ یێ کو شیایی دیموکراتیا پەرلەمانی بکەتە شێوەیەك ژ شێوەیێن حوکمرانیێ ل ئینگلتەرا.

کرۆموێل ل سالا 1599 ل باژێرێ "هنگتون"ل وەلاتێ ئینگلتەرا ژدایکبوویە، دەمێ گەهشتیە ژیێ گەنجاتیێ وەلاتێ وی تووشی گەلەك هەڤرکیێن ئاینی بوو و چەندین شەرێن ناڤخۆیی پەیدابوون، کرۆموێل کەسەکێ گوندی بوو و گەلەك ب ئاینی ڤە هاتبوو گرێدان. ل سالا 1626 وەك ئەندام پەرلەمان هاتە هەلبژارتن لێ ڤێ چەندێ گەلەك نەڤەکێشا ژبەرکو شاهـ چارلزێ ئێکێ بریاردا پەرلەمان بهێتە هەلوەشاندن و ئەو ببیتە دەستهەلاتدارێ ئێکانە ل وەلاتی و ژبلی وی کەس بریاران نەدەت.

ڤی شاهی نەشیا چ پەرلەمانێن دی ب دانیت هەتا سالا 1640 ئەوژی پشتی کو پێدڤی ب پارەیەکێ مەزن بووی و بریاردای شەرێ دژی وەلاتێ ئوسکوتلەندا بکەت و لێ ڤی پەرلەمانێ نوو کو کرۆموێل ژی ئێك ژ ئەندامێن وی بوو داخاز ژ شاهی کر حوکمرانیا وەلاتی بەرەڤ دیکتاتوریەتێ ڤە نەبەت لێ وی گوهنەدا ڤێ بریارێ لەورا شەرەکێ ناڤخۆیی دناڤبەرا ئالیگرێن شاهی و پشتەڤانێن پەرلەمانی پەیدابوو.

ل وی سەردەمی کرۆموێل بوو ئێك ژ وان کەسێن بەرەڤانی ژ دەستوری و پەرلەمانی کری و دژی شاهی راوەستیا، ل دویڤدا ڤەگەریا گوندێ خۆ و هێزەکا سیارچاکان دروستکر داکو شەرێ شاهی بکەن، د ماوێ چوار سالێن شەری دا زیرەکیا وی یا سیاسی و لەشکەری دیاربوو. کرۆموێلی رۆلەکێ گرنگ د دوو شەرێن مەزندا گێرا ئەوژی شەرێ

"مارستۆن" ل تیرمەها سالا 1644 و شەرێ "ناسی" ل خزیرانا یا سالا 1645 و ئەڤ شەڕە ب سەرکەفتنا کرۆموێلی ل سالا 1646 ب دوماهی هاتن و شاهـ هاتە ئێخسیرکرن و کرۆموێل بوو سەرکەفتیترین سەرکردێ پەڕلەمانی ل ئینگلتەرا.

لێ ڤێ ئازادیێ بۆ ماوەیەکێ درێژ نەڤەکێشا ژبەرکو هەر زوی گەلەك هێزێن سیاسی و لەشکەری پەیدابوون و دووبارە شەڕێن ناڤخۆیی دەستپێکرن، ل وی دەمی شاهـ چارلزێ ئێکێ ڕەڤی و بزاڤکرن دووبارە هێزێن خۆ ڕێکبێخیت لێ دووبارە تووشی شکەستنێ بوو و شاهـ ل سالا 1649 هاتە سێدارەدان.

پشتی هینگێ بریتانیا بوو وەلاتەکێ کوماری کو ئەنجومەنێ دەولەتێ ب سەرکردایەتیا کرۆموێلی حوکمڕانی لێکر، لێ دووبارە پشتەڤانێن شاهی ل وەلاتێن ئێرلەندا و ئوسکوتلەندا ب سەرکێشیا کورێ شاهـ چارلزێ ئێکێ کومبوون و بریاردا شەڕی بکەن لێ کرۆموێلی ب هێزەکا لەشکەری یا مەزن هێرشکرە سەر ڤان کەسان و پشتی چەندین شەڕێن خویناوی شیا ل سالا 1652 ب سەر هەمی دوژمنێن خۆ ب سەرکەڤیت و ل وی دەمی دەلیڤە بۆ پەیدابوو حکومەتەکا نوو ب دامەزرینیت، لێ ئاریشەك کەفتە بەر سینگێ وی ئەوژی ئاریشا دانانا دەستورێ ڤێ حکومەتێ بوو.

سەرەڕای سەرکەفتنێن مەزن یێن کرۆموێلی د ژیانا خۆدا تومارکرین لێ هەر نەشیا ئاریشا دەستوری چارەسەربکەت و هەڤرکیێن دناڤبەرا پشتەڤان و دوژمێن خۆدا چارەسەر بکەت.

ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هەبوونا هەڤرکیێن ئاینی دناڤبەرا ڕێبازێن پرۆتستانتی و کاسولیکی دا دزڤڕین و ژ ئەگەرێ ڤان هەڤرکیان سێ جاران پەڕلەمان هاتەدانان. هەرچەندە پشتی هینگێ پەڕلەمانی دوو دەستور دانان لێ خۆ ئێك ژ وان نەهاتە بجهئینان. کرۆمۆیل نەچاربوو وەك سەرکردەیەکێ لەشکەری یێ دکتاتور ڕەفتارێ بدەت سەرەڕای بزاڤێن وی یێن بەردەوام ژبۆ دامەزراندنا حکومەتەکا دیموکراتی و دانانا دەستورەکی.

دناڤبەرا سالێن 1653 هەتا 1658 ناسناڤێ لوردێ پارێزڤانێ وەلاتی ب کرۆموێلی هاتەدان، د ماوێ ڤان پێنج سالاندا کرۆموێلی حوکمڕانی ل وەلاتێن ئینگلتەرا و ئێرلەندا و

ئوسكوتلەندا دكر و بزاڤكرن تا ڕادەیەكی دەستهەلاٌتەكا دادپەروەرانە بكەت چەندین یاساییێن كەڤن گوهارتن و چەندین چاكسازی د شێوازێ خواندن و فێركرنێ ئەنجامدان.

ڤی سەركردەی باوەریەكا تەمام ب لێبورینا ئاینی و پێكڤەژیانێ هەبوو لەوڕا بریاردا جوهی ب زڤڕنە وەلاٌتێ ئنگلتەرا و ب شێوەیەكێ ئازاد ڕێوڕەسمێن خۆ یێن ئاینی ب گێرن كو بەری هینگێ ب سێ چەرخان ژلایێ شاهـ ئیدواردێ ئێكێ هاتبوونە دەرێخستن.

هەردیسان كرۆموێل خۆدان سیاسەتەكا دەرڤە یا سەركەفتی بوو، لێ ل سالاٌ 1658 پشتی تووشی نەخۆشیا مەلاریایێ بووی وەغەركر.

پشتی مرنا وی، كورێ وی یێ مەزن "ڕیچارد كرۆموێل" هاتە سەر كورسیكا دەستهەلاٌتێ لێ سالاٌ 1660 دووبارە شاهـ چارلزێ دووێ شیا بهێتە سەر حوكمی لێ ب چ ڕەنگان نەشیا هەڤڕكیا پەڕلەمانی بكەت.

ژێدەرێن دیروكێ خۆیا دكەن كو كرۆموێل كەسەكێ دلسوزبوو و ڕێزەكا مەزن ل پەڕلەمانی دگرت لێ كاودانێن وی سەردەمی ئەو نەچاركر هندەك گوهۆرینان بكەت یانژی نەشیا هەمی كەسان ژ خۆ ڕازی بكەت، هەردیسان ب چ ڕەنگان حەز نەدكر ببیتە كەسەكێ دكتاتور لەوڕا خۆ نەكرە شاهێ ئێكێ ل وەلاٌتی بەلكو سەركردیەكێ لەشكەری یێ زیرەك و چەلەنگ بوو شیا سەركەفتنێن مەزن تومار بكەت.

## 42. ئەليكساندەر گراهام بێل Alexander Graham Bell

## (1847ز.-1922ز.)

### ئەليكساندەر گراهام بێل

### ئەو زانايێ بۆ ئێكەم جار ئاميرێ تێلەفونێ داهێناى

ئەليكساندەر گراهام بێل ل سالا 1847 ل باژێرێ "ئەدەنبەرە" ل وەلاتێ ئوسكوتلەندا ژدايكبوويە، هەرچەندە ئەو ب شێوەيەكێ ريكوپێك نەدچوو قوتابخانێ لێ پشتى هينگێ شيا خۆ ب خۆ فێرى خۆاندن و نڤێسينى بكەت و ببيتە كەسەكێ زيرەك و رەوشەنبير، هێشتا ل دەستپێكا ژيێ خۆ گەلەك گرنگى ددا تۆماركرنا دەنگێ خۆ و ئەڤ چەندەژى بۆ كەسەكێ وەكى وى يا ئاسايى بوو ژبەركو بابێ وى ماموستايەكێ تايبەمەند بوو د بوارێ خۆاندنا دەنگى دا و چەوانيا فێركرنا ئاخفتنێ.

ل سالا 1871 گراهام بەرەڤ باژێرێ "بۆستۆن" ل ويلايەتا ماساشويست يا ئەمريكى چوو و ل سالا 1882 شيا ناسناما ئەمريكى ب دەستخۆڤە بينيت، ل ئەمريكا گراهامى ئێكەم پێنگاڤ بەرەڤ داهێنانا ئاميرێ تێلەفونێ هاڤێت و ل سالا 1876 ئەڤ داهێنانە ب ناڤێ وى هاتە تۆماركرن، لێ تشتێ گەلەك سەير ئەوبوو كەسەكێ دى ب ناڤێ "ئيليشا گراى" هەمان داهێنان د وێ رۆژێ دا ب ناڤێ خۆ تۆماركر لێ ئەوژى ب چەند دەمژمێرەكان پشتى گراهامى.

پشتى گراهامى باوەرناما داهێنانێ ب دەستخۆڤە ئيناى، داهێنانا خۆ ل پێشانگەها نێڤدەولەتى ل فيلادلفيا بەرچاڤكر كو هەر زوى گرنگيەكا مەزن ژلايێ زانا و بازرگانانڤە پێ هاتەدان، ل دويڤدا گراهامى و هەڤالێن وى كومپانيەك ژبۆ بەرهەم ئينانا ئاميرێن تێلەفونان دامەزراند و هێدى هێدى ئەڤ ئاميرە كەفتە بەر دەستێ خەلكى.

ل وی سەردەمی گراهام و هەڤژینا خۆ خودانێن 15٪ ژ پشکێن ڤێ کومپانیێ بوون، لێ ژبەرکو وان نەدزانی پشتی هینگێ داهاتیێ ڤێ کومپانیێ دێ پارەیەکێ گەلەك مەزن لەورا وان هەر پشکەکا خۆ ل کومپانیێ ب 250 دولاران فرۆت، لێ ژبەرکو وان گەلەك لەز د فروتنا پشکێن خۆدا کر لەورا ئەو نەشیان پارەیەکێ مەزن ب دەستخۆڤە بێخن بەروڤاژی ئەگەر وان ب تنێ بۆ ماوێ سالەکێ خۆ گرتبا دا بەرامبەر هەر پشکەکا خۆ ملیون دولاران ب دەستڤە ئینن.

هەرچەندە داهێنانا تێلەفونێ گراهام کرە کەسەکێ گەلەك دەولەمەند لێ ئەو هەر یێ بەردەوام بوو ل سەر ڤەکۆلینێن زانستی لەورا پشتی هینگێ شیا داهێنانەکا دی یا زانستی تۆماربکەت لێ بهایێ وێ وەکی یێ تێلەفونێ یێ گرنگ نەبوو. ئێك ژ وان کارێن گراهام گەلەك پێڤە مژیل بووی ئەوبوو کا چەوا دێ شێت هاریکاریا کەسێن کەڕ کەت دووبارە بشێن گوهـ ل دەنگان بیت ژبەرکو هەڤژینا وی یا کەڕبوو لەورا ب درێژاهیا ژیانا خۆ بزاڤا دکر هاریکاریا وێ بکەت.

گراهامی دوو کور هەبوون و دوو کچ هەبوون لێ هەردوو کورێن وی هێشتا ل ژیێ زاروکینیێ وەغەرکرن، لێ وی ل سالا 1922 وەغەرکر.

گرنگیا گراهام بێلی بۆ هندێ دزڤریت کو ئەو شیا ئامیرێ تێلەفونێ ب داهێنیت کو ئەڤروکە بوویە ئێك ژ ئامیرێن هەرە گرنگ و پێدڤی بۆ مرۆڤان و کاریگەریەکا بێ وێنە ل سەر ژیانا مە کریە. ل وی دەمی داهێنانا تێلەفوونێ هێزەکا مەزن و کاریگەر ل سەر ژیانا مرۆڤان پەیداکر

دناڤ لیستا کەسێن کاریگەر د دیروکێ دا، مە ناڤێ گراهام بیلی دانایە پشتی ناڤێ داهێنەرێ ئامیرێ رادیویێ مارکۆنی، ژبەرکو ئەو داهێنانا مارکۆنی ئەنجامدای گەلەك گرنگتر و مەزنتر و کاریگەرتربوو ژ داهێنانا گراهامی، زێدەباری هندێ کو گراهامی مفایەکێ مەزن ژ ڤەکۆلین و ئامیرێ رادیویێ وەرگرت هەتا شیای ئێکەم ئامیرێ تێلەفونێ دروست بکەت.

# 43. ئەليكساندەر فلامينگ Alexander Fleming

# (1881ز-1955ز)

## ئەليكساندەر فلامينگ

## ئەو زانايێ بۆ ئێكەم جار دەرمانێ پەنسلينێ ئاشكەراكرى

ئەليكساندەر فلامينگ ل سالا 1881 ل باژێرێ "لوگفێلد" ل وەلاتێ ئوسكوتلەندا ژدايكبوويە، پشتى دەرچوونا وى ژ قوتابخانەيەكا پزيشكى ل باژێرێ لەندەن، ئێدى دەست ب ئەنجامدانا ڤەكۆلينان كر.

ل دويڤدا وەك برينپێچەك پشكدارى د شەڕێ جيهانى يێ ئێكێ دا كر. ل وى دەمى فلامينگى تيبينيا هندێ كر كو پترىا ئەو كەرەستەيێن ژبۆ ياقژكرنا برينێن سەربازان دهێنە ب كارئينان زيانێن وان گەلەك مەزنترن ژ مفايێن وان ژبەركو ئەڤ كەرەستەيە زيانێ پتر دگەهينە خانەيێن لەشى ژ بەكتريا و ميكرۆبان، لەوڕا وى هزرا خۆ د هندێ دا كر كا چەوا دێ كەرەستەيەكى دروست كەت ب تنێ كونترۆلێ ل سەر ميكرۆبان بكەت و د هەمان دەمدا زيانێ نەگەهينتە خانەيێن لەشێ مرۆڤى.

ل سالا 1922 و پشتى ب دوماهى هاتنا شەڕێ جيهانى يێ ئێكێ دووبارە چوو كارگەها خۆ و دەست ب ڤەكۆلينان كر هەتا كو شياى كەرەستەيەكێ ئاشكەرا بكەت ب ناڤێ "لايسوزايم" كو ئەڤ كەرەستيە ب شێوەيەكێ سروشتى ژلايێ لەشێ مرۆڤيڤە دهێتە ڕێژتن، ئەڤ كەرەستەيە تێكەلەكە ژ تفى و ڕۆندكان كو زيانێ ناگەهينتە خانەيێن لەشى بەلكو د دشێت هژمارەكا جورێن ميكرۆبان بكوژيت لێ نەخۆشبەختانە ئەڤ كەرەستەيە نەشێت بەكترياييێن زيانبەخش و مەترسيدار بكوژيت. سەرەڕاى ڤێ ئاشكەراكرنا وى لێ دگەل هندێ چ كاريگەريەكا مەزن نەبوو.

لێ فلامينگ وى دەمى ناڤدار بوو پشتى كو شياى ب شاشيڤە كەرەستێ پەنسلينێ ل سالا 1928 ئاشكەرا بكەت.

فلامینگ کەسەکێ گێژ و بێ خیرەت بوو تاقیگەها وی یا بچووك هەمی گاڤا یا بێ سەروبەربوو، رۆژەکێ دەمێ کومەکا زانایان ل زانکۆیەکا دی سەرەدانا وی کری داکو تەماشەی کارێن وی بکەن لێ ل وی دەمی فلامینگی چ تشتێ بەر دەست نەبوون نیشا وان بدەت، بەلکو بەری هینگێ هندەك پلێتێن شینکرنا بەکتریان چاندبوون و پشتی ژێ ب دوماهی هاتی هاڤێتبوونە دناڤ تەنەکا گلێشی دا لەورا هەر زوی چوو ئەو پلێت ژناڤ گلێشی ئینانەدەر، ئاها ل ڤێرێ رویدانەکا سەیر پەیدابوو ئەوژی پشتی کو ئەو پلێت کیفکویی بووین و کەروو[1] ل سەر شینبووین.

ل سەر وێ پلێتا کیفکویی، ل دورماندوری کەروویان دەڤەرەکا رۆهن پەیدابوو و هەمی بەکترياییێن بەری هینگێ ل سەر شینبوو‌ی مریبوون، ب ڤێ چەندێ ژبۆ فلامینگی دیاربوو کو ڤان کەروویان کەرەستەك یێ رێژتی هەتا بوویە ئەگەرێ کوشتنا بەکتریان، پشتی هینگێ ئەو شیا پێکهاتنا ڤی کەرەستەی ئاشکەرا بکەت و ناڤێ وی کرە "پەنسلین"[2] . هەرچەندە ئەڤ پەنسیلینە دشێت بەکترياییێن زیان بەخش بکوژیت لێ چ کارتێکرنێن خراب ناکەتە سەر مرۆڤ و گیانەوەران.

ل سالا 1929 فلامینگی ئەنجامێن ڤەکۆلینا خۆ بەلاڤکرن، لێ ل دەستپێکێ کەسێ گرنگی نەدا ڤان ئەنجامان. هەرچەندە فلامینگی دیارکر کو دشیانێن ڤی کەرەستەی دا هەیە د بوارێن پزیشکی یێن مەترسیداردا بهێتە ب کارئینان لێ ژبەرکو ئەو نەشیابوو رێکەکا ب سانەهی ژبۆ پەیداکرنا ڤی کەرەستەی یان چەوانیا دەرخستنا وی ژ کەروویێ پەنسیلیومی دیاربکەت لەورا بۆ ماوێ پتر ژ 10 سالان ڤێ ئاشکەراکرنا وی چ گرنگیا خۆ نەبوو.

ل سالا 1930 دوو زانایێن بریتانی ب ناڤێ "هەوارد فلوری" و "ئارنست چین"ی ڤەکۆلینێن فلامینگی خۆاندن و دووبارە تاقیکرنێن وی ئەنجامدان و ئەڤ کەرەستێ نوو ل سەر گیانەوەرێن تاقیگەهێ تاقیکر، ل سالا 1941 ژی کەرەستێ پەنسلینی ل سەر نەخۆشان تاقیکر، پشتی هینگێ بۆ وان دیاربوو ئەڤ جورێ حەبکان کارتێکرنەکا بێ وینە د بوارێ پزیشکی دا یا هەی.

---

[1] کەروو = فطریات

[2] وی ناڤێ ڤی ماددەی کرە پەنسلین ژبەرکو ئەڤ ماددەیە ژلایێ کەروویێ پەنسیلیومێ Penicilluim ڤە دهێتە دروستکرن.

ب هاريكاريا حكومەتێن ئەمريكا و بڕيتانيا كومپانيێن پزيشكى دەست ب دەرخستن و بەرهەمئينانا كەرەستێ پەنسلينى ب بڕەكا ئێكجار مەزن كر، ل دويڤدا كومپانى شيان هندەك ڕێكێن ب سانەهى ب كاربينن ژبۆ بەرهەم ئينانا ڤى كەرەستێ كارتێكەر وچالاك و ب ڕێژەيەكا مەزن فرێكە بازارى.

ل دەستپێكێ پەنسلين وەك چارەسەرى ژبۆ سەربازێن بريندار د شەڕاندا هاتە ب كارئينان و ل سالا 1944 حەبكێن پەنسلينێ ب سانەهى كەفتنە بەر دەستێ هاولاتيێن ئەمريكى و بڕيتانى و پشتى ب دوماهى هاتنا شەڕێ جيهانى يێ دووێ ل سالا 1945 ئێدى ئەڤ حەبكە كەفتنە خزمەتا جڤاكى دا و ل سەرانسەرى جيهانێ هاتە فروتن.

ئاشكەراكرنا حەبكێن پەنسلينێ هاريكاريا زانايان كر گەلەك جورێن دى يێن دەرمان و ئەنتيبايوتيكان ئاشكەرا بكەن و بەرهەم بينن لێ هەتا سەردەمێ ئەڤروكە ژى پەنسلين ب شێوەيێن جوداجودا دهێتە هەژمارتن بەربەلاڤترين دەرمان ل سەرانسەرى جيهانى.

گرنگيا حەبكێن پەنسلينێ هەتا سەردەمێ ئەڤروكەژى بۆ هندێ دزڤڕيت كو بوو گەلەك مەرەمێن پزيشكى دهێتە ب كارئينان، بۆ چارەسەركرنا نەخۆشيێن زەهرى و سەيەلان و تايێ و نەخۆشيا ديفتيريا و هەودانێن چوك و گەهان و هەودانێن سيهان و ژەهراويبوونا خوينێ و نەخۆشيێن هەستيكان و تيفويێ و گەلەكێن دى دهێتە ب كارئينان. د هەمان دەمدا چ مەترسى ل زێدە ب كارئينانا حەبكێن پەنسلينێ نينە ب تنێ هندەك كەس نەبن يێن هەستيارى ژ دەرمانان هەى ب تايبەت كەرەستێ پەنسلينى.

ژبەركو پەنسلين بوو ئەگەرێ ڕزگاركرنا مليونەها مرۆڤان ل سەر ڕۆيێ عەردى و كاريگەريا وێ ل پاشەڕۆژێ ژى دێ يا بەردەوام بيت لەوڕا ئەليكساندەر فلامينگ دێ هەر مينيت كەسەكێ مەزن و ناڤدار د ديروكا مرۆڤايەتيێ دا.

ڕەنگە هندەك ديروكنڤێس د وێ باوەريێ دا بن كو ڕۆلێ وان نوژدارێن شيان ڕێكێن دەرخستن و بەرهەم ئينانا پەنسلينى دياربكەن چ كێمتر نينە ژ ڕۆلێ فلامينگى، لێ ناڤێ فلامينگى دێ هەر ل پێشيا هەميان مينيت ژبەركو ئەگەر ئەو نەبايە ڕەنگە هەتا چەندين سالێن دى پەنسلين نەهاتبايە ئاشكەرا كرن يانژى هەما ب ئێكجارى نەهاتبا ئاشكەرا كرن.

فلامینگ د ژیانا خۆ یا هەڤژینییێ دا گەلەك یێ بەختەوەر بوو و کورەکێ ب تنێ هەبوو، ل سالا 1945 شیا خەلاتێ نۆبل ب دەستخۆڤە بینیت و ل دویڤدا کومپانیەك ب هەڤپشکی دگەل هەردوو زانایان "فلوری" و "چین"ی دامەزراند, ل سالا 1955 وەغەرکر

## 44. جۆن لۆك John Locke

## (1632ز.-1704ز.)

### جۆن لۆك

### ئەو فەیلەسوفێ بنەمایێن دیموکراتیا دەستوری دانایین

فەیلەسوفێ ئینگلیزی جۆن لۆك ئێکەم کەس بوو بنەمایێن دیموکراتیا دەستوری دانایین، فەلسەفا وی کاریگەریەکا مەزن ل سەر دامەزرێنەرێن ویلایەتێن ئیکگرتی یێن ئەمریکا و سەرکردێن شۆڕەشا فڕەنسی هەبوون.

جۆن لۆك ل سالا 1632 زاینی ل باژێرێ "ڕینگتون" ل ئینگلتەرا ژدایکبوویە، خۆاندنا خۆ ل زانکۆیا ئێکسفۆرد ب دوماهی ئینایە و ل دویڤدا شیا باوەڕناما ماستەرێ ل هەمان زانکۆ بدەستڤە بینیت. هەر ژ گەنجاتیا خۆ گەلەك گرنگی ددا خواندن و زانستی، دەمێ ژیێ وی بوویە 36 سال هاتە هەلبژارتن وەك ئەندام د کۆمەلا شاهانە ل ئینگلتەرا و بوو هەڤالێ کیمیازانێ ناڤدار "رۆبەرت بویل"ی و ل دویڤدا بوو هەڤالەکێ نێزیك یێ زانایێ مەزن "ئیسحاق نیوتن"ی.

هەرچەندە گەلەك حەز ژ زانستێ پزیشکی دکر و شیا باوەڕناما بەکالوریوسێ د زانستێن پزیشکی دا بدەستڤە بینیت لێ پشتی هینگێ بۆ دەمەکێ کێم وەك نوژدار کارکر، خالا وەرچەرخانێ د ژیانا لۆکی دا هینگێ پەیدابوو دەمێ لورد "شافتسبری" نیاسی و ل دویڤدا بوو سکرتێر و نوژدارێ وی یێ تایبەت. شافتسبری خۆدان کەسایەتیەکا ب هێز و مەزن و هزر ڤەکری بوو، هەرچەندە بۆ ماوەیەکی شاهـ چارلزی ئەو زیندانکر لێ ل سالا 1682 شیا ب ڕەڤیت و بچتە وەلاتێ هۆلەندا و هەتا دوماهیا ژیانا خۆ ما ل وێرێ.

پشتی هینگێ جۆن لۆك ژی ژبەر هەڤالینیا وی یا ب هێز دگەل لوردی و ژبەر بوچوونێن وی یێن سیاسی ڕەڤی وەلاتێ هولەندا و ما ل وێرێ هەتا شۆڕەشێ شاهـ "جێمسێ دووێ" ئێخستی کو پشتی شاهـ چارلزێ دووێ هاتبوو سەر حوکمی. پشتی هینگێ لۆك ل سالا 1689 ڤەگەریا ئینگلتەرا و ل سالا 1704 وەغەرکر لێ ژیانا هەڤژینیێ پێکنەئینابوو.

ئەو پەرتووکا جۆن لۆك كریە فەیلەسوفەکێ ناڤدار، پەرتووکا " گوتارەك ل دور تێگەهشتنا مرۆڤی" کو ل سالا 1690 هاتبوو بەلاڤکرن. دڤێ گوتارێ دا ڤەکۆلین ل سەر بنیات و سروشت و سنورێن زانینا مرۆڤایەتیێ کربوون، بوچوونێن لۆکی تاقیکرنێن زانستی بوون، لۆك ب فەلسەفا دوو کەسان یێ داخباربوو ئەوژی فەیلەسوفێ ئینگلیزی "فرانسیس بەیکۆن" و فەیلەسوفێ فرەنسی "ڕینێ دیکارت".

بوچوونێن لۆکی کاریگەری ل سەر گەلەك کەسان کر وەك ڤەشێ ئینگلیزی "جۆرج بارکلی" و فەیلەسوفێ ئینگلیزی "دێڤێد هیوم" و فەیلەسوفێ ئەلمانی "نویل کۆنت". هەرچەندە ئەڤ پەرتووکا لۆکی دهێتە هەژمارتن باشترین کارێن وی یێن فەلسەفی و ئێك ژ ناڤدارترین پەرتووکێن فەلسەفی د دیروکێ دا، لێ ڤێ پەرتووکا وی کاریگەریا گەلەك کێم ل سەر ڕویدانێن سیاسی هەبوو، د ڤەکۆلینەکا خۆ دا ب ناڤێ "نامەك دەربارەی لێبورینی" کو ل سالا 1689 هاتە بەلاڤکرن، لۆکی دیارکربوو کو نابیت ب چ ڕەنگان دەولەت مایێ خۆ ئازادیا بیروباوەران دا بکەت.

هەرچەندە لۆك ئێکەم هاولاتیێ ئینگلیزیی نەبوو یێ بانگەشە ژبۆ لێبورینا ئاینی دناڤبەرا پرۆتستانتا دا دکری، لێ ئەو بوچوونێن نوو یێن وی پێ بەرگری و پشتەڤانیا لێبورینا ئاینی دکری کاریگەریەکا مەزن ل سەر هەستێن خەلکی و بوچوونێن وان یێن سیاسی هەبوو, لۆك شیا لێبورینا ئاینی نەك تنێ دناڤبەرا ڕێبازێن جوداجودا یێن ئاینەکی ب تنێ دا بەلاڤ بکەت بەلکو شیا ڤێ لێبورینێ دناڤبەرا ئاینێن جوداجودا بەلاڤ بکەت، لۆکی دگوت نابیت ئەم سەرەدەریێ دگەل کەسەکی بکەین ل سەر بنەمایێ بیروباوەرێن وی یێن ئاینی ڤێجا چ مەسیحی یان جوهی یان موسلمان بیت.

ناڤدارترین کارێن لۆکی پەرتووکەك بوو بناڤێ "دوو ڤەکۆلین دەربارەی حکومەتێ" کو ل سالا 1689 هاتە بەلاڤکرن، د ڤێ پەرتووکێ دا وی بوچوونێن خۆ یێن تایبەت ل دور دیموکراتیا دەستوری دیارکربوون، ڤێ پەرتووکێ کاریگەریەکا مەزن ل سەر وان ملەتان هەبوو یێن ب زمانێ ئینگلیزی د ئاخفتین.

لۆکی باوەری ب هندێ هەبوو کو هەر مرۆڤەکی مافێن خۆ یێن سروشتی یێن هەین، ئەڤ مافە ب تنێ نەبوون کو وی کەسی مافێ ژیانێ یێ هەی بەلکو مافێ ئازادی و ژیانەکا خۆش و بەختەوەر یێ هەی. هەردیسان لۆکی دیارکر کو کارێ حکومەتێ ئەوە

خەلکی ب پارێزیت و بەرەڤانییێ ژ ئازادی و سامانێن وان بکەت و ی ئەڤ تیوره ناڤکر ب "حکومەتا زێرەڤانا ب شەڤێ بۆ خەلکی"

فەلسەفا لۆکی کاریگەری ل سەر وان بنەمایان هەبوو یێن بووینه ئەگەرێ پەیدابوونا شۆڕەشا ئەمریکی، هەردیسان کاریگەریا وی ل سەر سەروکێ ئەمریکی "تۆماس جێفرسون"ی گەلەگ یا ڕۆهن و ئاشکەڕابوو، هەردیسان بوچوونێن لۆکی هاتنه ڤەگوهاستن بۆ فرەنسا و کاریگەری ل سەر پەیدابوونا شۆڕەشا فرەنسی کر. هەرچەنده گەلەك کەسێن ناڤدارتر ژ لۆکی یێن هەین وەك جێفرسون و ڤولتێری لێ فەلسەفا لۆکی بەری وان پەیدابوو و کاریگەریا وێ پتر بوو لەورا ناڤێ لۆکی بەری وان هاتیه دانان.

## 45. لودفیگ ڤان بتهۆڤن Ludwig van Beethoven

## (1170ز-1827ز)

### لودفیگ ڤان بتهۆڤن

### ئەو موزیکژەنێ پشتی کەربووی جوانترین سیمفونییێن موزیکێ داناین

لودفیگ ڤان بتهۆڤن دهێتە هەژمارتن مەزنترین هونەرمەندێ موزیکژەن د دیروکێ دا، ل سالا 1770 زاینی ل باژێرێ "بۆن" یێ ئەلمانی ژدایکبوویە. هەر ژ بچووکاتی بەرهرەیا هونەری یا بێ وێنە ل دەڤ دیاربوویە لێ ئێکەم کاری وی ڤەدگەریتە سالا 1783.

بتهۆڤن هێشتا یێ گەنج بوو سەردانا باژێرێ ڤیەنا کر و هەڤنیاسین دگەل موزیکژەنێ ناڤدار موزاتی کر. ل سالا 1792 دووبارە سەرەدانا باژێرێ ڤیەنا کر و لبەر دەستێ موزیکژەن "هایدن"ی دەست ب خۆاندنا موزیکێ کر کو ل وی دەمی ناڤدارترین موزیکژەنێ ڤیەنا بوو، لێ موزرات بەری هینگێ ب سالەکێ مربوو. پشتی هینگێ بتهوڤن هەتا دوماهیا ژیانا خۆ ما ل باژێرێ ڤیەنا کو دهاتە هەژمارتن پایتەختێ موزیکێ ل جیهانێ.

بتهڤۆن د ژەنینا ئامیرێ پیانوییێ دا گەلەك یێ دەستڕەنگین بوو، د هەمان دەمدا ماموستایەکێ موزیکژەن یێ زیرەك بوو لەورا هەر زوی کارێن وی یێن هونەری پێشکەفتن و بەربەلاڤبوون، بۆ کەسەکێ وەکی بتهۆڤنی یا ب زەحمەت نەبوو زویکا ناڤدار بیت ژبەرکو هێشتا د ژیێ 20 سالییێ دا بوو گرنگیەکا مەزن ب کارێن وی یێن هونەری هاتەدان و خەلکێ حەز ژێ دکر د هەمان دەمدا موزیکژەنێن وی سەردەمی ژی پشتەڤانیا وی دکر، لێ بەری ژیێ وی بگەهیتە 30 سالییێ هێدی هێدی نیشانێن کەربوونێ و ژدەستدانا هەستا گوهلێبوونێ ل دەف دیاربوون لەورا ڤێ چەندێ ئەو تووشی بارۆدوخەکێ دەروونی یێ نەخۆش کر و وی هزر د خۆکوشتنێ دا دکر.

ماوێ ناڤبەرا سالێن 1802 هەتا 1815 و دگەل زێدەبوونا کەڕبوونا وی ئێدی خۆ ژ ژیانا جڤاکی دوور ئێخست ژبەرکو وی هزردکر ئەو کەسەکێ کێم ئەندام و نەتەمامە، هەرچەندە وی دەمی وی گەلەك پەیوەندیێن دلداری هەبوون لێ دوماهیا ڤان پەیوەندیان هەمیان یا خەمناك و نەخۆش بوو. لێ ڤێ ئاریشا وی چ کاریگەرییێن خراب ل سەر بەهرەیا وی یا هونەری نەکر و بەردەوام کارێن جوان پێشکێشکرن.

دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 40 سالییێ ب تەمامی تووشی کەڕبوونێ بوو لەورا ئێدی نەچوو چ ئاهەنگێن هونەری و موزیکێ و ب شێوەیەکێ تەمام خۆ ژ خەلکی و ژیانا جڤاکی دوورکەفت و کارێن وی یێن هونەری کێمتر لێ هاتن و ئێدی ب زەحمەت دهاتە دیتن. لێ پشتی بتهۆڤن مایە ب تنێ ئێدی وی هزرا خۆ و بەرەباکێ پشتی خۆ دکر و بەلگە ل سەر ڤێ چەندێ ژی ئەبوو دەمێ جارەکێ گوتیە ڕەخنەگرەکی ئەز موزیکێ بوتە نادروستکەم بەلکو ئەز بۆ بەرەبابکێن پشتی تە دروست دکەم.

هەرچەندە جهێ داخێ یە مەزنترین مەزیکژەنێ جیهانی تووشی کەڕبوونێ بیت، لێ پتریا ڕەخنەگر و موزیکژەنان دگەل هندێ بوچوونێ نە کو ئەو کارێن بتهوڤنی د ماوێ ژیانا خۆ یا کەڕبوونێ دا پێشکێکرین دهێنە هەژمارتن باشترین کارێن وی یێن هونەری.

بتهۆڤن ل سالا 1827 د ژیێ 57 سالییێ دا وەغەر کر.

کارێن بتهۆنی پێکدهێن ژ 9 سیمفونیان و 32 سوناتێن سەر پیانوییێ و 5 کونسێرتێن سەر پیانو و کەمانێ و هژمارەکا کوراتێن وەتەری و موزیکا شانوگەریان و گەلەك کارێن دی.

بتهۆڤن موزیکژەنەکێ داهێنەرو چەلەنگ بوو و گەلەك کارێن وی یێن هونەری کاریگەریەکا کویر و درێژ ل سەر بەرەبابکێن پشتی خۆ کریە، ژبەرکو ئەو شیا چەندین سیمفونییان بدانیت و بوارێ وان بەرفرەهـ بکەت، ب هاریکاریا شیانێن وی یێن مەزن ل سەر بەرچاڤکرنا شیانێن ئامیرێ پیانوییێ، ئامیرێ پیانوییێ کرە ئێك ژ ئامیرێن موزیکێ یێن هەرە گرنگ.

بیتهۆڤن ئەو موزیکژەن بوو یێ شیایی موزیکێ ژ قۆناغا کلاسیکی ب ڤەگۆهێزیتە قۆناغەکا ڕۆمانسی و هەر ئەوبوو یێ شیایی هژمارا ئورکستراێ زێدەبکەت لەورا مەزناهیا بتهڤنی بۆ هندێ دزڤڕیت کو ئەو شیا جیهانا موزیکێ بکەتە جیهانەکا ڕۆمانسی.

بتهۆڤنی کاریگەریەکا مەزن ل سەر هەمی موزیکژەنێن پشتی هینگێ هەبوو ب تایبەت ل سەر شیان و ڕەنگێن وان یێن هونەری وەك "برامز" و "فانجر" و "شوبرت" و "چایکوفسکی". هەردیسان وی ڕێك ل هەمبەر دەرکەفتنا هندەك موزیکژەنێن دیژی ڤەکر وەك "بەرلیوز" و "مالەر" و"ڕیچارد ئیستراوس" و گەلەکێن دی.

ژبەر ڤێ چەندێ ژی تشتەکی سروشتیە کو بتهۆڤن ژ ڤان هەمی موزیکژەنان سەرکەفتیتر بیت و ناڤێ وی ب سەر هەمیان بکەڤیت. هەرچەندە موزیکژەن "یوهان باخ"ی هەمان ئاستێ زیرەکی و گرنگیا بتهوڤنی هەبوو، لێ کارێن بتهوڤنی پتر ببوونە جهێ ڕەزامەندیا خەلکی و خەلکی پتر حەز کارێن وی دکر.

ناهێتە ڤەشارتن ئەو کاریگەریا سیاسەتمەدار و ئەدیبان ل پشت خۆ هێلای گەلەك مەزنتر و کاراتر بوو ژ کاریگەریا موزیکژەنان لەورا ناڤێ بتهۆڤنی ژی پشتی ناڤێ شکسپیری هاتیەدانان.

ئەگەر ئەم هەڤبەرکرنەکێ دناڤبەرا کارێن مایکل ئەنجلو و بتهۆڤنی دا بکەین دێ بینین کو خەلك پتر گوهێ خۆ ددەنە موزیکێ ژ چوونا وان بۆ تەماشەکرنا پێشانگەهێن شێوەکاری، ژبەر ڤێ چەندێ ئەم دبینین کاریگەریا موزیکژەنان ژ یا هونەرمەندێن شێوەکاری مەزنتر بوویە.

# 46. ڤێرنەر هێزنبێرگ Werner Heiseberg

## (1901ز-1976ز)

## ڤێرنەر هێزنبێرگ

## ئەو زانایێ یاسایێن سەرەکیێن میکانیکیا کوانتەمی دانایین

ل سالا 1932 زانایێ ئەلمانی ڤێنەر هێزنبێرگ شیا خەلاتێ نۆبل د بوارێ فیزیایێ دا بدەستخۆڤە بینیت ژبەر رۆلێ وی یێ گرنگ د پێشخستنا بوارێ میکانیکا کوانتەمی کو دهێتە هەژمارتن ئێك ژ مەزنترین داهێنانێن مرۆڤایەتی د دیروکێ دا.

ڤێرنەر هێزنبێرگ ل سالا 1901 زاینی ل ئەلمانیا ژدایکبوویە، ل سالا 1923 شیا باوەرناما دکتورایێ د زانستێ فیزیایای تیوری ل زانکۆیا میونیخ ب دەستخۆڤە بینیت، ل سالا 1924 هەتا 1927 وەك هاریکار دگەل زانایێ فیزیایی یێ دانیمارکی "وینەلز بور"ی کارکر. ل سالا 1925 ڤەکۆلینێن خۆ دەربارەی "تیورا کوانتەم"ی بەلاڤکرن و شێوازێ "بنیاتێ نەبوونا پشتڕاستیێ" ل سالا 1927 دانا. ل سالا 1976 د ژیێ 74 سالێ دا وەغەرکر.

میکانیکا کوانتەمی ئەو لقێ زانستێ فیزیایێ یە یێ کو گرنگیێ ددەتە یاسایێن گشتی یێن کونترۆلێ ل سەر لڤینا تشتێن کەرەستی دکەت. ل دەستپێکا سالێن چەرخێ بیستێ یاسایێن میکانیکا کونتەمی یێن وی سەردەمی نەدشیان لڤینا تشتێن بچووك وەك گەرد و گەردیلەییێن کەرەستان شرۆڤە بکەت، هەلبەت ئەڤ چەندەژی جهێ دوودلی و مەندەهۆشیێ بوو ژبەرکو ئەڤ یاسایە د شیان لڤینا تشتێن مەزنتر ژ گەرد و گەردیلەیان شرۆڤە بکەن لێ چ یاسایێن تایبەت ژبۆ تشتێن بچووك نەبوون.

ل سالا 1925 هێزنبێرگی هندەك یاسایێن نوو دانان کو گەلەك د جودابوون ژ وان یاسایێن بەری هینگێ نیوتنی دانایین، پشتی هینگێ هندەك زانایێن دی هاتن و هندەگ گوهۆرین د تیور و یاسایێن هێزنبێرگی دا کرن کو بوونە ئەگەر دشیانێن ڤان یاسایاندا هەبوو لڤینا تشتێن مەزن و بچووك پێکڤە شرۆڤە بکەت.

ئێك ژ گرنگترین بەرهەمێن تیورا هێزنبێرگی د شرۆڤەکرنا لڤینا گەرد و گەردیلەیاندا، ئەو بنیات بوو یێ د گوتنێ "بنیاتێ نەبوونا پشتڕاستییێ، ل سالا 1927 شێوازێ ڤی بنیاتی هاتەدانان و ئەڤ بنیاتە دهێتە هژمارتن مەزنترین بنیاتێ کارتێکرن ل سەر دیروکا زانستێ سەردەم کری، هەردیسان ئەڤ بنیاتە سنورەکی ژبۆ شیانێن مرۆڤی د پیڤانا تشتێن دەوروبەردا ددانیت.

ڕامانا ڤی بنیاتی ئەوە کو د شیانێن مێشکێ مرۆڤیدا نینە هەمی تشتان بزانیت، هەردیسان د شیانێن ویدا نینە هەمی تشتان ب پیڤیت، بەلکو هندەك تشت یێن هەین مرۆڤ نزانیت و نەشێت خۆ ژێ پشتڕاست ژی بکەت. لێ دگەل هندێ ژی ئەنجامێن ڤی بنیاتی گەلەك د مەزن بوون.

ئەگەر یاسایێن سەرەکییێن فیزیایێ ڕێگرییێ ل زانایەکی بکەت ژبۆ بدەستڤەئینانا هندەك پێزانینێن گرنگ و پشتڕاست خۆ هەکە کاودانێن ڤی زانایی چەند د گونجایی و نموونەی بن، ڕامانا ڤێ چەندێ ئەوە ئەو نەشێت پێشبینیا لڤینا چ تشتان ل پاشەڕۆژێ بکەت، ئەڤ چەندە هندێ ڕاگەهینیت کو هەر گوهۆرینەك یان پێشکەفتنەك ل سەر ئامرازین مەیێن زانست و زانینێ دا بهێتەکرن، هاریکاریا مە ناکەن ئەم ل سەر ڤێ ئاریشێ زال ببین.

بنیاتێ نەبوونا پشتڕاستییێ وێ چەندێ خۆیا دکەت کو زانستێ فیزیایێ نەشێت ژ هندێ زێدەتر ئەنجامبدەت کو هندەك پێشبینی یێن سەرژمێریاری ب تنێ هەبن.

بۆ نموونە ئەو زانایێ فیزیایێ یێ د بوارێ تیکشێن ئەتۆمی دا کاردکەت، ب تنێ دشێت پێشبینیا هندێ بکەت کو ژ هەر 100 ملیون ئەتومێن تۆخمێ ڕادیومی، ب تنێ دوو ملیون ئەتوم دشێن ل ڕۆژا دویڤدا تیشکا گاما ب هاڤێژن. هەردیسان ئەو نەشێت پێشبینیا هندێ بکەت کا کیژ جورێ ڤان ئەتومان دێ ڤان تیشکان هاڤێژیت.

لێ ئەم دشێن بێژین هەر چەند هژمارا ئەتومان زێدەبیت، نەبوونا پشتڕاستییێ دێ زێدەتر لێ هێت، و هەر چەند هژمارا ئەتومان کێم ژی بیت، نەبوونا پشتڕاستییێ هەر دێ زێدەتر لێ هێت، ئەڤ تیورە گەلەك یا سەیربوو هەتا زانایێ مەزن ئەنیشتاینی ل دەستپێکی پەسەند نەکر کر و گوت: مێشکێ من نەشێت هزرا خۆ د هندێ دا بکەت کو خۆدایێ مەزن

یاریا تەپا سەر مێزێ ب ڤی گەردونی دکەت. لێ دگەل هندێ ژی چ ڕێکێن دی لبەر دەستێ زانایان نەبوون لەوڕا نەچاربوون ڤێ تیورێ پەسەند بکەن یاکو زانا هێزنبێرگی داناى.

یا ئاشکەرایە تیورا میکانیکا کوانتەمی کاریگەریەکا مەزنتر ژ تیورا ڕێژەیی یا ئەنیشتاینی هەبوو، هەردیسان ڤێ تیورێ کاریگەرییێن فەلسەفی ژی هەبوون. ب هاریکاریا ڤێ تیورێ زانا شیان مایکرۆسکوپێن ئەلیکترۆنی و تیشکا لێزەر و ترانزستەرێ ب کاربینن. هەردیسان ژ ئەنجامێن زانستی یێن گرنگ یێن ڤێ تیورێ، بوارێ فیزیا ناڤوکی و هێزا ناڤوکی بوون. زێدەباری ب کارئینانا ڤێ تیورێ د بوارێن زانستێن فەلەکی و کیمیایێ دا، دیسان زانا پشت بەستنێ دکەنە سەر ڤێ تیورێ ژبۆ زانینا تایبەتمەندییێن تۆخمێ هیلیومی د دۆخێ شل و ڕۆهندا و پێکهاتنا ناڤخۆیی یا ستێران و موگناتیسی ئاسنی و تیشکێن ناڤوکی.

ل ڤێرێ ڕەنگە پرسیارەك بهێتەکرن ئەوژی مادەم تیورا کونتەمێ هند یا گرنگ و کاریگەربوو، بوچی مە ناڤێ هێزنبێرگی نەدانا ل دەستپێکا لیستا ناڤێن کەسێن کاریگەر د دیروکێ دا؟

ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژبۆ هندێ دزڤڕیت کو هێزنبێرگ زانایێ ئێکانە نەبوو یێ گرنگیی ب تیورا کوانتەمی د بوارێ میکانیکیێ دا دای بەلکو بەری هینگێ گەلەك زانایێن دی بزاڤێن مەزن کربوون وەك "ماکس بلانك" و "ئەلبێرت ئەنیشتاین" و "وینەلز بور" و "لوی دیبروی". هەردیسان پشتی هینگێ هندەك زانایێن دی گوهۆرین د ڤێ تیورا ویدا کرن وەك زانایێ ئەڵمانی "ئارفین شرید" و زانایێ ئینگلیزی "دێراك"ی، لێ دگەل هندێ ژی ئەم دشێن بێژین کو هێزبێرگ کەسێ ئێکانەبوو یێ شیای یاساییێن ڤێ تیورێ ب شێوەیەکێ دروست و تەمام ب دانیت لەوڕا مە ناڤێ وی دناڤ ڤێ لیستێ دا دانایە.

## 47. لویس داگیر Louis Daguerre

## (1787ز- 1851ز)

### لویس داگیر

### ئەو زانایێ ئێکەم کامیرا فوتگرافی داهێنای

لویس داگیر ئێکە ژ وان کەسێن دەستپێکێ یێن بزاڤێن مەزن کرین ژبۆ داهێنانا کامیرەکا فوتوگرافی هەتاکو ل سالا 1837 ئێکەم کامیرەیا گرتنا وێنەیان داهێنای.

لویس جاك کەندی داگیر ل سالا 1787 ل باژێرێ "کورجی" ل باکورێ فرەنسا ژدایکبوویە، ل دەستپێکی حەز ژ کارێ وێنەکێشانێ دکر و دەمێ گەهشتیە ژیێ 30 سالێ شێوازەکێ نوو بۆ نیشاندانا کەڤالێن هونەری داهێنا ئەوژی ب کارئینانا ڕۆناهیی بوو، پشتی وی ئەڤ شێوازە داهێنایی هزر ل هندێ کر کا چەوا دێ شێت شێوازەکێ نوو داهێنیت ژبۆ ڤەگوهاستنا دیمەنێن سرۆشتی بۆ وێنەیەکێ ئوتوماتیکی ئانکو وێنەیان ب ڕێکا کامیرەیان بگریت نەك وینەیان ل سەر کەڤالان و ب دەستی بکێشیت وان.

بزاڤێن وی یێن دەستپێکی هەمی ژبۆ داهێنانا ڤی شێوازی د سەرکەفتی نەبوون، لێ پشتی هینگی ل سالا 1827 وی هەڤنیاس دگەل کەسەکێ دی کر ب ناڤێ "جوزێف نیبس" کو ویژی هەمان بیروکە هەبوو و مژیلی دروستکرنا کامیرەیەکا فوتوگرافی بوو لێ بزاڤێن ویژی د بێ بەرهەم بوون لەوڕا وان هەردووکان بریاردا پێکڤە کاربکەن و شیانێن خۆ ب مەزێخن.

ل سالا 1833 نیبسی وەغەرکر، لێ ڤێ چەندێ هیڤیی یێن داگیری نەمراندن بەلکو وی بریاردا ئەو ب تنێ کاربکەت هەتا دگەهیتە ئارمانجا خۆ، بزاڤێن وی د بەردەوام بوون هەتا ل سالا 1837 شیایی سیستەمەکێ پڕاکتیکیی ژبۆ کێشانا وینەیێن فوتوگرافی ب داهێنیت، وی ناڤێ ڤی سیستەمی کرە سیستەمێ داگیری.

ل سالا 1839 داگیری ئەڤ داهێنانا خۆ ل پێشچاڤ ێن خەلکی نیشاندا، لێ وی ئەڤ داهێنانە ب ناڤێ خۆ تومارنەکر، بەرامبەر ڤی کاری مەزن حکومەتا فرەنسا بریاردا موچەیەکێ سالانە بۆ داگیری و کورێ نیبسی تەرخان بکەن وەك رێزگرتن بۆ خزمەتا وان پێشکێشی مرۆڤایەتیێ کری. ڤێ داهێنانێ داگیر کرە زانایەکێ مەزن و ئێدی خەلکی وەك قارەمانەك چەلەنگ و سەردەم تەماشەی وی دکر، هەردیسان گەلەك نازناڤ و بروانامەیێن زانستی بۆ وی هاتنە پێشکێشکرن و چەندین ئاهەنگێن رێزگرتنێ ل گەلەك جهان بۆ هاتنە رێکخستن.

پشتی کو داگیر شیایی بگەهیتە ئارمانجا و کامیرەیێن فوتوگرافی داهێنیت، ل دوماهیێ بریاردا دەستا ژ ژیانا زانستی بەردەت و ئەڤ وەختێ مای ژ ژیێ بێهنا خۆ ڤەدەت و د ژیانەکا سادە بژیت هەتا ل سالا 1851 ل باژێرێ پاریس وەغەرکری.

ڤێ داهێنانێ کاریگەریەکا مەزن ل سەر ژیانا خەلکی هەبوو، پشتی هینگێ ب شێوەیەکێ بەرچاڤ وێنەیێن فوتوگرافی و سینەمایی گەلەك پێشکەفتنێن مەزن ب خۆڤە دیتن و هێدی هێدی گەلەك پێنگاڤێن مەزن هاتنە هاڤێتن و جورێن جوداجودا یێن کامیرەیان هاتنە دروستکرن کو تا ئەڤروکە ژی بەردەوم د پێشکەفتن و گوهۆرینێ دانە لێ ئەڤ چەندە هەمی ژبۆ رولێ داگیری دزڤریت.

هەژی گوتنێ یە کو بەری هینگێ نیبسی کەرەستەك دروستکربوو، دەمی وی ئەڤ کەرەستە دانابا سەر بەرپەرەکی یان کەڤالەکێ بچووك و پاشی دانابا دناڤ کامیرێ دا و دەمێ کامیرە ڤەکربا بۆ هندێ رۆناهی دناڤ ئاوێنەکا وێدا چووبایە ژور دا بیتە ئەگەرێ هندێ وێنەیەك ل سەر ڤی کەرەستەی بهێتە کێشان، ژبەر ڤێ چەندێ گەلەك دیروکنڤێس دیاردکەن کو رۆلێ نیبسی ژ رولێ داگیری کێمتر نینە د داهێنانا کامیرەیا فوتوگرافی دا.

د هەمان دەمدا زانایەکێ دی یێ بریتانی ب ناڤێ "تالیوت" شێوازەکێ دی یێن وینەکرنێ داهێنا کو دەربرینێ ژ گرتنا وێنەیەکێ نەرێنی دکر و ل دویڤدا ئەڤ وێنەیە دناڤ شلەیەکێ ترشدا دهێتە هەلگرتن و کوپیکرن.

ژ هینگێ وەرە تانوکە گەلەك جورێن کامیرە و ئاوێنە و پەرێن وێنەکرنێ یێن هەستیار یێن تەر و هشك و فلمێن خاڤ بۆ گرتنا وێنەیێن سادە یان وێنەیێن فوتوگرافی هاتینە دروستکرن، ل دووڤدا هندەك وێنەیێن دی هاتنە دروستکرن دبێژنێ وێنەیێن

بۆلارويد كو ل دەستپێكێ وێنەيان دگرن پاشى دهێنە دانان لبەر هەتاڤێ هەتا هشك دبن داكو ڕەنگێن وان باش دياربكەن، سەرەڕاى ڤان پێنگاڤان هەميان لێ داهێنانا داگيرى كەس بەرى هينگێ نەگەهشتبوويێ ژبەر هندێ ئەو ب تنێ هەژى هندێ يە ئەڤ داهێنانەب ناڤێ وى بهێت توماركرن.

## 48. سیمۆن بۆلیڤار Simon Bolivar

## (1830-1783)

### سیمۆن بۆلیڤار

### ئەو شۆڕەشگێرێ گشت وەلاتێن ئەمریکا لاتینی ڕزگار کرین

کێم جاران د دیروکێ دا کەسەکێ وەکی بۆلیڤاری پەیدابوویە کو شیابیت گشت وەلاتێن کێشوەرەکی ئازاد بکەت، لەورا یێ ژ هەژی یە ناڤێ وی دگەل مەزنترین کەسێن کاریگەر د دیروکێ دا بهێتە دانان.

سیمۆن بۆلیڤار دهێتە نیاسین ب ناسناڤێ "جۆرج واشنتۆنێ ئەمریکا لاتینی" ژبەر ڕۆلێ وی یێ گرنگ د ئازادکرنا پتریا وەلاتێن د کەڤنە کێشوەرێ ئەمریکا لاتینی ژبن دەستهەلاتا داگیرکەرێن ئیسپانی وەك وەلاتێن کۆلۆمبیا، فەنزویلا، ئەکوادۆر، پیرۆ و بۆلیڤیا.

سیمۆن بۆلیڤار ل 24 تیرمەها سالا 1783 ل دەڤەرا کاراکاس ل وەلاتێ فەنزوبلا ژ خێزانەکا ئەریستوکراتی یا ئیسپانی ژدایکبوویە. هەر د ژیێ 9 سالیێ دا بوویە ئێتیم. بۆلیڤار ژ بچووکاتیا خۆ ب سیاسەت و بیروباوەرێن تەڤگەرا ڕەوشەنگەرییێ یا فرەنسی[1] داخباربوویە. هەردیسان ئێك بوو ژ خواندەڤانێن پەرتووکێن فەیلەسوفێ ئینگلیزی جۆنی لۆکی هەردیسان فەیلەسوفێن فرەنسی وەك ڕۆسو و فۆلتێر و مۆنتێسکی.

ل دەمێ ژیێ گەنجاتیێ، سەرەدانا وەلاتێن ئەورۆپی کریە و ل سالا 1805 ل ڕۆما ل سەر گرێ "ئەڤێنتینا" ڕاوەستیا و سویند خوار کو وەلاتێ خۆ ژبن دەستێ داگیرکەرێن ئیسپانی ڕزگار بکەت.

---

(1) تەڤگەرا رۆهنکرنێ یا فرەنسی The Enlightenment in France زاراڤەکە ل ل چەرخێ هەژدێ زاینی دناڤ فەلسەفەیا ئەورۆپی دا دا بەلاڤبوویە کو تێدا شۆڕەشەکا ڕەوشەبیری و فەلسەفی پەیدابوو و بەرەڤانی ژ هشیاریا مێشکێ مرۆڤی دکر وەك بنیات ژبۆ دانانا سیستەمەکێ یاسایی ژبۆ رەوشت و زانینی بێی مایتێکرنا ئاینی.

ل سالا 1808 ناپوليون بۆناپەرتى وەلاتێ ئیسپانیا داگیرکر و برایێ خۆ کرە سەروکێ حکومەتا وی سەردەمی. ناپولیونی دەرفەتەکا زێرین ژبۆ وەلاتێن کێشوەرێ ئەمریکا باشور پەیداکر کو دژی دەستهەلاتدارێن ئیسپانی شەڕی بکەن و وەلاتێن خۆ ڕزگار بکەن.

ل سالا 1810 شۆڕەشا گەلێ فەنزوێلا دژی داگیرکەرێن ئیسپانی سەرهلدا و ل سالا 1811 سەربەخۆیا خۆ ب شێوەیەکێ فەرمی ڕاگەهاند، د هەمان سالێدا بۆلیڤار وەك ئەفسەر دناڤ ڕێزێن لەشکەرێ شۆڕەشێ دا هاتە دامەزراندن، لێ ل سالا دویڤدا داگیرکەرێن ئیسپانی شیان دووبارە وەلاتێ فەنزوێلا داگیر بکەن و سەروکێ شۆڕەشێ فڕانسیسکو میڕاندای دەستگیر بکەن و بکەنە د زیندانێ ڤە، لێ بۆلیڤار شیا خۆ ڕزگار بکەت و ب ڕەڤیت.

پشتی هینگێ چەندین شەڕێن دژوار دناڤبەرا شۆڕەشگێرێن فەنزوێلا و لەشکەرێ ئیسپانی دا ڕوودان و چەندین کارەساتێن مەزن و ڕوودانێن دلتەزین پەیدابوون، هەتا ل سالا 1819 کو ب خالا گوهۆرینێ دهێتە نیاسین هاتی ئەوژی دەمێ بۆلیڤاری سەرکردایەتیا لەشکەرەکێ بچووك دکر و ژ ڕوبار و گەلی و نهالێن چیایێن ئەندیزێ ڕا بورین و هێرش کریە سەر هێزین ئیسپانی ل کۆلۆمبیا، ل شەڕێ ب ناڤودەنگ "بایۆکا" ل 7 تەباخا 1819 شیا سەرکەفتنەکا مەزن ل سەر لەشکەرێ ئیسپانی تومار بکەت و ئەڤ شەڕە دهێتە هەژمارتن خالا گوهۆرینا ڕاستەقینە د شۆڕەشا گەلێ فەنزوێلا دا ل سەر ئیسپانیا.

ل سالا 1821 وەلاتێ فەنزوێلا دووبارە هاتە ئازادکرن و ل سالا 1822 وەلاتێ ئیکوادور ژی هاتە ئازاد کرن.

شۆڕەشگێرێ ئەرژەنتینی "خوسیە دی سان مارتن" شیا وەلاتێن ئەرژەنتین و چیلی ژبن دەستهەلاتا داگیرکەرێن ئیسپانی ڕزگاربکەت، هەروەسا سوزدابوو کو وەلاتێ پیرو ژی ڕزگار بکەت. ل هاڤینا سالا 1822 هەردوو شۆڕەشگێران دی مارتن و بۆلیڤاری ل بازێرێ گوایاکیل ل وەلاتێ ئیکوادور ئێکوو دوو دیت، لێ ئەڤ هەردوو شۆڕەشگێرە نەشیان پێکبهێن ژبەر هزرو بوچوونێن وان یێن ژێکدوور لەوڕا پشتی هینگێ دی مارتنی بڕیار دا ب ئێکجاری دەست ژ شەڕی بەردەت و ئەو وەلاتێن وی ڕزگار کرین بەسن.

لێ ل سالا 1824 لەشکەرێ بۆلیڤاری بەردەوام بوون ل سەر شەڕی هەتا شیاین وەلاتێ پیرو و وەلاتێ پیرویێ بلند (وەلاتێ بۆلیڤار یێ نوکە) ڕزگار بکەن و ب ئێکجاری هێزێن ئیسپانی ژناڤ ببەن.

# 49. ڕینێ دیکارت Rene Descartes

# (1650-1596)

## دیکارت

### زانایێ ماتماتیکی یێ بەرێ بنیاتێ زانستێ ئەندازیاریا شرۆڤەکرنێ دانای

ڕێنێ دیکارت فەیلەسوفەکێ ماتماتیکی و زانایەکێ فڕەنسی یێ ناڤدارە ل سالا 1596 ل باژێرێ لاهای ژدایکبوویە کو ل وی دەمێ هێشتا گوند بوو، دیکارتی خۆاندنا خۆ ل قوتابخانا گوندی دەستپێکر و دەمێ بویە 20 سالێ شیا باوەرناما یاسایی ل زانکۆیا "بواتی" بدەستخوڤە بینیت لێ وی کار ب ڤێ باوەرنامێ نەکر.

دەمێ هێشتا یێ گەنج، دیکارتی دزانی کو ئەوی چ پێزانین ل سەر چ بوارێن زانستی نینن ب تنێ بوارێ ماتماتیکێ نەبیت لەوڕا وی بریاردا ل گەلەك وەلاتێن جیهانێ بگەریت داکو فێری هندەك تشتێن نوو ببیت. ژبەرکو ئەو ژ بنەماڵەکا دەولەمەند بوو لەوڕا ڤێ چەندێ هاریکاریا وی کر بشێت ئارمانجا خۆ بجهبینیت و پتریا دەمێ خۆ ل دەرڤەی وەلاتێ فڕەنسا ب گەریانان ڤە بوراند.

دیکارتی پەیوەندی ب ڕێزێن سێ لەشکەران کر: ئەوژی لەشکەرێ هولەندا و بافاریا و مەجەر، لێ وی بەشداری د چ شەڕان دا نەکر. هەردیسان وی سەرەدانا وەلاتێن ئیتالیا و پولەندا و دانیمارك ژی کربوو، د ڤان گەریانێن وی دا ئەو گەهشتە ڕاستیەکێ ئەوژی ڕێبازا لێگەریانا ڕاستیێ بوو.

ژیێ وی 32 سالێ بوو دەمێ ئەو ب دروستاهی ل سەر ڤێ ڕێبازیٚ هەلبووی یاکو بزاڤ دکر ب ڕێکا وێ ئاشنای هەمی زانیاریێن مرۆڤایەتیێ بیت بەلکی ئەڤ چەندە هاریکاریا وی بکەت بگەهیتە ڕاستیێ د هەمی تشتاندا، دیکارت بۆ ماوێ پتر ژ 20 سالان ل وەلاتێ هۆلەندا ئاکنجی بوو، وی گەلەك حەز ژ ڤی وەلاتی دکر و هەلبژراتنا وی بۆ هندێ دزڤڕی کو وی دیت ئازادیا ل وەلاتێ هۆلەندا نە وەکی وەلاتێن دی یا سنوردارە بەلکو خەلکێ وێ

ژلایێ ئازادیا بیروبوچوونان و هزرکرنێ د ئازادن، لێ ئەڤ جورێ ژیانێ و ئێمناهیا کەشوهەوای ل باژێرێ پاریسێ نەبوو.

ل سالا 1629 دیکارتی دەست ب نڤیسینا پەرتووکەکێ ب ناڤێ "یاسایێن ئاراستەکرنا مێشکی" کر کو تێدا یاسایێن ڕێبازا خۆ یا نوو تێدا دیارکربوون، دیکارتی بریاردا بوو ڤان یاسایین د دوو بەرگاندا بەلاڤ بکەت لێ ئەو نەگەهشتبوو بەرگێ دووێ تەمام بکەت لەورا بەرگێ ئێکێ ژی ب نیڤ تەمامی پشتی مرنا وی ب 50 سالان ژ نوو هاتە بەلاڤکرن.

دناڤبەرا سالێن 1630 هەتا 1634 و ب هاریکاریا ڕیبازا خۆ، دیکارتی بریاردا ڤەکۆلینێ ل سەر چەندین بوارێن زانستی بکەت، ل دەستپێکێ وی بەرێ خۆ دا زانستێ فرمانزانی و کەلاشتنا لەشێ مرۆڤی، بۆ ڤێ چەندێ وی بریاردا ئەو ب خۆ ڤەکۆلینان ل سەر لەشێ گیانەوەران ئەنجامبدەت و ئەو ب خۆ لەشێ وان ب کەلێشیت. هەردیسان ژلایەکێ دیڤە دیکارتی وەختێ بۆ خواندنا چەندین زانستی تەرخان کربوو وەك زانستێ ئوپتیکان، گەردونناسی، ماتماتیك و گەلەك زانستێن دی.

دیکارتی بریاردابوو هەمی کارو ڤەکۆلینیێن خۆ خڕڤە بکەت و د پەرتووکەکێ ب ناڤێ "جیهان"دا بەلاڤ بکەتن لێ پشتی ل سالا 1633 ئەو ژ ئامادەکرنا ڤێ پەرتووکێ بدوماهی هاتی، دەنگوباس گەهشتنە دیکارتی کو ل وەلاتێ ئیتالیا زەلامێن دێرێ یێن ل سەر ڕیبازا کاسولیکی بریاردایە گشت کارێن زانایێ بناڤودەنگ گالیلی ب سوژن ژبەرکو گالیلی ب شێوەیەکێ فەرمی و ئاشکەرا پشتەڤانیا تیورێن زانایێ گەردونانس "کوبەرنیکوسی" دکر ئەوێ بەری هینگێ ب چەند چاخەکا دیارکری کو ڕۆژ سەنتەرێ گەردونا مەیە و عەرد و گشت هەسارەیێن دی ل دور ڕۆژێ دزڤڕن نەکو عەرد یێ پەحنە و ڕۆژ ل دور دزڤڕیت.

هەرچەندە وەلاتێ هۆلەندا ژ دەستهەلاتدرێن وەلاتێ ئیتالیا و حوکمێ دێرا کاسولیکی یا دیربوو، لێ دیکارت تڕسیا زیان بگەهیتە وی و کارێن وی بهێنە ژناڤبرن لەورا وی بریاردا ڤێ پەرتووکا خۆ ل ڤی دەمی بەلاڤ نەکەت، پشتی هینگێ ل سالا 1637 دیکارتی پەرتووکەکا دی بەلاڤکر کو ناڤەرۆکا وێ باشتر و زەنگینتربوو ژ پەرتووکا بەری

نوکه، وی ناڤێ ڤێ پەرتووکێ کره "گوتارەك ل دور ڕێبازا باشترلێکرنا ئاڕاستەکرنا مێشکی ژپێخەمەت بدەستڤەئینانا ڕاستییێ د زانستی دا".

دیکارتی ئەڤ پەرتووکا خۆ ب زمانێ فرەنسی بەلاڤکر نەك زمانێ لاتینی، مەرەما وی ژڤێ چەندێ ئەوبوو داکو هژمارەکا مەزن یا کەسێن خواندەڤان و ڕەوشەنبیر بشێن پەرتووکا وی بخوینن نەك تنێ ئەو کەسێن دچنە زانکۆیان ژبەرکو ل وی سەردەمی زمانێ لاتینی نە هند یێ بەربەلاڤ بوو ب تایبەت ل وەلاتێ هولەندا، پشتی هینگێ دیکارتی سێ پاشەبەند ل سەر پەرتووکا خۆ زێدەکرن هندەك نمونە بوون ژ وان ل سەر ئەنجامێن وان ڤەکۆلینان یێن وی ب ڕێکا ڤێ ڕێبازێ بدەستخوڤە ئینایین.

پاشبەندێ ئێکێ ل سەر زانستێ ئوپتیکان بوو، دڤی پاشەندی دا وی بەحسێ دیاردا شکەستنا ڕۆناهییێ دکر دەمێ لبەر تشتەکی دکەڤیت یان دچیتە دناڤ ئاڤێ دا، زێدەباری گەنگەشەکرنا چەندین جورێن ئاوێنەیان و کەرەستێن دهێنە ب کارئینان د زانستێ ئوپیتکان دا. هەردیسان وی ڤەکۆلین ل سەر پێکهاتنا چاڤی و فرمانێن وی و ئەو نەخۆشیێن تووشی چاڤا دبن کربوو، ل دویڤدا وی تیورەك دەربارەی سرۆشتێ پێکهاتنا ڕۆناهییێ پێشکێشکر کو تەمامکەرا تیورا پێلێن ڕۆناهییێ بوو کو هەتا وی دەمی ژی هێشتا ئەڤ پێله نەهاتبوونە ئاشکەرا کرن بەلکو پشتی هینگێ ب چەند ساڵەکان ژ نوو هاتنە ئاشکەراکرن.

د پاشەبەندێ دووێ دا، دیکارتی بەحسێ ستێرو ئەختەر و عەور و بارانێ دکر کو دهێنە هەژمارتن ئێکەم ڤەکۆلینێن زانستی دڤی بواری دا، هەردیسان دیکارت ئێکەم کەس بوو ب شێوەیەکێ زانستی بەحسێ دیاردا کەسك وسوری بکەت ئەوا بۆ ماوێ چەند خولەکان پشتی بارینا بارانێ ل پشت عەوران دروست دبیت.

پاشەندێ سیێ ژی یێ تایبەت بوو ژبۆ زانستێ ئەندازیارییێ، ئێك ژ گرنگترین داهێنانێن دیکارتی دبوارێ ئەندازیارییێ دا تومارکری پەیوەندی ب ئەندازیاریا شرۆڤەکرنێ ڤە هەبوو، ژلاییێ زانستی ڤی ڤێ داهێنانێ گرنگیەکا مەزن هەبوو کو پشتی هینگێ ڕێك لبەر گەلەك زانایان کورتکر هندەك داهێنانێن دی تومارباکەن ب تایبەت زانایێ ناڤدار نیوتنی گەلەك مفا ژ ڤێ داهێنانێ وەرگرتن ژبۆ داهێنانا خۆ یا ماتماتیکی ئەوا پەیوەندی ب هەژمارتنا جوداکرن و تەمامکرنێ ڤە هەی.

ئێك ژ وان تشتێن هەرە سەیر یێن دیکارتی د هزرکرنا خۆ یا زانستی دا باوەری پێ ئینای ئەوبوو کو دڤێت مرۆڤ ژ هەمی تشان گومان بکەڤیت هەتا ب گەهیتە ڕاستیێ ژبەرکو ڕاستی ل وی دەمی دیاردبیت دەمێ مرۆڤ گومانێ ژ وان تشتان هەلدگریت و ئەڤ گومانە ل دوماهیێ بەرێ مرۆڤی ددەنە ڕاستیێ، دیکارتی ئەڤ گومانە ژ وان تشتان دهەلگرت یێن وی ژ ماموستاییێن خۆ وەردگرت یان د پەرتووکان دا دخواند.

ل دویڤدا دیکارت بەرەڤ لایەنێ فەلسەفی و ل دەستپێکا کارێن خۆ دگوت: ئەز یێ هزردکەم، ڕامانا وێ ئەوە من هەبوونا خۆ د ژیانێ دا یا هەی، مەرەما وی ژ ڤێ گوتنێ ئەوبوو کو ب تنێ وی دەمی مرۆڤێن زیندی هەبوونا خۆ دیاردکەن دەمێ ئەو هزرا خۆ د هەمی تشتان دا دکەن، هەردیسان دیکارت ئێك ژ وان کەسان بوو یێن باوەری ب تشتێن ئەفسانەیی نەیی ب تایبەت دبوارێ زانستی دا لەوڕا وی بزاڤ کر ڤان ئەفسانەیان ژ زانستی دوور بێخیت. هەرچەندە دیکارت کەسەکێ ديندار و باوەری ب هەبوونا خودێ هەبوو لێ ژبەرکو وی گومان ژ هەمی تشتان دهەلگرت، زەلامێن دێرێ ژبەر هزروبیرێن وی د ئارام نەبوون و وان هزدکر ڕۆژەك دێ هێت ئەو دێ دژی وان ژی ڕاوەستیت.

پشتی هینگێ دیکارتی پەرتووکەکا دی ب ناڤێ "هیڤی خواستن" بەلاڤکر، لێ زەلامێن دێرێ دیت ئەڤ چەندە دێ خەلکی دژی وان هاندەت لەوڕا بریار هاتەدان گشت پەرتووکێن وی بهێنە قەدەغەکرن، ژلایەکێ دیڤە پەرتووکێن وی هند باوەکا مەزن دناڤ خەلکی نەبوو، هەرچەندە شێوازێ وی یێ نڤێسینێ یێ ب سانەهی بوو لێ ژبەرکو ئەو گەلەك ب هویری و کویری دچوو دناڤ بابەتێن زانستی دا لەوڕا ژبۆ خەلکی یا ب زەحمەت بوو د مەرەمێن وی بگەهن.

ل سالا 1649 داخازنامەك ژلایێ شاهژنا هولەندا "کریستینا"یێ بۆ وی هات و داخواز ژێ کر ببیتە ماموستایێ وێ یێ تایبەت، ل دەستپێکێ ڤێ چەندێ کەیفا وی گەلەك ئینا لێ ڤێ کەیفا وی گەلەك نەڤەکێشا ژبەرکو شاهژن هەمی گاڤا دەمژمێر پێنچێ سپێدێ ژخەو هشیار دبوو حەزدکر ل وی دەمی وانە وەرگرتبان، لێ دیکارت کەسەك بوو گەلەك حەز ژ خەوێ و ژورێن گەرم دکر و درەنگ ژ خەو هشیار دبوو، ئەڤێ چەندێ ژی ب شێوەیەکێ نەرێنی کارتێکرن کرە سەر ساخلەمیا وی هەتا تووشی نەخۆشیا هەودانا سیهان بووی و پشتی چوار هەیڤان ل شواتا 1650 وەغەرکر.

دیكارت ئێك ژ وان زانایان بوو یێن ژیانا هەڤژینیێ پێكنەئینای ، هندەك ژێدەر دیاردكەن كو وی كچەكا نە شەرعی هەبوو لێ هێشتا یا زاروك وەغەركربوو.

دیكارت ئێك ژ وان زانا و فەیلەسوفان بوو یێن گەلەك دژایەتیا وی هاتیە كرن، لێ دڤێ پەرتووكێ دا مە گرنگی نەدایە هندێ كا هەتا چ رادە بوچوونێن وی د راست یان شاش بوون، ژبەركو مەزناهیا هەر فەیلەسوفەكی ل سەر هندێ دهێتە هەلسەنگاندن كا چەند كارتێكرن ل سەر خەلكی كریە، لەورا دیكارت دهێتە هەژمارتن ئێك ژ وان كەسایەتیێن كارتێكرنەكا مەزن ل سەر خەلكی كری، ئەگەرێ سەرەكی یێ دانانا ناڤێ دیكارتی لبەر هندەك فەیلەسوفێن دی وەك ڤولتێر و جان جاك روسو و فرانسیس نیكونی بۆ هندێ دزڤریت كو ژبلی كارێن وی یێن فەلسەفی، ئەندازیاریا شرۆڤەكرنی داهێنابوو

## 50. مایکل ئەنجلو Michelangelo

## (1475ز-1546ز.)

### مایکل ئەنجلو

### ناڤداترین هونەرمەندێ پەیکەرتاش و نیگارکێش د دیروکێ دا

هونەرمەندێ چەرخێ سەرهلدانا مەزن مایکل ئەنجلو دهێتە هەژمارتن ئێك ژ هونەرمەند و کەسایەتیێن هەرە ناڤدار د دیروکا هونەرێن شێوەکاری دا، ئەنجلو نیگارکێشەکێ دەستڕەنگین ,پەیکەرتاشەکێ بەهرەمەند و ئەندازیارەکێ بیناسازی یێ مەزن بوو و ژبەرکو ئەو کارێن وی ل پشت خوٚ هێلاین کاریگەری بوٚ ماوێ پتر ژ چوار چەرخان ل سەر خەلکی کریە و کارێن وی یێن هونەری شونتبلەکا کویر ل سەر هەمی کارێن هونەری ل ئەوروٚپا هەبوویە.

مایکل ئەنجلو ل سالا 1475 زاینی ل باژێرێ "کابرێزا" یێ کو میلەکی ژ باژێرێ فلوڕەنسا دوور ژدایکبوویە. هەر ژ بچووکاتی بەهرەیا هونەری ل دەڤ دیاربوویە. د ژیێ 13 سالیێ دا چوو بەر دەستێ هونەرمەندێ ناڤدار "گیرلاندیو"ی ل باژێرێ فلوڕەنسا، دەمێ ژیێ وی بووینە 15 سالێ چوو مالا "لورنتزو مدیچی" کو حاکمێ فلوڕەنسا یێ وی سەردەمی بوو و ژیانا خوٚ دگەل ڤێ خێزانا زەنگین و ناڤودەنگ بوراند.

هەر زوی بەهرەیا وی یا هونەری دیاربوو و بوو ئێك ژ هونەرمەندێن ناڤدار لەوڕا گەلەك ژ شاه و خێزانێن زەنگین داخاز ژێ دکر بوٚ وان وێنەیان ب کێشیت و پەیکەران دروست بکەت و نەخشێ ئاڤاهیێن وان ب دانیت. سەرەڕای هندێ کو گەلەك هاتنوچوون دناڤبەرا باژێر و وەلاتاندا دکر لێ وی پتریا ژیانا خوٚ ل باژێرێن ڕوٚما و فلوڕەنسا بوراند.

مایکل ئەنجلو ل سالا 1564 هەر ل باژێرێ ڕوٚما د ژیێ 89 سالیێ وەغەرکر لێ ژیانا هەڤژینیێ پێکنەئینابوو.

هەرچەندە مایيكل ئەنجلو وەكى هونەرمەندێ سەردەمێ خۆ ليوناردو داڤينشى يێ ناڤدار نەبوو، لێ بەهرەيا وى يا هونەرى يا بێ سنوور بوو، ئەم دشێن بێژين هونەرمەندێ ئێكانەبوو يێ كو شياى د دوو بوارێن هونەرى دا ب گەهيتە گوپيتكا سەركەفتنێ ئەوژى بوارێ نيگاركێشى و ئەندازياريێ دا و كاريگەرى ل سەر چەندين هونەرمەندێن پشتى خۆ هەبوويە.

ئەو وێنەيێن ل سەر ديوارێن دێرا قەشە بۆترِسى ل ڤاتيكانێ دهێنە هەژمارتن ئێك ژ مەزنترين كارێن هونەرى د هەمى چەرخاندا، سەرەراى ڤان نيگارێن جوان لێ مايكل ئەنجلوى خۆ وەك پەيكەرتاشەك ددیت و ئەو كارێن وى يێن پەيكەرتاشى ئەنجامداين وەكى وان د ديروكێ دا نەبووينە، هەردوو پەيكەرێن "موسا و داوودى" و پەيكەرێ "دلوڤانى" دهێنە هەژمارتن باشترين كارێن پەيكەرتاشى د ديروكێ دا.

هەرديسان مايكل ئەنجلو ئەندازيارەكێ چەلەنگ و بێ هەڤرك بوو، ئێك ژ مەزنترين كارێن وى يێن ئەندازەى ئاڤاهيێ دێرا "مديچى" بوو ل باژێرێ فلورەنسا، هەرديسان ئەنجلوى بۆ ماوەيەكێ درێژ وەك ئەندازيار كار ل سەر دێرا قەشە بۆترِسى ل ڤاتيكانێ دكر، د هەمان دەمدا مايكل ئەنجلو كەسەكێ هوزانڤان بوو و نێزيكێ 300 هوزانان يێن ڤەهاندين كو هەتا نوكەژى د پاراستينە، لێ وى ئەڤ هوزانە بەلاڤ نەكربوون بەلكو پشتى مرنا وى شنى هاتبوونە بەلاڤكرن، ئەڤ هوزانە تا رادەيەكێ مەزن دەربرينێ ژ كەسايەتيا وى دكەن.

هەروەكى بەرى نوكە دگەل هوزانڤانێ ناڤدار شكسپيرى مە دايە دياركرن كو هونەر و هونەرمەندان كاريگەريەكا مەزن ل سەر ژيانا خەلكى نەكريە وەكى وێ كاريگەريا سياسەت و زەلامێن ئولى و زانايان كرى، ژبەر ڤێ چەندێ ژى مە مايكل ئەنجلو سەرەراى بەهرەيا وى يا بێ وێنە لێ ناڤى وى مە ل ڤێ رێزێ دانايە كو ناڤێ وى پشتى هندەك كەسێن زانا و داهێنەر هاتيە رەنگە ناڤودەنگيا وان د ديروكێ دا كێمتربوويە ژ ناڤداريا مايكل ئەنجلوى.

## 51. پاپا ئۆربانێ دووێ Pop Urban II

## (1042ز- 1099ز.)

### پاپا ئۆربانێ دووێ

### ئەو پاپایێ بوویە ئەگەرێ پەیدابوونا شەڕێن سەد سالی یێن خاچپەرێسان

ڕەنگە گەلەك کەسان گوهـ ل ناڤێ ڤی پاپای نەبیت، لێ ئەڤ پاپایە ئێکە ژ وان کەسێن کێم یێن کو شیای کاریگەریەکا مەزن ل سەر ئاینێ مەسیحیەتێ د دیروکێ دا ب جهـ بهێلیت. کاریگەریا ڤی پاپای ل سەر جیهانا مەسیحەتێ گەلەك یا بهێز و ڕاستەخۆ بوو ژبەرکو ئەوبوو ئەگەرێ پەیدابوونا شەڕێن خاچپەرێسان و ڤەگەڕاندنا عەردێن پیروز یێن مەسیحیان.

ناڤێ وی یێ دروست "ئۆدو دلاگری" بوو، ل سالا 1042 زاینی ل نێزیکی باژێرێ "شاتیون"ل سەر ڕۆیبارێ "مارن" ل فرەنسا ژدایکبوویە، ل وی سەردەمی مالباتا وی یا ناڤدار و زەنگین بوو ژبەر هندێ شیا هەر زوی بچیتە خواندنگەهێ و خواندن و زانینەکا باش فێربیت، هەر ل دەستپێکا گەنجاتیێ خۆ بەرەڤ ژیانا قەشاتیێ چوو هەتا ل سالا 1088 بوویە پاپایێ کاسولیکیان.

ئەڤ پاپایە خۆدان کەسایەتیەکا ب هێز و کاریگەر بوو، لێ ئەڤ تایبەتمەندیە ب تنێ بەس نینن کو ئەم ناڤێ وی ب دانیە دگەل لیستا کەسێن کاریگەر د دیروکێ دا، بەلکو ناڤۆدەنگی و مەزناهیا وی پشتی وێ گوتارا وی یا ناڤدار هات ئەوا ل ڕۆژا 27 چریا دوێ یا سالا 1095 زاینی پێشکێشکری.

ل ڤێ ڕۆژێ پاپا ئۆربانی داخازا کومبونەکا مەزن ل دێرا باژێرێ "کلیرمۆن"ێ کر کو ب هزارەها خەلك لێ ئامادەبوون، د ڤێ کومبوونێ دا پاپای مەزنترین و کاریگەرترین گوتار د دیروکێ دا پێشکێشکر کو کاریگەریا وێ بۆ ماوێ چەندین چەرخێن ل دویڤدا ڤەکێشا. د کومبوونێ دا پاپای داخازا ژ خەلکێ مەسیحیی کر شەڕێ سەلجوقی یێن ترك بکەن کو عەردێ پیروزێ مەسیحیان داگیرکربوو و دێر و پەرستگەهێن وان خرابکربوون.

وی داخاز ژ مەسیحیان کر شەڕی بکەن ژ پێخەمەت ڕزگارکرنا ڤان جهێن پیروز ژ دەستێ موسلمانان.

وی ئەڤ چەندە ب تنێ داخاز نەکر بەلکو وی داخازا ژ مەسیحیان کر پشتی ڤان جهان ڕزگار دکەن ل وێرێ ئاکنجی ژی بن ژبەرکو ئەو جهـ گەلەك ژ ئەوروپا پیروزتر و زەنگینترن، ل دویڤدا وی دیارکر ئەو دێ داخازا گونەهژێبرنێ ژ خدایێ مەزن کەت ژبۆ هەمی وان کەسان یێن پشکداریێ دڤان شەڕێن خاچپەرێساندا دکەن.

بەری ئۆربان گوتارا خۆ ب دوماهی بینیت خەلکی هەمیان کرە هەوار و گوت: ئەڤ چەندە حەزکرنا خودێ یە، ئەڤ گوتنە بوو دروشمێ شەڕێن خاچپەرێسان ژبۆ ماوێ چەندین چەرخان و هەر  گاڤا ئەو چووبانە شەڕەکی دا بێژن ئەڤ شەڕکرنە ژ حەزکرنا خودێ یە ئەو دێ مە ب سەرئێخیت.

پشتی چەند هەیڤەکان ژ گوتارا وی، شەڕێ خاچپەرێسان یێ ئێکێ دەستپێکر، پاشی شەڕێ خاچپەرێسان یێ دوێ و سیێ ژی دەستپێکرن هەتا بووینە هەشت شەڕ، ڤان شەڕان بۆ ماوێ پتر ژ 100 سالاْن ڤەکێشان.

پاپا ئۆربان ب خۆ ل سالاْ 1099 ئانکو پشتی دوو حەفتیان ژ دەست سەرداگرتنا باژێرێ قودسێ ژلایێ خاچپەرێسانڤە وەغەرکر، لێ دەنگوباسێ ڤێ سەرکەفتنا مەزن نەگەهشتە پاپای.

هەلْبەت مەترسی و کاریگەریا ڤان شەڕێن خاچپەرێسان و کاریگەریا وان ل سەر ئەوروپا و ئاسیا و ئەفریقیا بۆ مە هەمیان یا دیارە، زێدەباری کاریگەریا ڤان شەڕان ل سەر خەلکێ وان دەڤەرێن پشکداری د ڤان شەڕاندا دکری و  وی خەلکێ بەرەڤانی دکر، ئەڤ شەڕە بوونە ئەگەرێ لێکنێزیکرنا ڕۆژهەلات و ڕۆژئاڤای، د هەمان دەمدا بۆ خەلکێ ڕۆژئاڤای دیاربوو کو شارستانیا ڕۆژهەلاتی گەلەك یا پێشکەفتی و ئەڤ لێکنێزکبوونا ڕۆژهەلات و ڕۆژئاڤای بوونە ئەگەرێ پەیدابوونا سەردەمێ شۆڕەشا ئەوروپی و پێشکەفتنا وان.

هەژی گوتنێ یە ئەگەر کاودانێن وی سەردەمی د گونجای نەبانە، گوتارا پاپا ئۆربانی ژی چ کاریگەریا خۆ نەدبوو، هەردیسان بۆ هشیارکرنا هزروبیرێن خەلکی و لڤاندنا هەست و سوزێن وان، ئەڤ چەندە دێ پێدڤی ب هەبوون کەسایەتیەکا بهێز بیت و ل وی

سەردەمی چ کەسێن سیاسی یێن زیرەك وەکی پاپای نەبوون کو بشێت تا ڤی ڕادەی کارتێکرنێ ل سەر خەلکی بکەت.

ل وی سەردەمی کەسەك ب تنێ هەبوو کو شیایی ب کویراتی بچیتە دناڤ دلێن خەلکی دا و کاریگەریەکا ڕیشەی ل دل و مێشکێ وان بکەت ئەوژی پاپا ئۆربانێ دووێ بوو، ئەڤ ئەڤ کەسە و شێوازێ وی یێ گوتاربێژیێ نەبایە چ سەرکردێن دی یێن سیاسی نەهاتبانە و ئەڤ کارتێکرنە ل خەلکی کربایە و ڕەنگە شەڕێن خاچپەرێسان ژی پەیدانەبانە، لەوڕا یا ژ هەژیە ناڤێ ڤی کەسایەتیێ ئاینی دناڤ لیستا کاریگەرترین مروڤ د دیروکێ دا بهێتە دانان.

## 52. عومەرێ كورێ خەتابی 'Umar ibn al-Khattab

## (586ز. – 644ز.)

### عومەرێ كورێ خەتابی

### ئەو خەلیفێ بوویە ئەگەر ئاینێ ئیسلامێ ل گەلەك وەلاتان بهێتە بەلاڤكرن

عومەرێ كورێ خەتابی (ڕازیبوونا خودێ ل سەر بیت) دووەم خەلیفێ موسلمانان بوو پشتی ئەبوبەكرێ كورێ سەدیقی، عومەر ژ پێغەمبەری بچووكیتر بوو و ئەوژی ل مەكەهێ ژدایكببوو، لێ ب دروستاهی سالا ژدایكبوون و مرنا وی نەهاتیە زانین.

عومەر ئێك ژ دژوارترین و مەزنترین دوژمنێن پێغەمبەری و ئاینێ ئیسلامێ بوو، لێ پشتی هاتیە دناڤ ئیسلامێ دا و موسلمان بووی بوو ئێك ژ زیرەكترین و چاڤنەترسترین بانگخوازێن ئاینێ ئیسلامێ، ئەم دشێن بێژین هاتنا عومەری بۆ ناڤ ئیسلامی وەكی هاتنا پەیامنێر بۆلسی بوو بۆ ناڤ ئاینێ مەسیحیەتێ. عومەر هەتا هاتیە شەهیدكر ئێك بوو ژ نێزیكترین هەڤالێن پێغەمەبەری.

ل سالا 632 زاینی و پشتی مرنا پێغەمبەری، پێغەمبەری چ خەلیفە یانژی جهگر پشتی خۆ نەهەلبژارتبوون لێ عومەری ئێكسەر بەیعە دا ئەبوبەكرێ كورێ سەدیقی و كرە خەلیفێ موسلمانان، ئەڤ بەیعە بوو ئەگەر هەڤڕكی و شەڕ دناڤبەرا موسلمانان ب خۆدا پەیدانەبن، هەرچەندە ئەبوبەكر خەلیفەیەكێ سەركەفتی و زیرەك بوو لێ ماوێ خەلافەتا وی ب تنێ دوو سالان ڤەكێشا و پاشی چوو بەر دلوڤانیا خودێ.

لێ بەری مرنا خۆ، ئەبوبەكری عومەر وەك خەلیفە هەلبژارت، ل وی سەردەمی هەلبژارتنا عومەری بریارەكا وێرەكانەبوو و ڤێ چەندێ ژی ڕێگری ل هەمبەر پەیدابوونا شەڕی و هەڤڕكیان دناڤ موسلماناندا گرت. ل سالا 634 زاینی عومەرێ كورێ خەتابی هاتە هەلبژارتن وەك دووەم خەلیفێ موسلمانان و ماوێ خەلافەتا وی هەتا سالا 644 ڤەكێشا پشتی كو ل مەدینێ ژلایێ عەبدەكێ فارسیڤە هاتیە شەهیدكرن.

دەمێ عومەر کەفتیە بەر پێلێن مرنێ ب چەندین دەمژمێرەکان، کومەکا موسلمانان ل دور خۆ کومکرن کو ژ شەش کەسان پێکدهات داکو پشتی وی خەلیفەیەکی بۆ موسلمانان هەلبژێرن ژ پێخەمەت ئێکگرتنا موسلمانان و ڕێگرتنێ ل هەمبەر هەڤڕکیێ سەرا خەلافەتێ. ڤان کەسان ژی ب کودەنگی عوسمانێ کورێ عەفانی وەك سێیەم خەلیفێ موسلمانان هەلبژارت کو ماوێ خەلافەتا وی ژ سالا 644 هەتا 656 ڤەکێشا.

د ماوێ خەلافەتا عومەری دا کو نێزیکی 10 سالان ڤەکێشابوو، هێزێن ئیسلامی سەرکەفتنێن مەزن تومارکربوون و گەلەك وەلات ڕزگارکرن، ل دەستپێکێ هێزێن موسلمانان وەلاتێن سوریا و فەلەستینی ژبن دەستێ بیزەنتیان ڕزگارکرن، ل شەڕێ یەرموکێ ل سالا 636 موسلمانان سەرکەفتنەکا مەزن ل سەر هێزێن بیزەنتیان تومارکر وهەر ل وێ سالێ باژێرێ دیمەشقێ هاتە ئازادکرن و پشتی هینگێ ب دوو سالان باژێرێ قودسێ ژی هاتە ئازادکرن. ل سالا 639 لەشکەرێ موسلمانان بەرەڤ وەلاتێ مسرێ ڤە چوون کو ئەوژی ل ژێر دەستهەلاتا ئیمپراتۆریا بیزەنتیڤەبوو و پشتی بورینا سێ سالان ژ شەڕکرنێ وەلاتێ مسرێ ژی ب تەمامی هاتە ڕزگارکرن.

بەری کو عومەر ببیتە خەلیفە ب ماوەیەکێ کێم، هێزێن موسلمانان بەرەڤ عیراقێ چوبوون کو هینگێ ل ژێر دەستهەلاتا ئیمپراتۆریا ساسانی و سەفەویڤە بوو، لێ هێزێن موسلمانان ل سەردەمێ عومەری ل سالا 637 د شەڕێ "قادسیە"دا شیان هێزێن سەفەویان بشکێنن و هەتا سالا 642 وەلاتێ عیراقێ ب تەمامی کەفتە ژێر دەستێ موسلمانان ئەوژی پشتی شەرەکێ درێژ و خویناوی ل دەڤەرا "نەهاوەند" ل هەمان سالێ.

ل سالا 644 عەبدەکێ فارسی عومەر ل باژێرێ مەدینێ ل مزگەفتێ ڤە شەهید کر، لێ پشتی وەغەکرنا وی شەڕێن موسلمانان نەڕاوەستیان بەلکو پشتی هینگێ بەرەڤ وەلاتێ ئیرانێ و باکورێ کێشوەرێ ئەفریقیاڤە چوون و سەرکەفتنێن مەزن تومارکرن و گەلەك وەلات ڕزگارکرن و ئاینێ پیروزێ ئیسلامێ لێ بەلاڤکر.

عومەر خەلیفەیەکێ دادپەروەر و سەرکردەیەکێ سیاسی یێ چاڤنەترس بوو، وی بریاردا هێزێن موسلمانان دناڤ باژێراندا نەمینن و ل ناڤ خیڤەتان ل دووری باژێران بمینن، هەر دیسان ل کەسێن مەسیحی ژی فەرز کر ئەگەر نەهێتە دناڤ ئیسلامێ دا دڤێت زەکاتێ یان ژی جزیێ بدەن. ئەڤ چەندەژی هندێ دیار دکەت کو وان ئاینێ ئیسلامێ ل سەر کەسێ

ب زۆری نەسەپاند ئەڤ چەندەژی بەلگەیە کو شەڕێن عەرەبان شەڕێن نیشتیمانی بوون نەك شەڕێن ئاینی و سەپاندنا ئیسلامێ ب شیری.

ئەو سەرکەفتنێن عومەری تومارکرین گەلەك د مەزن بوون، پشتی وەغەکرنا پێغەمبەری ژی عومەر ئەو کەسایەتیێ بوو یێ شیای ئاینێ ئیسلامێ بەلاڤ بکەت، ئەگەر ئەڤ شەڕە نەهاتبانە کرن ڕەنگە ئاینێ ئیسلامێ ل ڤان دەڤەرێن مەزن و بەرفرەهـ نەهاتبا بەلاڤکرن. پتریا ئەو وەلاتێن هاتینە ڕزگاکرن بووینە وەلاتێن عەرەبی یێن ئیسلامی هەتا سەردەمێ ئەڤروکە.

ڕاستە ڕۆلێ هەرە مەزن بۆ پێغەمبەرێ ئیسلامێ موحەممەدی (س.خ) د زڤڕیت ژبەر کەسایەتیا وی یا مەزن و کاریگەریا وی یا بێ وێنە د دیروکێ دا مە ئەو ژ هەژی دیت ناڤێ وی ل ڕێزا ئێکێ دناڤ لیستا کاریگەرترین مرۆڤ د دیروکێ دا بهێتە دانان. لێ عومەرێ کورێ خەتابی ژی ڕۆلەکێ مەزن د بەلاڤکرنا ئیسلامێ ل پشتی وی گێرایە.

ژبەر زیرەکی و بیرتیژا عومەری وی شیا هەر زوی ئاینێ ئیسلامێ ب گەهیتە گەلەك وەلاتان. دبیت کەسایەتیا عومەری نەهند یا بەرنیاس بیت ل دەڤ جڤاکێن ڕۆژئاڤای وەکی یا هندەك سەرکردێن دی مینا "**چارلمان**" و "یولویوس قەیسەر"ی، لێ مە ناڤێ عومەری دانیە بەری ناڤێ وان ژبەرکو ئەو شەڕێن وی ئەنجامداین و ئەو کاریگەریا وی ل پشت خۆ هێلای گەلەك ژ یا ڤان کەسان مەزنتربوویە.

# 53. ئاشوكا Asoka

## (300ب.ز. - 232ب.ز.)

### ئاشوكا

### ئەو كەسێ ئاینێ بودی كریە ئێك ژ مەزنترین ئاینان ل جیهانێ

ئاشوكا دهێتە هەژمارتن مەزنترین شاهـ د دیروكا وەلاتێ هندێ دا، ئەو سێیەم شاهێ خێزانان "موریا" بوو كو دبوو نەڤییێ دانەرێ ڤێ خێزانێ یێ دگوتنێ "شاندرا جوبتا موریا". شاندرا سەركردیەكێ لەشكەری یێ چەلەنگ بوو و پشتی ب دوماهی هاتنا شەرێن ئەسكەندەرێ مەزن ل ڕۆژهەلاتی، شیا دەڤەرێن باكورێ هندێ ڕزگاربكەت و ئێكەم ئیمپراتۆریا مەزن د دیروكا وەلاتێ هندێ دا ب دامەزرینیت.

ڕەنگە سالا ژدایكبوونا ئاشوكای یا بەرزەبیت لێ پتریا ژێدەرێن دیروكی سالا ژدایكبوونا وی بۆ نێزیكی سالا 300 بەری زاینی ڤەدگەرینن، لێ ئاشوكا ل سالا 273 بەری زاینی هاتبوو سەر تەختێ دەستهەلاتێ و ل سەر شێوازێ باپیرێ خو حوكم ل وەلاتی دكر و بزاڤ دكر ب هاریكاریا لەشكەری سنورێن ئیمپراتۆریا خۆ بەرفرەهـ بكەت.

ل سالا هەشتێ ژ حوكمێ وی شەڕەكیێ مەزن دژی ویلەیتا "كالنجا" ل سەر كنارێن ڕۆژهەلاتێ هندێ (نوكە ویلایەتا ئوریسا ل وێ دەڤەرێ هەیە) بكەت. لێ پشتی بۆ وی دیاربووی كو ژ ئەنجامێ ڤان شەڕان گەلەك كەسێن بێگونەهـ ل بەر پیان دچیت ئەو گەلەك ب خەم كەفت ژبەركو د وی شەڕی دا نێزیكی 100 هزار كەس هاتنە كوشتن و هژمارەكا مەزن ژێ بریندار بوون لەوڕا ئێدی ئاشوكای بریاردا چ كریارێن دی یێن لەشكەری ئەنجام نەدەت و هاتە سەر ئاینێ بودی كو بانگەوزای بۆ دلوڤانی و ڕاستگوییێ دكر و دژی كارێن توندوتیژ و شەڕان بوو.

باشی ئاشوكا پتر دناڤ ڤی ئاینی دا چوو خوارێ و ئێدی ژ خۆارنا گوشتی دووركەفت و بوو كەسەكێ شینكاتی، ل دویڤدا نەخۆشخانەیێن تایبەت بۆ گیانەوەران ڤەكرن و پاڕاستنگەهێن گیانەوەران دامەزراندن و گەلەك بریار و یاسایێن بەری هینگێ

هەلوەشاندن و ل دویڤدا هژمارەکا مەزن ژ دیندارێن بودی دامەزراندن داکو دلوڤانی وڤیانێ دناڤ خەلکی دا بەلاڤ بکەن و لێبورین دناڤبەرا هەمی ئایناندا بەلاڤکر لێ دگەل هندێ ژی گرنگیەکا مەزن ب ئاینێ بودی ددا.

ب هاریکاریا ڤی ئیمپراتوۆری هەر زوی ئاینێ بودی گەلەك بەربەلاڤ بوو هەتا وی رادەی هژمارەکا دیندارێن بودی چوونە دەرڤەی وەلاتێ هندێ داکو ڤی ئاینی دناڤ خەلکێ وەلاتێن دیدا بەلاڤ بکەن ب تایبەت ل گزیرتا "سیلان" کو خەلکێ وێ هاتنە سەر ڤی ئاینی.

ل دویڤدا ئاشوکای بریاردا چیرۆکا ژیانا وی و سەرکەفتنێن وی ل سەر دیوارێن پەرستگەهان و مالێ و ملکێ وی بهێتە تومارکرن و هەتا سەردەمێ ئەڤروکە ژی ئەڤ پەرستگەهە وەکی خۆ ماینە، ئەو پەرستگەهە رادێ بەرفرەهبوونا ئیمپراتۆریا ئاشوکای بۆ مە دیاردکەن، هەردیسان ئەو نەخشەیێن ل سەر دیوارێن ڤان پەرستگەهان بەلگەیێن ئێکانەنە ل سەر کارو سەرکەفتنێن وی, ئەڤ نەخش و نیگارە دەربرینێ ژ پێشکەفتنا هونەرێ بیناسازی ل سەردەمێن کەڤن دکەت، پشتی پێنچی سالان ژ مرنا ئاشوکای ئێدی ئیمپراتۆریا موریا ژی ژناڤ چوو و ئێکی چ کەسێن دی نەهاتن و ئەڤ ئیمپراتۆریە نەڤەگەراند.

کاریگەریا ئاشوکای ل سەر جیهانێ گەلەك یا مەزن بوو، بەری ئەو بهێتە سەر دەستهەلاتێ ئاینێ بودی گەلەك یێ سنوردرابوو و هژمارەکا کێم یا خەلکی باوەری پێ هەبوو، هەدریسان ب تنێ ل باکورێ هندێ یا بەربەلاڤ بوو لێ پشتی ئاشوکا هاتیە سەر حوکمی و هەتا مرنا ویژی ئێدی ئاینی بودی هند بەربەلاڤ بوو هەتا دویکەفتیێن ڤی ئاینی ل هەمی دەڤەرێن هندی و وەلاتێن دەوروبەر ژی هەبوون.

ئەم دشێن بێژین ئاشوکا بەرپرسیارێ ئێکانەبوو ژ بەلاڤکرنا ئاینێ بودی هەتا بوویە ئێك ژ مەزنترین ئاینان ل جیهانێ لەورا یێ ژ هەژی ئەم ناڤێ وی د گەل لیستا کەسێن کاریگەر د دیروکێ دا ب دانینن.

# 54. قەشە ئوگوستین St. Augustine

# (354ز. – 430ز.)

## قەشە ئوگوستین

## ئەو قەشەیێ کاریگەریەکا مەزن ل سەر ئاینێ مەسیحی د چەرخێن ناڤەڕاستدا کری

قەشە ئوگوستین ل دوماهیا سالێن کەفتنا ئیمپراتۆیا ڕۆمانی یێ ژیای، ل وی سەردەمی دهاتە هەژمارتن ئێك ژ مەزنترین زەلامێن ئایزانی ل وەلاتی ژبەرکو فەلسەفا وی کاریگەریەکا مەزن ل سەر ئاینێ مەسیحی و ژیانا خەلکی ل چەرخێن ناڤەڕاست کر و هەتا سەردەمێ ئەڤروکە ژی کاریگەریا وی یا بەردەوامە.

ئوگوستین ل سالا 354 زاینی ل باژێرێ "سوق ئەهراز" ل وەلاتێ جەزائیرێ ژدایکیبوویە، بابێ وی کەسەکێ بێ باوەربوو لێ دەیکا وی ل سەر ئاینێ مەسیحیەتێ بوو، هێشتا یێ گەنج بوو دەمێ نیشانێن زیرەکیێ ل دەف دیاربوون و دەمێ ژیێ وی بووینە 26 سالێ مالا وان ئەو فرێکرە زانکۆیا "قرتاجە" و ل وێرێ پەیوەندییێن دلداری دگەل کچەکێ گرێدان پاشی زاروکەکێ نەیێ شەرعی ژێ بوو. پشتی بوویە 19 سالێ بریاردا دەست ب خواندنا فەلسەفێ بکەت و هەر زوی چوو سەر ئاینێ "مانیشیزم"ی ئەوێ هاتیەدانان ژلایێ کەسەکی ب ناڤێ "مانی" ل سالا 240 زاینی.

ل وی سەردەمی ئاینێ مەسیحیەتێ سەرنجا وی نەڕاکێشا لەوڕا چوو سەر ئاینێ مانیشیزمی و پشتی 9 سالاں ل سەر ڤی ئاینی مای تێدا هەمی هیڤیێن وی هاتنە کوشتن. دەمێ ژیێ وی بوویە 29 سالێ بەرەڤ باژێرێ ڕۆما چوو و ل وێرێ بو ماموستایێ گوتاربێژیێ و دەست ب خواندنا فەلسەفا گریکی کر بتایبەت فەلسەفا ئەفلاتۆنیی یا نوو کو ژلایێ فەیلەسوفێ ئەسکەندەر "ئەفلۆتینی"ڤە هاتبوو دەستکاریکرن و گوهۆرین و چەندین چاکسازی تێدا کربوون.

ل وی سەردەمی کەسەکێ ڕەوشەنبیر ل باژێرێ میلانو هەبوو دگوتنێ قەشە "ئەمبرۆزو"، ئوگوستینی ب کویراتی گوهداریا شیرەت و ڕێنماییێن ڤی قەشەی دکر کو

بنەکوکا ئاینێ مەسیحیەتێ بۆ وی دیارکر لەوڕا دەمێ ژیێ وی بوویە 32 سالێ چوو دناڤ ئاینێ مەسیحیەتێ دا و بوو مەسیحی، ل سالا 387 دووبارە زڤڕی باژێرێ ئەهرازێ ل جەزائیر.

ل سالا 391 ئوگوستین بۆ هاریکارێ قەشەیێ باژێرێ "عینایە" و پشتی بورینا پێنج سالان ڤی قەشەی وەغەرکر لەوڕا ئوگوستین ل پێش ویڤە بۆ قەشە و هەتا وەغەکرنا ویژی ل سەر ڤی کاری یێ بەردەوام بوو.

هەرچەندە باژێرێ عینایە نە گەلەك یێ مەزن و گرنگ بوو لێ هەر زوی ناڤودەنگیا ئوگوستینی دەنگڤەدا هەتا بوویە مەزنترین کەس ل دێرێ، سەرەڕای نەباشیا ساخلەمیا وی لێ ب هاریکاریا هندەك کەسان شیا هژمارەکا مەزن یا گوتارێن ئاینی بەلاڤبکەت. ئوگوستینی نێزیکی 500 شیرەت و گوتارێن ئاینی دانابوون کو هەتا نوکەژی د پاڕاستینە، هەر دیسان وی نێزیکی 200 نامەیان ژی بۆ قەشەیێن وەلاتێن دی هنارتبوون. لێ ناڤداترین بەرهەمێن وی یێن ئاینی دوو پەرتووك بوون ب ناڤێن "باژێرێ خودێ" و "دانپێدان". پەرتووکا دانپێدان د ژیێ 40 سالییێ دا بەلاڤکربوو.

پتریا شیرەت و نامەیێن ئوگوستینی ل دور قارەمانێن ئاینێ مانیشیزمی و ڕێبازێن دی یێن ئاینێ هاتبوو نڤێسین.

ئوگوستینی هەڤڕکیا قەشەیەکێ ئینگلیزی بناڤێ "بلاجیوش" کربوو دەمێ ل سالا 400 زاینی هاتیە ڕۆما، بلاجیوشی دیارکر کو گونەها باب ئادەمی نەیا بۆماوەییە و مروڤ دشێت خۆ ژ گونەهان بپارێزیت ئەوژی ب ڕێکا ئەنجامدانا کارێن باش لێ ئوگوستینی ب دژواری هەڤڕکیا ڤی قەشەی کر هەتا هاتیە دەرئێخستن ژ دێرێ، ئوگوستینی هوسا هزردکر نەیا ب ساناهیە مرۆڤ خۆ ژ گونەها ئادەمی قورتال بکەت بەلکو ئەڤ گونەهە ب شێوەیەکێ بۆماوەیی بۆ مرۆڤی دمینیت.

هەردیسان ئوگوستینی دیارکر کو بەری هینگێ خودێ دزانیت کا کی دێ شێت خۆ ژڤێ گونەهێ قورتال کەت، پشتی هینگێ دێرا ڕۆمانی ژی دانپێدان بڤێ بوچوونا وی کر و ل دووڤدا زەلامێن دی یێن ئاینی ژی بڤێ بوچوونا وی داخباربوون وەك قەشە "تۆماس ئەکوینی" و قەشە "جۆن کالڤن".

پشتی هینگێ ئوگوستینی پێنگاڤێن مەزنتر هاڤێتن دەمێ کریارا سیکسی حەڕامکری و گوتی کو ئەنجامدانا کریارا سیکسی ئێکە ژ گونەهێن هەرە مەزن و ڤێ بوچوونێ کاریگەری ل سەر ژیانا ملیونەها مرۆڤان کر و هەتا نوکەژی ئەڤ کاریگەریە یا بەردەوامە.

ل سالێن دوماهیێ یێن ژیێ ئوگوستینی ئیمپراتۆیا ڕۆمانی ژناڤچوو، ئوگوستینی ئەگەرێ ڤێ ژناڤچوونێ ژی بۆ هندێ زڤڕاند کو خەلکێ ڕۆمانی تشتێ حەڕام بۆ خۆ حەلال کر و ژ خودێ دوور کەفتن لەوڕا ئەڤ چەندە هاتە سەرێ وان.

هەژی گوتنێ یە پەرتووکا "باژێرێ خودێ" یا قەشە ئوگوستینی بەرڤانیێ ژ ئاینێ مەسیحیەتێ دژی دوژمنێن وی دکەت، د ڤێ پەرتووکێ دا وی فەلسەفا خۆ ب شێوەیەکێ ڕۆهن و ئاشکەرا یا نڤێسای و ئەو فەلسەفە بۆ ئەگەرێ پێشکەفتنا ئەورۆپا، پشتی هینگێ ئوگوستینی دیارکر کو چ ڕاستی بوو هەبوونا ئیمپراتۆریا ڕۆمانی نینن و باژێرێ ڕۆماژی چ بهایێ خۆ نینە لێ ئەو باژێرێ ژ هەمیان ب بهاتر باژێرێ خودێ یە ئانکو ئەو باژێرە یێ بەردەوام د پێشکەفتن و بەرەڤ پێشڤەچوونێ دابیت و ل دور پرەنسیپ و بنەمایێن خودایێ مەزن هاتیبیتە ئاڤاکرن، هەردیسان وی دیارکر کو چ ڕێك نینن مرۆڤ ژ گونەها باب ئادەمی قورتال بیت ب تنێ ب ڕێکا دێرێ نەبیت.

قەشە ئوگوستینی دیارکر کو ئیمپراتۆر و شاهان چ بهایێ خۆ لبەرامبەر پاپایێن ئاینی نینە و ب ڤی ڕەنگی کەیفا پاپایێن دێرێ گەلەك بڤێ بوچوونا وی هات، لێ ئەڤ بوچوونا وی بوو ئەگەرێ پەیداکرنا ناکوکی و هەڤڕکیێ دناڤبەرا شاه و سەرکردە و زەلامێن ئاینی و دێرێ و بۆ ماوێ چەندین چەرخان ڤەکێشا.

ئوگوستین ل سالا 430 زاینی ل باژێرێ عینایە ل وەلاتێ جەزائیر د ژیێ 76 سالیێ دا وەغەرکر، لێ پشتی هۆزا "ئەندال" هێرش کریە سەر ڤی باژێری و هەمی باژێر سووتی ب تنێ هندەك تشێن کێم یێن بها نەهاتبوونە سووتن کو ئێك ژ وان پەرتووکخانا قەشە ئوگوستینی بوو.

## 55. ویلیەم هارڤی William Harvey

## (1578ز-1657ز.)

### ویلیەم هارڤی

### ئەو نوژدارێ بۆ ئێکەم جار زڤرۆکا خوینێ دناڤ لەشێ مرۆڤیدا ئاشکەراکری

ویلیەم هارڤی ئەو نوژدارێ ئینگلیزی بوو یێ ژبۆ ئێکەم جار زڤروکا خوینێ[1] دناڤ لەشێ مرۆڤیدا و کارێن سەرەکی یێن دلی ئاشکەرا کرین، ل سالا 1578 ل باژێرێ "فولکستون" ژدایکبوویە.

هارڤی پەرتووکا خۆ یا ناڤدار "ڤەکۆلینەکا کەلاشتنێ ل دور زڤرۆکا خوینێ و دلی ل دەف گیانەوەران" ل سالا 1628 بەلاڤکرن کو گرنگیەکا مەزن دبوارێ پزیشکیدا ل وی سەردەمی هەبوو ژبەرکو زانایان بدیتنا زانایێن وی سەردەمی ئەڤ پەرتووکە باشترین پەرتووکا فرمانزانیا لەشێ مرۆڤی بوو.

هارڤی ل سالا 1600 چوو ئیتالیا و ل زانکۆیا "پادوا" دەست ب خواندنا زانستێن پزیشکی کر کو ل وی سەردەمی باشترین زانکۆیا پزیشکی بوو ل جیهانێ و زانایێ ناڤدار گالیلی ماموستابوو ل وێرێ و پاشی ڤەگەریا لەندەن و وەك نوژدار دەست بکارێ خۆ کر.

هەلبەت ئەڤ پەرتووکە دهێتە هەژمارتن ژ پەرتووکێن دەستپێکێ یێن ل سەر فرمانێن ئەندامێن جوداجودا یێن لەشی مرۆڤی هاتینە نڤێسین، گرنگیا وێژی بۆ هندێ دزڤریت کو بۆ ئێکەم جاربوو زانایەکێ وەکی هارڤی ب بەلگە بەحسێ فرمانێن لەشێ مرۆڤی ب تایبەت فرمانێن دلی و زڤرینا خوینێ دناڤ لەشێ مرۆڤیدا بکەت، ژبەرکو هەتا

---

[1] مەبەست ژ زڤرۆکا خوینێ یان خولا خوینێ ئەوە دەمێ خوین ژلایێ چەپێ یێ دلی دەردکەڤیت و خۆارنێ و گازا ئوکسجینی بۆ هەمی خانە و شانەیێن لەشی مرۆڤی دبەت، پاشی ماددەیێن ژەهراوی و گازا دوەم ئوکسیدا کاربونی ژ ڤان خانە و شانەیان وەردگریت و دزڤرینتە لایێ ڕاستێ یێ دلی.

وی سەردەمی زانایان نەدزانی کو خوین دناڤ لەشێ مرۆڤیدا دهێت و دچیت و زڤڕۆکەکا تەمام یا هەی.

بەری زانا هارڤی پەرتووکا خۆ بەلاڤ بکەت، گەلەك بوچوونێن جوداجودا ل دەف زانایێن سەردەمێ وی و زانایێن بەری هینگێ ل دور فرمانێن لەشێ مرۆڤی و خوینێ هەبوون، ژ گرنگترین وان بوچوونان:

- زانایان هزر دکر پشتی مرۆڤ خوانێ دخۆت، دناڤ دلی ئەڤ خۆارنە دهێتە گوهۆرین بۆ خوینێ.
- ل دووڤدا دل ڕادبیت ب گەرمکرنا خوینێ
- بوڕیکێن هەوای ژی پرن ژ هەوای نەك خوینێ
- هەردیسان زانایان هزردکر کو ڕح و گیانێ مرۆڤی دناڤ دلی دا دپاڕاستینە
- ئەو خوینا دناڤ بوڕیێن خوینێ دا هندەك جاران بلند دبیت و هندەك جاران نزم دبیت، ئانکو هندەك جاران نێزیکی دلی دبیت و هندەك جاران ژی ژ دلی دوور دکەڤیت.

نوژدارێ گریکی یێ کەڤن "گالین"ی گەلەك ڤەکۆلین ل سەر بوڕیێن خوینێ یێن لەشێ مرۆڤی کربوون لێ وی قەت پێشبینیا هندێ نەکربوو کو خوین دناڤ لەشیدا دهێت و دچیت، هەردیسان هەتا سەردەمێ هارڤی ژی و پشتی بەلاڤبوونا پەرتووکا وی گەلەك زانایان باوەری ب هندێ نەبوو کو خوین بەردەوام دچیتە دناڤ دلی دا و پاشی ژێ دەردکەڤیت و وان نەدزانی کو خوین دناڤ سیستەمەکێ گرتیدا دزڤڕیت. لێ هارڤی شیا ڤێ ڕاستیێ ببەلگەیێن زانستی دووپات بکەت ئەوژی پشتی چەندین کەلاشتن ل سەر بوڕیێن خوینێ و لەشێ مرۆڤی ئەنجامداین.

هارڤی دیارکر کو هەر جارەکا دلێ مرۆڤی خۆ قوتیت نێزیکی دوو وەقێن خوینێ دەردئێخیت، ژبەرکو د هەر خۆلەکەکێ دا دلێ مرۆڤی نێزیکی 72 جاران خۆ دقوتیت لەوڕا دل د هەر دەمژمێرەکێ دا نێزیکی 540 پاوندێن خوینێ دهاڤێژتە دناڤ بوریاندا. هەلبەت ل ڤێرێ ئاڕیشەك پەیدادبیت ژبەرکو ئەڤ چەندە گەلەك ژ سەنگا لەشێ مرۆڤی مەزنترە و

چەوا لەشێ مرۆڤی دشێت هندە خوینێ هەلگریت لەوڕا دڤێت ڤێ چەندێ نهێنیەك ل پشت هەبیت.

هارڤی بۆ ماوێ 9 سالاًن ب هویری ڤەكۆلین ل سەر دلێ مرۆڤی ئەنجامدان و ل دوماهیێ گەهشتە وێ ڕاستیێ كو خوین بەردەوام دەمێ ژ دلێ مرۆڤی دەردكەڤیت لبەرامبەر وێ هندەك خوین د زڤڕیتە ناڤ دلی دا ڤە ئەوژی پشتی كو لناڤ لەشی هەمیێ دگەریێت. لێ دگەل ڤێ چەندێ ژی هەتا وەغەركری ژی كەسێ باوەری ب ڤێ ئاشكەراكرنا وی نەبوو هەتا پشتی وی هندەك زانایێن دی هاتین و ئەڤ ڕاستیە دووپات كری.

هەردیسان ویلیەم هارڤی گەلەك ڤەكۆلین ل سەر زانستێ سوڕیلانكزانیێ[1] ژی ئەنجامدابوون، ئەو پێزانین و تیبینیێن دپەرتووكا خۆ یا ب ناڤێ "ژدایكبوونا گیانەوەران" ل سالاً 1651 بەلاڤكربوون و دهێنە هەژمارتن دەستپێكا گەشەكرنا ڤی زانستی. هارڤی دژی وێ تیورێ ڕاوەستیا یا دگوتی لەشێ سوڕیلانك دەمێ هێشتا د زكێ دەیكا خۆدا وەكی لەشێ زاروكەكێ پێگەهشتیە لێ ب تنێ قەبارێ وی بچووكترە. هارڤی دیاركر كو سوڕیلانك هێدی هێدی دروست دبیت و د چەندین قوناغانڕا دەربازدبیت هەتا بەری ژدایك بیت ژ نوو دبیتە زاروكەكێ تەمام.

ژیانا خێزانی یا هارڤی یا سادە و ئاسایی بوو و كەسەكێ سەركەفتی بوو د ژیانا خۆدا، هەرچەندە ژیانا هەڤژینیێ پێكئینابوو لێ چ زاروك نەبوون، ل سالاً 1657 وەغەر كر.

---

[1] سوڕیلانكزانی یانژی كورپەلەزانی Embryology ئەو زانستە یێ گرنگیێ ددەتە خۆاندنا قوناغێن جوداجودا یێن پەیدابوونا مرۆڤی، هەر ژ ئێكەم رۆژا دروستبوونا مرۆڤی د زكێ دەیكێ دا كو دبێژنێ سوڕیلانك هەتا ژیێ وی دگەهیتە نەهـ هەیڤان دناڤ زكێ دەیكێ و پاشی دهێتە سەر دونیایێ.

## 56. ئێرنەست ڕوزەرفۆرد Ernest Rutherford

## (1871ز- 1937ز)

### ئێرنەست ڕوزەرفۆرد

### ئەو زانایێ شیایی کلیلکا چێکرنا چەکێ ئەتومی ئاشکەرا بکەت

ئێرنەست ڕوزەرفۆرد دهێتە نیاسین ب مەزنترین و ناڤدارترین زانایێ فیزیایێ ل چەرخێ بیستێ، ژبەرکو ئەو بوو ئەگەر پێزانیێن مە ل سەر چالاکیێن تیشکەیی یێن کەرەستەیان زێدەبن، هەروەسا ئەو ئێکەم کەس بوو زانستێ فیزیا نافکەیی پێشئێخستی. سەرەڕەی هندێ وی گەلەك تیورێن زانستی دانایینە لێ دگەل هندێ ژی ئەو تشتێن وی ئاشکەرا کرین گرنگیەکا مەزن هەنە کو پێکدهێن ژ چەکێ ئەتومی، ناڤەندێن هێزا نافکی، تراسەرێن تێشکەچالاکی و دیروکا تیشکەچالاکیێ. ئەڤ کاریگەریا وی ل سەر جیهانێ کری هێشتا یا بەردەوامە و ڕۆژ بۆ ڕۆژێ یا د گەشەکرنێ دا.

روزەرفۆرد ل سالا 1871 زاینی ل وەلاتێ نیوزلەندا هاتیە سەردنیایێ و مەزن بوویە و هەر ل وێرێ چوویە زانکۆیا کانتەربێرگ و هێشتا ژیێ وی 23 سالێ سێ باوەرنامە بدەستخۆڤە ئینان. ل دووڤدا هاتە هنارتن بۆ زانکۆیا کامبریج ل ئینگلتەرا و پاشی بۆ ماوێ سێ سالان ل کارگەها کافیندش لژێر سەرپەرشتیا زانایێ ناڤدار و ئاشکەراکەرێ ئەلیکترونان "جوزێف جۆن تۆمسون"ی کارکر و ڤەکۆلین ل سەر وان تیشکێن ژ تۆخمێ ڕادیومی دەردکەڤن کرن.

دەمێ ژیێ وی بوویە 27 سالێ بوو ماموستایێ فیزیایێ ل زانکۆیا ماك جێل ل کەنەدا و بۆ ماوێ نەهـ سالان ما ل وێرێ. ل سالا 1907 دووبارە زڤری ئینگلتەرا و بۆ سەروك بەشێ فیزیایێ ل زانکۆیا مانچستەر. ل سالا 1919 چوو زانکۆیا کامبریج و ئەڤ جارە بوو ڕێڤەبەرێ کارگەها کافینداش و هەتا دوماهیا ژیانا خۆ ما ل وێرێ.

چالاكیا تیشكەیی ل سالا 1896 ژلایێ زانایێ فرەنسی هێنری بیكریلی ڤە هاتبوو ئاشكەراكرن دەمێ وی تاقیكرن ل سەر تۆخمێ یورانیومی دكری. لێ پشتی هینگێ وی چ گرنگی نەدا ڤێ چەندێ لەورا پتریا ئەو تشتێن هاتینە ئاشكەراكرن ل سەر چالاكیا تیشكەیی ژ ئەنجامێ وان ڤەكۆلینێن بەرفرەهـ بوو یێن روزەرفۆردی ئەنجام داین[1].

ئێكەم ئاشكەراكرنا روزەرفۆردی ل سەر هندێ بوو كو ئەو تیشكێن ژ تۆخمێ یورانیومی دەردكەڤن دوو پێكهاتەیێن تەمام ژێكجودا پێكدهێن، وی ناڤێن وان كرنە تیشكێن ئەلفا و تیشكێن بێتا و ل دووڤدا وی سرۆشتێ سەرەدەریكرنا هەر ئێك ژ ڤان تیشكان دیاكر و ل دوماهیێ وی تیشكەكا دیژی ئاشكەراكر و ناڤێ كرە تیشكا گاما.

ئێك ژ تایبەتمەندییێن تۆخمێن تیشكدەر ئەوە تێهنەكا مەزن یا دناڤدا هەی. بەری هینگێ بێركلی و كوری و گەلەك زانایێن دی هوسا هزردكر كو تێهنێ ژێدەرەكێ دەرەكی یێ هەی، لێ روزەرفۆردی دیاركر كو تۆخمێن تیشكدەر تێهنەكا گەلەك مەزن یا هەی و گەلەك ژوێ تێهنێ پترە یا ژ كارلێكێن كیمیایی دەردكەڤیت. ئەڤ تێهنە ژ ژێدەرێن دەرەكی ناهێت بەلكو یا دناڤ ئەتومێن تۆخمێ یورانیومێ بخۆدا هاتیە هەلگرتن و بڤێ چەندێ ئەو شیا تێگەهێ هێزا ئەتومی بدانیت.

زانایان بەردەوام هزدكر كو هەر ئەتومەك ژناڤ ناچیت و ناهێتە گوهۆرین، لێ روزەرفۆردی ب هاریكاریا زانایەكێ دی یێ گەنج ب ناڤێ "فریدریك سودی" شیا ڤێ چەندێ راستڤەكەت و دیاربكەت كو دەمێ تیشكێن ئەلفا یان تیشكێن بێتا ژ ئەتومەكێ دەردكەڤن، ئەو ئەتوم دێ هێتە گوهۆرین بۆ ئەتومەكا دی یا جیاواز. هەرچەندە ئەڤ چەندە یا ب زەحمەتبوو ژلایێ كیمیازانانڤە بهیتە باوەركرن، لێ روزەرفۆرد و هاریكارێ خۆ هژمارەكا تاقیكرنان ل سەر شرۆڤەبوونا تیشكدەرێن نافكی یێت تۆخمێ یۆرانیومی كرن و بۆ وان دیاركر كو تۆخمێ یورانیومی دهێتە گوهۆرین بۆ تۆخمێ قۆرقۆشمی.

هەروەسا ئەو شیا لەزاتیا شرۆڤەبوونا تۆخمێن تیشكدەر بپیڤیت و ب ڤێ چەندێ وی بنیاتێ تێگەهێ "نیڤا ژیانێ" دانا و ئەڤ چەندە هەر زوی بۆ ئەگەرێ داهێنانا دیروكا تیشكدەری كو بوو ئێك ژ ئامرازین زانستی یێن هەرە گرنگ و ل سەردەمێ ئەڤروكە دا

[1] هەردوو زانایان ماری كوری و پیێری كوری ژی هەردوو تۆخمێن تیشكدەر پۆلونیوم و رادیوم ئاشكەرا كربوون. لێ ئەڤ ئاشكەراكرنێن وان نەبوونە ئەگەرێ ئاشكەراكرنا چ دەستكەفتێن مەزن.

دگەلەك بوارانـدا دهێتە بكارئینان بتایەبت بوارێن جیولوجی و شوینەوارزانی و گەردوناسی و گەلەك بوارێن دی.

ئەڤ داهێنان و ئاشكەراكرنێن ڕوزەرفۆردی بوونە ئەگەر ئەو ل سالا 1908 خەلاتێ نوبل بدەستخۆڤە بینیت، هەروەسا پشتی هینگێ هەڤالێ وی سودی ژی شیا ڤی خەلاتی بدەستڤە بینیت. لێ مەزنترین كارێ وی ئەو بوو یا پشتی بدەستڤەئینانا ڤی خەلاتی ئاشكەراكری.

روزەرفۆردی تیبینیا هندێ كر كو تیشكێن ئەلفایی یێن بلەز دشێن ب شێوەیەكێ ڕاست دناڤ تەخەكا تەنك یا كانزایێ زێری دا بورن بێی كو چ كونان یان شوینوارێن بچووك ژی لدویڤ خۆ بهێلن، هەروەسا ئەڤ تیشكە گەلەك كێم ژ ڕێرەوێ خۆ لاددەن. ڤێ چەندێ پێشنیاركر كو ئەتومێن زێڕی (سەرەڕای هندێ تو كانزایەكێ ڕقە و چ تشت دناڤڕا ناچن كو بەری هینگێ زانایان ئەڤ چەندە ئاشكەراكربوو) دناڤ خۆدا د نەرمن. ئانكو دندكێن بچوكیتر و ڕەڤتر یێن ئەلفا دشێن شێوەیەكێ ڕاست دناڤ ئەتومێن زێری ڕابون.

لێ ڕوزەرفۆردی دیت كو هندەك دندكێن ئەلفایێ ب دژواری ژ ڕێڕەوێ خۆ دهێنە لادان دەمێ دناڤ تەخەكا كانزایێ زێری ڕا دەرباز دبن لەوڕا وی بریاردا تاقیكرنێن خۆ گەلەك جارێن دی دووبارە بكەت هەتا كو بشێت بشێوەیەكێ هویر هژمارا وان دندكان بهەژمێریت یێن بەرەڤ هەر لایەكی دهێنەلادان و ل دوماهیێ ب هاریكاریا ڕێكەكا ماتماتیكی ئەنجامێن خۆ شرۆڤەبكەت، وی دیاركر كو ب تنێ ڕێكەكا هەی ئەو ئەنجامێن تاقیكرنا خۆ پێ شرۆڤەبكەت ئەوژی بڤی ڕەنگی بوو: ئەتوما زێڕی ژ ڤالاهیەكا بەتالێ پێكدهێت و هەمی بارستەیا ئەتومێ دناڤ نافكەكێ دا كو دكەڤیتە سەنتەرێ ئەتومێ دا خڕڤەبوویە. و ل سالا 1911 دیاركر ڕەڤترین تشتێ لدەوروبەرێ مە نافخۆیا وان یا ڤالاْیە.

ئاشكەراكرنا ڕوزەرفۆردی ل دور نافكا ئەتومان بوو ئەگەرێ دانانا هەمی تیورێن سەردەم ل دور پێكهاتنا ئەتومان. پشتی هینگێ ب دوو سالان زانا "نیلز بوهەر"ی مفا ژڤی ئەنجامێ ڕوزەرفۆردی دیت و تیورا خۆ یا ناڤدار بەلاڤكر یا كو دبێژیت پێكهاتنا ئەتومان ژی وەكی پێكهاتنا سیستەمێ ڕۆژێ یە كا چەوا ڕۆژ دكەڤیتە سەنتەری و ئەختەر ل دور دزڤڕن، ئاها هوساژی نافكا ئەتومێ دكەڤیتە سەنتەرێ وێ و ئەلیكترون ل دور دزڤڕن.

ئەڤ کارێ ڕوزەرفۆردی بوو ئەگەرێ ڤەکرنا لقەکێ نوو يێ زانستێ فيزيايێ ئەوژی خاندنا نافکا ئەتومان بوو، هەروەسا ل سالا 1919 ڕوزەرفۆردی تاقيکرنەکا دی ب سەرکەفتيانە ئەنجامدا دەمێ شيايی نافکەکا تۆخمێ نايترۆجينێ ب گوهۆريت بۆ نافکەکا تۆخمێ ئوکسجينێ ب ڕێکا بومبەبارانکرنا وان ب تيشکێن ئەلفا يێن گەلەك بلەز و ب ڤێ ڕێکێ ئەو شيا خەونا کەڤن يا گەلەك کيمياگەران بکەتە ڕاستی.

روزەرفۆردی دیارکر کو دبیت گوهۆرینا نافکێ ژێدەرێ پەیدابوونا تێهنا ڕۆژێ بیت و پشتی هینگێ ئەو هەر زوی شیا بگەهیتە وی ئەنجامی کو گوهۆرینا نافکێ کلیلکا سەرەکی یا دروستکرنا چەکێ ئەتومی و ناڤەندێن هێزا نافکی.

ژبلی ژیانا وی یا ئەکادیمی و پڕی دەستکەفتن، ڕوزەرفۆرد شیا کاریگەرییێ ل سەر هەر کەسەکی بکەت يێ دچوويە ديدارا وی، ئەو کەسەکێ مەزن بوو و دەنگەکێ بلند و باوەريەکا تمام ب خۆ هەبوو و ب چ ڕەنگان خۆ مەزن نەدکر.

## 57. جۆن کالڤن John Calvin

## (1509ز-1564ز)

### جۆن کالڤن

### ئەو کەسێ پرۆتستانتی کریە ئێك ژ ڕێبازێن ئولی یێن مەزن ل جیهانێ

جۆن کالڤن ئەو زەلامێ ئولی یێ ل سەر ڕێبازا پرۆتستانتی دهێتە هەژمارتن ئێك ژ کاریگەرترین زەلامێن ئولی د دیروکا ئەورۆپادا، ناڤودەنگیا ویژی بۆ بابەت و شیانێن وی یێن بێ سنور د زانستێن ئاینزانی و ڕێکخستنا دەستهەلاتێ و ڕەوشت و ڕەفتارێن مرۆڤان و شێوازێن کارکرنێ دا د زڤڕیت، کاریگەریا ڤی کەسی بۆ ماوێ پتر ژ چوار چەرخان یا بەردەوام بوو و بوچوونێن وی کاریگەری ل سەر ژیانا ملیونەها مرۆڤان ل سەر ڕۆیێ عەردی کریە.

ناڤێ وی یێ دروست جان کوڤانە، ل سالا 1509 ل باژێرێ "تویون" ل فرەنسا ژدایکبوویە، لدەستپێکێ ل کولیژا لومونتژی ل پاریسێ دەست ب خودانێ کریە و پاشی چوویە زانکۆیا ئورلیان بۆ خواندنا یاسایێ. ژیێ کالڤنی هەشت سالێ بوون دەمێ مارتن لوتەری خونیشاندانا دژی دەستهەلاتا دێرێ کری و 95 داخوازی ل سەر دیوارێ دێرا باژێرێ فیتزبرگ هەلاویستین کو دهاتە هەژمارتن ئێکەم خونیشاندانا ئاینی یا پرۆتستانتی. هەرچەندە لدەستپێکا گەنجانیا خۆ کالڤن ل سەر ڕیچبازا کاسولیکی بوو لێ پشتی هینگێ چوو سەر ڕێبازا پرۆتستانتی.

ژبەر ڤێ گوهۆرینا ڕێبازا ئاینی بریارا گرتنا وی هاتەدان لێ داکو ئەو خۆ ژ دادگەها کاسولیکی قورتال بکەت نەچاربوو بەرەڤ باژێرێ پاریسێ بچیت و پاشی چەندین جارێن دی جهێ ئاکنجیبوونا خۆ گوهارت هەتا ل دوماهیێ ل باژێرێ "بازل" ل سویسرا ئاکنجی بووی و ناڤەکێ دی بۆ خۆ دانا و دەست ب خواندنا ئاینزانییێ کر، ل سالا 1536 د ژیێ 27 سالێیێ باشترین بەرهەمێ خۆ بەلاڤکر لژێر ناڤێ "پرەنسیپێن ئاینێ مەسیحی" و

ئەڤ پەرتووکە وەك ژێدەرەکێ گرنگ بوو ژبۆ پڕەنسیپێن ڕێبازا پرۆتستانتی و ئەڤ چەندە بوو ئەگەر گەلەك ناڤدار بیت.

ل دووڤدا بەرەڤ باژێرێ جنێڤ ل سویسرا چوو کو لوی سەردەمی ڕێبازا پرۆتستانی ڕۆژ بۆ ڕۆژێ پتر بەربەلاڤ دکر و ڕۆژانە ب هزارەها خەلك دهاتنە سەر ڤێ ڕێبازا ئاینی، خەلکێ وی باژێری داخاز ژێکر بمینتە لباژێرێ وان و ببیتە ماموستا ل دەف وان لێ هەر زوی هەڤڕکی دناڤبەرا وی و خەلکێ باژێری دا پەیدابوون لەوڕا نەچاربوو ب ئێکجاری وێرێ بجھ بهێلیت.

ل سالا 1541 دووبارە داخاز ژێ هاتەکرن بڤەگەریتە جنێڤ، پشتی زڤڕیە جنێڤ بوو سەرکردەیەکێ ئاینی و سیاسی و هەتا دوماهیا ژیانا خۆ ما ل وێرێ.

لباژێرێ جنێڤ کالڤن نەکەسەکێ دیکتاتوربوو، پتریا خەلکێ باژێرێ ژی مافێ دەنگدانێ هەبوو و دەستهەلاتا سیاسی یا وی سەردەمی لباژێرێ جنێڤ د دەستێ 25 کەساندابوو لێ ژبەرکو کالڤن نەئەندامێ ڤێ جڤاتێ بوو لەوڕا ئەو بەردەوام د مەترسیا دەرئێخستنێ دابوو هەتا ل سالا 1938 ب دروستاهی هاتیە دەرێخستن لێ پشتی هینگێ پتریا ئەندامێن جڤاتێ چوونە پشتا وی و زڤڕاندنە باژێری و کرە سەرکردێ ئێکانە یێ وەلاتی و هێدی هێدی دەستهەلات هەمی کەفتە د دەستێن ویدا.

ب سەرکێشا کالڤنی ئێدی باژێرێ جنێڤ بوو مەلبەندێ ڕێبازا پرۆتستانتی ل ئەورۆپا، هەردیسان کالڤنی بزاڤکرن پشتەڤانیا ڕێبازا پرۆتساتی ل وەلاتێن دیژی بکەت ب تایبەت وەلاتێ فرەنسا، گەلەك کەسان لوی سەردەمی ناڤێ جنێڤێ کربوو "ڕۆمایا پرۆتسستاتی" هەروەکی کا چەوا باژێرێ ڕۆما ب خۆ مەلبەندێ ڕێبازا کاسولیکی بوو.

پشتی کالڤن زڤڕیە باژێرێ جنێڤ هندەك بریارێن نوو دانن ئێك ژ وان بریارێن نوو ڕێکخستنا دێرێ و دەستهەلاتا وێ بوو کو ئەڤ چەندە وەکی پێنگاڤەکا دەستپێکی بوو ژبۆ گەلەك دێرێن دی ل ئەورۆپا. هەر لباژێرێ جنێڤ ب خۆ وی گەلەك گوتار دەربارەی ئایزانی و پەرتووکا پیرۆز ژبۆ خەلکی پێشکێشکرن و چەندین جاران ل پەرتووکا خۆ یا ب پڕەنسیپێن ئاینێ مەسیحیەتێ زڤڕی.

لێ کالڤنی هندەك بریارێن نوو و بهێز دەرئێخستن وەك قەدەغەکرنا مەیێ و قومارێ و سەمایێ و سترانێن ئەڤینیێ، هەردیسان سزایێن گەلەك دژوار بو وان کەسان دانان

يێن پێل ڤان بریاران بدانیت، د هەمان دەمدا هاتنا خەلکی بۆ دێرێ کرە تشتەکێ نەچاری و لدویڤ یاسایێ هاتبوو رێکخستن. ئێك بریارێن دی یێن کالڤنی دانای ئەوبووکو ماوێ پێشکێشکرنا گوتارێن ئاینی ژلایێ قەشەیانڤە بهێتە درێژکرن و چڕکرن.

کالڤنی پشتەڤانیا خەلکی دکر گەنگەشێ دگەل زەلامێن ئولی بکەن و داخازا زانست و زانینێ ژێ بکەن لەورا ل سەردەمێ وی زانکۆیا جنێڤ هاتە دامەزراندن. کالڤن کەسەکێ تۆندرەوبوو ژبەر ڤێ چەندێ وی سزایێن گەلەك دژوار بۆ کەسێن بێباوەر و کەمتەر دەرێخستن. نوژدارێ ئیسپانی یێ ناڤدار "سرفیتوس" کو باوەری ب سێیانەیا پیروز[1] نەبوو دەمێ گەهشتیە بازێرێ جنێڤێ ژلایێ کالڤنی ڤە هاتە دەستگیرکرن و ب تومەتا بێباوەریێ ل سالا 1553 ب ساخی هاتە سووتن، هەردیسان وی بریاردا هژمارەکا مەزن ژ کەسێن سێرەبەند و نڤشتیان بۆ خەلکی دروست دکرین بهێنە سووتن.

کالڤن ل سالا 1564 وەغەرکر، لێ هەڤژینا وی بەری وی ل سالا 1549 وەغەرکربوو و ب تنێ وی زاروکەك هەبوو لێ ئەوژی دەمێ ژدایکبوونێ مربوو. گرنگیا کالڤنی ژبۆ خەباتا وی یا ئاینی ناڤەگەریت بەلکو ژبۆ چالاکیێن وی یێن سیاسی و هزروبیرێن وی ڤەدگەریت یێن بووینە ئەگەرێ هشیارکرنا خەلکی. وی گەلەك دووپاتی ل سەر گرنگی و دەستهەلاتا پەرتووکا پیرۆز دکر، هەردیسان ویژی وەکی مارتن لوتەری داپێدان ب بریارێن رۆما و دێرا کاسولیکی نەدکر.

کالڤنی ژی وەکی لوتەر و قەشە ئوگوستی و قەشە بۆلسی هزرکر دکر کو هەمی مرۆڤ گونەها باب ئادەمی ب شێوەیەکێ بۆماوەیی د هەلگرن، وان هزردکر دلسوزی ب رێکا ئەنجامدانا کارێن باش ناهێت بەلکو ب رێکا باوەریەکا راستگو دهێت و وی باوەری ب هندێ هەبوو کو خودایێ مەزن ل پێشیێ دزانیت دێ دلوڤانیێ ب کێ بەت و دێ کێ سزادەت.

مادەم خودێ دزانیت دێ دلوڤانیێ ب کێ بەت و دێ کێ سزا دەت با بوچی خەلك لدویڤ پرەنسیپێن رەوشتی و ئاینی دچن؟ کالڤنی هزردکر ئەو کەسێ خودێ هەلبژارتی داکو دلوڤانیێ پێ ببەت هەر ئەو کەسێ دلسوز و دلوڤانە یێ ژ هەژی دلوڤانیا خودێ، لەورا دلسوزیا مە ب هندێ بجهـ ناهێت کو ئەم کارێن باش بکەین بەلکو خودێ یا حەزکری ئەم کارێن باش بکەین ژبەرکو هەر وی ئەم یێن هەلبژارتین داکو دلوڤانیێ ب مە ببەت.

---

[1] سێیانەیا پیرۆز Trinity ئانکو باب و کور و روحا پیروز

ڤان بوچوونێن وی کاریگەری ل سەر ملیونەها مرۆڤان کر و هژمارا دویکەفتیێن وی گەلەك ژ دویفکەفتیێن مارتن لوتەری پتر بوو، هەرچەندە وەلاتێن ئەلمانیا و ئەسکەندناڤی لدویف لوتەری دچوون لێ وەلاتێن هۆلەندا و سویسرا و هندەك ژ خەلکێ پۆلەندا و ئەلمانیا و هنگاریا لدویف کالڤنی دچوون.

لوی سەردەمی، بازێرێ جنێڤ دەستهەلاتا وێ نەیا دیموکراتی بوو بەلکو دەستهەلاتەکا سیوکراتی[1] بوو، لێ مەرەما کالڤنی ئەوبوو مللەت بۆ خۆ دەستهەلاتێ ل خۆ بکەت لەورا نەیا بەربەلاڤە کو ئەم وەلاتەکی بینین جهێ بەربەلاڤبوونا رێبازا کالڤنی بیت و پاشی ئێکسەر ببیتە دەڤەرەکا دیموکراتی وەکی وەلاتێن سویسرا و هۆلەندا و بریتانیا.

گرنگیا کالڤنی بوو کاریگەریا وی یا کویر و مەزن ل سەر جڤاکێن ئەوروپی و ئەمریکی بجهـ هێلای, راستە کو مارتن لوتەر ئێکەم کەس بوو پشتەڤانیا رێبازا پرۆتستانتی کری لێ کالڤن هات و هاریکاریا وی کر ل سەر بەلاڤکرنا ڤێ رێبازا ئاینی و یاسایێن وێ داناین لەورا مە ناڤێ ویژی دانا پشتی یێ مارتنی لێ دگەل هندێ ژی ناڤێ وی بەری یێ ڤولتێر و روسوی هاتیە دانان ژبەرکو کاریگەریا وی یامەعنەوی گەلەك ب هێزتربوو.

---

[1] سیوکراتی Theocracy ئەو جورێ دەستهەلاتێ یە دەمێ زەلامێن ئولی حوکمی ل خەلکی دکەن.

## 58. گریگور مەندل Gregor Mandel

## (1822ز-1884ز.)

### گریگور مەندل

### ئەو زانایێ دیارکری کا چەوا ساخلەتێن بۆماوەیی ژ دەیکوبابان بۆ زاروکێن وان دهێنە ڤەگۆهاستن

گریگور مەندل ئەو کەس بوو یێ شیای بۆ ئێکەم جار یاسیایێن بۆماوەزانییێ ئاشکەرا بکەت و ئێکەم کەس بوو دیارکری کا چەوا ساخلەتێن بۆماوەیی ژ دەیکوبابان بۆ زاروکێن وان دهێنە ڤەگوهاستن، ڤی فەشەیێ نەمساوی گەلەك حەز ژ ڤەکۆلینین زانستی دکر لێ ئەو تشتێن وی شاکەراکرین نەبوونە جهێ سەرنجراکێشانا زانایێن دی هەتا پشتی مرنا وی ب ماوەیەکی.

گریگۆر جۆهان مەندل ل 22 تیرمەها سالا 1812 ل گوندێ "هینزندورف" ژ دایکبوویە کو دکەڤیتە دەڤەرەکێ ل سەر سنوورێ دناڤبەرا دانیمارك و هنگاریا دا دبێژنێ "مۆراڤیا". دایکوبابێن وی جوتیار بوون و د هەژار بوون، مەندل قوتابیەکی زیرەك نەبوو و دوو جاران دەمێ ڤیایی بچیتە قوناغا ناڤنجی د تاقیکرناندا ب سەرنەکەفت. ل سالا 1838 بابێ وێ د ڕویدانەکێ دا هاتە کوشتن، لەورا ئێدی ئەو نەشیا خواندنا خۆ یا ناڤنجی تەمامبکەت چونکی نەدشیا پارێ خواندنێ بدەستڤە بینیت، هەرچەندە پشتی هینگێ بزاڤکرن کار بکەت بۆ هندێ پاران ب دەستڤە بینیت لێ ساخلەمیا وی و جۆرێ کارێ وی بوونە ئاستەنگ د ڕێکا وی دا.

ژبەرکو پتریا مامۆستایێن وی سەردەمی ڕەبەن بوون، لەورا هاریکاریا وی کر کو بچیتە دێرێ بخوینیت. ل سالا 1843 مەندل چوو دێرا "قەدیس تۆماس" لباژێرێ "برۆن" یێ نەمسایێ و وی دەمی ژیێ وی ب تنێ 21 سالا بوون و وەك ڕەبەن ل دێرێ کارکر.

و ل سالا 1851 دێرێ ئەو فرێکره زانکۆیا "ڤیەننا" بۆ هندێ زانستێ بیرکاریێ بخوینیت و ل سالا 1853 جارەکا دی ڤەگەریا دێرێ و ل قوتابخانەیەکا سەر ب دێرێ ڤە بوو ماموستا[1]

پاشی دەست ب خواندنا زانستێ بایۆلۆژی و فیزیاییێ کر و بۆ ماوێ 14 سالاً ڤەکۆلین ل سەر ڕۆەکێ بەزالیاییێ دکرن کو ئەڤ بەزالیایە دناڤ باخچێن دێرێ دا دچاندن پشتی هینگێ ل سەر ڤەکۆلینان یێ بەردەوام بوو هەتا شیای ل سالا 1865 یاسایێن بومازەنزانییێ یێن ناڤدار بدانیت.

ل سالا 1868 مەندل هاتە هەلبژارتن ببیتە سەرۆکێ دێرێ و ژ وی دەمی کارێ وی پتر لێ هات لەوڕا نەدشیا ئێدی وەکی بەرێ ڤەکۆلینان ئەنجامبدەت.

لوی سەردەمی مەندلی ئەنجامێن ڤەکۆلینێن خۆ د هندەك گوڤارێن زانستی یێن ناڤدار دا بەلاڤنەکرن لەوڕا کەسێ ئاگەهـ ژ وان ئەنجامان نەبوو یێن وی بدەستڤە ئینانین، هەردیسان وی بەردەوام ڤەکۆلینین خۆ بۆ زانایێن ناڤدارێن وی سەردەمی فرێدکرن لێ کەسێ گرنگی پێ نەددا ژبەرکو لوی سەردەمی پتریا زانایان مژیلی گەنگەشەکرنا تیورا داروینی بوون ئەوا بەحسێ پەرەسەندنا مرۆڤ و زیندەوەران دکری.

هەتا دەمێ ل سالا 1844 مەندلی وەغەکر کری ژی کەسێ نەزانی کا ڤی زەلامی چ ڤەکۆلین ئەنجامداینە و چ تشتێ نوو ئاشکەرا کریە لەوڕا وەکی کەسەکێ بەرزە ژیانا خۆ بوراند و هەتا مری ژی کەسێ ئاگەهـ ژێ نەبوو.

ئەو ئەنجامێن مەندلی ل سەر ڤەکۆلینین خۆ بدەستڤە ئینانین، ل سالا 1900 سێ زانایێن دی ل سێ جهێن جوداجودا هەمان ئەنجام بدەستڤەئینان، ئەوژی زانایێ هولەندی "دفریس" و زانایێ ئەلمانی "کورنس" و زانایێ نەمساوی "فون چرماك" بوون، هەرچەندە ڤان زانایان ئاگەهـ ژ کارێن ئێکودوو نەبوو و هەر ئێکی ب شێوەیەکێ سەربەخۆ کاردکر لێ ئەو ڤەکۆلینین وان ئەنجامداین ئەو هەرسێ گەهاندنە ئێك ئەنجام ئەوژی یاسایێن بۆماوەیی بوون کو بەری هینگێ ب چەند سالەکان مەندلی گەهشتبوو ڤان ئەنجامان.

---

[1] ل وی دەمی دێر نەك تنێ جهێ پەرستنێ بوو بەلکو ناڤەندەکا زانستی ژی بوو، لەوڕا مەندل شیا هەڤنیاسینێ دگەل هژمارەکا مەزن یا زانایێن بناڤودەنگ بکەت

ئەو یاسایێن بۆماوەیی یێن مەندلی دانایین ئەڤەبوون: مەندلی ئاشکەرا کر کو هندەك ساخلەتێن بۆماوەیی یێن هەین ژ دەیکوبابان بۆ زاروکێن وان دچن، ئەڤ ساخلەتە بەردەوام ژ بەرەبابکەکی بۆ بەرەبابکێ ل دووڤدا دهێنە ڤەگۆهاستن. ئەو ڤەکۆلینێن مەندلی ل سەر بەزالیایێ ئەنجامدایین دیارکر کو هندەك ساخلەت وەك ڕەنگێ بەلگێن ڤی ڕۆەکی و شێوە و قەبارێ وان، هەردیسان ڕەنگێ توڤی و قەبارێ وان ژ بەرەبابکەکی بۆ بەرەبابکێ ل دووڤدا دهێتە ڤەگۆهاستن

ل ڤێرێ دوو فاکتەرێن بۆماوەیی کونترۆلێ ل سەر ڤێ چەندێ دکەن. لێ ئەرێ کا چەوا مەندل شیا ڤێ چەندێ ئاشکەرا بکەت. هەلبەت ئەڤ چەندەژی ژ ئەگەرێ ئەنجامدانا ڤەکۆلینان ل سەر ڤی ڕۆەکی و بێهنفرەهیا وی یا بێ وێنە و هێزا شرۆڤەکرن و تیبینیکرنێ، هەردیسان ژبەرکو بەرێ هینگێ زانستێ ماتماتیکێ خواندبوو لەوڕا ڤێ چەندێ گەلەك هاریکاریا وی کر ب سانەهی ڤان ئەنجامان لێکبدەت.

بۆ ماوێ پتر ژ هەشت سالان، مەندل شیا تاقیکرنان ل سەر پتر ژ 30,000 ڕۆەکێن بەزالیایێ بکەت، ئەو شیا ڤەکۆلینێ ل سەر هەتا حەفت بەرەبابکێن هندەك ڕۆەکان بکەت. مەندلی ئەو ڕۆەك دگەل ئێك کۆم دکرن یێن ساخلەتەکا گەلەك تایبەت هەی و پاشی وی هژمارا وان ڕۆەکێن نوو پەیدادبووین دخواندن و ل دەف خۆ تۆمار دکرن یێن ساخلەتێن نوو ل دەف پەیدا دبووین، پاشی وی هێلا ڕۆەکێن دووڕەگ و بەرەبابکێن وان ئەو ب خۆ ئێکدوو ب پیتینن. ل دوماهیێ وی ڕێکێن ماتماتیکی بکارئینان ژبۆ دیارکرنا هندێ کا چەوا ساخلەتێن جوداجودا ژ ڕۆەکێن دایکوباب دهێنە ڤەگوهاستن بۆ زارویێن وان.

بەری مەندل بهێت کەسێ چ پێزانین دەربارەی زانستێ بۆماوەزانیێ نەبوون لەوڕا ئەم دشێن بێژین مەندلی بەرێ بنیاتێ ڤی زانستی دانا، سەرەڕای هاتنا گەلەك زانایان پشتی مەندلی و ڤەکۆلینێن وان یێن گرنگ لێ مەندل شیا ئێکەم پێنگاڤ دەربارەی دەستپێکرنا زانستێ بومازانیێ ل دور گیانەوەر و ڕۆەکان بهاڤێژیت. ژبەر ڤێ چەندێ ژی ڕۆلێ هەرە سەرەکی بۆ ڤی زانای دزڤڕیت.

# 59. ماكس پلانك Max Planck

## (1835ز-1947ز)

### ماكس پلانك

### ئەو زانایێ شۆڕەشەكا مەزن د زانستێ فیزیایێ دا هەلكری

ل سالا 1900 زانایێ فیزیایی یێ ئەلمانی ماكس پلانكی ناڤەندێن زانستی مەندەهوشكرن دەمێ ئاشكەرا كری كو تێهنا پێلێن دەنگی بشێوەیەكێ نەیێ پێكڤەگرێدای خۆ دهاڤێژیت و ئەڤ تێهنە ژ هندەك یەكەیێن بچووك پێكدهێت دبێژنێ كوانتەم. ئەڤ تیورا نوو یا ژلایێ پلانكی ڤە هاتیەدانان بۆ ئەگەرێ دانانا هەمی یاسا و پرەنسیپێن تیورێن كوانتەمی یێن كو بووینە ئەگەرێ پەیدابوونا شۆڕەشەكا مەزن دزانستێ فیزیایێ دا.

ماكس پلانك ل سالا 1858 ل باژێرێ "كیل" یێ ئەلمانی ژدایكبوو، ل زانكۆیێن بەرلین و میونیخ خواندنا خۆ بدوماهی ئینا و ل دووڤدا شیا باوەرناما دكتورایێ ل زانكۆیا میونیخ بدەستڤە بینیت. دەمێ هێشتا د سالێن بیستان ژ ژیێ خۆ وەك ماموستا ل زانكۆیا میونیخ كاركر و باشی چوو زانكۆیا كیل و ل سالا 1889 وەك ماموستا ل زانكۆیا بەرلین هاتە دامەزراندن و ل وێرێ ما هەتا سالا 1928 دەمێ د ژیێ 70 سالێێ دا دەست ژ كاركێشای.

پلانكی وەكی گەلەك زانایێن دی گرنگی دا خواندنا وان تیشكان یێن ژ تەنێن ڕەش دەردكەڤن دەمێ دهێنە گەرمكرن[1]. لێ هندەك زانایێن فیزییایی شیابوون هندەك تیشكێن ژ ڤان تەنێن ڕەش دەردكەڤن توماربكەن بەری كو پلانك هزرا خۆ دڤێ چەندێ دا بكەت و ڤێ ئاریشێ چارەسەر بكەت.

---

[1] تەنێن ڕەش ئەو تشتن یێن چ تیشك ژێ نەدەركەڤن بەلكو ژ ئەنجامێ كەفتنا هندەك تتشێن دی بۆ سەر ڤان تەنان شنوی دیار دبن.

ئێکەم کارێ پلانك پێ ڕابووی دانانا هاوکێشەیەکا جەبری یا ئالۆز بوو کو ڕادبیت ب تومارکرنا لڤینا تیشکێن دەرکەفتی ژ تەنێن ڕەش، ئەڤ تیورا وی ئاشکەراکری هەتا ل سەردەمێ ئەڤروکەژی د زانستێ فیزیا تیوری دا دهێتە بکارئینان. لێ ل ڤێرێ ئاریشەك هاتەپێش ئەوژی یاساییێن فیزیاییێ بۆمە دیاردکەن کو هندەك هاوکێشەییێن دی یان شێوازێن دی یێن دەرکەفتنا تیشکان ژ تەنێن ڕەش یێن هەین.

پلانکی گەلەك هزرا خۆ د ڤێ ئاریشێ دا کر هەتا ل دوماهیێ تیورەکا نوو دانای کو دگوت "تێهنا تیشکدەر ل سەر شێوێ هندەك یەکەیێن پێکڤەنەگرێدای دەردکەڤیت و وی ناڤێ هەر ئێك ژ ڤان یەکەیان کرە کوانتەر"، بپشت بەستن ل سەر ڤێ تیورێ بۆمە دیاردبیت کو برا تیشکا دەرکەفتی ل سەر درێژاهیا پێلێ یان ڕەنگێ وێ دمینیت.

ئەڤ تیورا پلانکی هاتە ناڤکر ب تیورا "جێگریا پبلانکی" کو ژ هەمی وان تیورێن بەری هینگێ بەربەلاڤ د ڤی بواری دا یا جودابوو.

پشتی هینگێ پلانك ب خۆ شیا برا وێ تێهنا ژ تەنێن ڕەش دەردکەڤت ب پیڤیت و لوی سەردەمی ئەگەر پلانك زانایەکێ ناڤدار و خۆدان ڕێز نەبایە ڕەنگە هەر زوی ئەڤ تیورا وی هاتبا لادان، لێ ژبەر ناڤودەنگیا وی زانایێن ڕێزەکا مەزن لێ دگرت و بەرەڤ تیورا وی هاتن و هزرا خۆ ب شێوەیەکێ کویر د تیورا ویدا دکر هەتا بۆ وان ب بەلگە دیاربووی کو ئەڤ تیورە یا ڕاستە.

هەردیسا گەلەك زانایان هزردکر ئەڤ تیورا پلانکی سەرهاتیەکا وەرزشیە و هەتا پلانکی ب خۆژی هندەك جاران گومان ژ تیورا خۆ دبر لێ پشتی دەمەکی کێم ئەو شیا ب بەلگە بۆ زانایان دیاربکەت کو تیورا کوانتەمی دشێت گەلەك بوارێن دی یێن زانستی دا بهێتە ب کارئینان.

ل سالا 1905 زانا ئەنیشتاین شیا ب هاریکاریا کاریگەریا وێنەیێن ڕۆناهیێ ئاشکەرا بکەت، هەردیسان ب هاریکاریا ڤێ تیورێ زانا نیلز بور ل سالا 1913 شیا پێکهاتنا ناڤکا تۆخمان دیاربکەت. ل سالا 1918 زانا ماکس پلانك شیا خەلاتێ نۆبل ب دەستخۆڤە بینیت ئەوژی پشتی شیای ڕاستیا تیورا خۆ 100٪ ب بەلگەڤە دیاربکەت.

هەلویستێ زانا پلانکی دژی دەستهەلاتدرێن نازی یێن ئەلمانی ژیانا وی ئێخستە دمەترسیێ دا، ل سالا 1914 کورێ وی هاتە سێدارەدان ژبەرکو پشکداری د هەوەکا

سەرنەکەفتی دا کربوو ژ پێخەمەت کوشتنا هێتلەری لێ پلانك ب خۆ ل سالاٚ 1947 د ژیێ 89 سالێیێ دا وەغەرکر.

مەزنترین سەرکەفتنا چەرخێ بیستی پێشخستنا زانستێ "میکانیکا کوانتەمی"بوو کو گەلەك ژ تیورا ڕێژەیی یا ئەنیشتاینی مەزنتر و گرنگترە. تیورا "نەگورێ پلانکی" ڕۆلەکێ مەزن د تیورێن تیشکی دا هەبوو زێدەباری هژمارەکا مەزن یا تیورێن فیزیایی و تیورا دروستبوونا ناڤکا تۆخمێن کیمیایی، زێدەبارێ کاریگەیا وێ ل سەر "پڕەنسیپێ نەبوونا باوەریێ" یێ زانا هێزنبێرگی.

ئەم دشێن بێژین پلانك بابێ زانستێ میکانیا کوانتەمێ یە، هەرچەندە ڕۆلێ وی یێ لاواز بوو دپێشخستن و گوهۆرینا تیورا ویدا لێ نەیا دروستە ئەم ڕۆلێ وی ژبەر ڤێ چەندێ کێم بکەین ژبەرکو ئەو شیا مێشکێن زانایێن باوەری ب تیورێن کەڤن هەی ئازاد بکەن و هاریکاریا زانایان کر بەرێ خۆ بدەنە هندەك تیورێن نوو کو دگەل ڕاستێن سەردەم ب گونجیت.

## 60. جوزێف لیستەر Joseph Lister

## (1827ز. ـ 1912ز. )

### جوزێف لیستەر

### ئەو برینپێچێ بۆ ئێکەم جار کەرەستێن پاقژکرنێ د نشتەگەریاندا بکارئیناین

جوزێف لیستەر ئەو برینپێچێ بریتانی بوو یێ شیای بۆ ئێکەم جار کەرەستە و ماددێن پاقژکرن و تافیلکرنێ د نشتەگەریاندا بکاربینیت. لیتسەر ل سالا 1827 ل باژێرێ "ئابتون" ل ئینگلتەرا ژ دایکبوویە، ل سالا 1852 شیا پلەیەکا پزیشکی ل زانکۆیا لەندەن بدەستڤە بینیت ژبەرکو قوتابیەکێ زیرەك و بەهرەمەند بوو. ل سالا 1861 وەك برینپێچ ل نەخۆشخانا "گلاسکو" یا شاهانە هاتە دامەزراند و پشتی ماوەیەکی شیا ماددێن پاقژکرن تافیلکرنێ دنشتەگەریاندا بکاربینیت.

بەری لیستەر ڤان ماددەیان ب کاربینیت، هژمارەکا مەزن یا خەلکی پشتی ئەنجامدانا نشتەگەریان دمرین، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤرِی کو برینێن وان تووشی میکرۆبان دبوون و هێدی هێدی کێموعەداڤ دکەڤتە برینێن وان هەتا دمرین. لێ لیستەری بزاڤکرن ئەو ژورێن نشتەگەرییێن خۆ لێ ئەنجامددەت گەلەك د پاقژبن.

لێ پاقژیا ژورا نشتەگەرییێ ب تنێ نەبوو ئەگەرێ کێمکرنا هژمارا وان کەسان یێن پشتی نشتگەرییێ گیانێ خۆ ژ دەستددەن. هندەك نوژداران هزردکر ئەو دویکێل و هەلا ل نێزیك نەخۆشخانەیان بلد دبیت ئەوە یا دبیتە ئەگەرێ مرنا خەلکی لێ لیستەری باوەری ب ڤێ چەندێ نەبوو بەلکو وی دزانی تشتەکێ دی یێ هەی دبیتە ئەگەرێ مرنا وی خەلکی.

ل سالا 1865 لیستەری ڤەکۆلینەکا زانا لویس پاستەری خواند و بۆ وی دیاربوو کو زیندەوەرێن هویر و میکروب دبنە ئەگەرێ پەیداکرنا نەخۆشیان بۆ مرۆڤی، پشتی ڤێ چەندێ لیستەری کلیلکا ڤێ ئاریشێ دیت و زانی کو پشتی ب دوماهی هاتنا نشتەگەرییێ ب سانەهی میکروب دچنە دناڤ برینێن نەخۆشخان و نەخۆشیان پەیدادکەن.

ژبەرکو میکروب دبنە ئەگەرێ پەیدابوونا نەخۆشیان، چ پێنەڤێت دڤێت رێکەك هەبیت ئەم پێ ڤان میکروبان بکوژین داکو پشتی ب دوماهی هاتنا نشتەگەریان نەچنە دناڤ برینێن نەخۆشاندا.

لیستەری ترشێ "فارمۆلیك" وەك ماددەیەکێ پاقکرنا برینێن نەخۆشان بکارئینا، هەردیسان وی دەستێن خۆ و جلوبەرگ و هەمی کەلوپەلێن دهێنە ب کارئینان د ژورا نشتەگەریێ ڤە ب ڤی ترشی پاقژکرن. د هەمان دەمدا وی هەوایێ ژورا نشتەگەریێ ب ترشێ "کاربۆلیك"ی پاقژکر. پشتی ڤێ چەندێ لیستەری دیت ئێدی هژمارا وان کەسێن پشتی نشتەگەریاندا ئەنجامددەن دمرین هێدی هێدی بەرەڤ کێمبوونێ چوون.

ل دووڤدا لیستەری ڤەکۆلینین خۆ ل دور بکارئینانا ماددێن پاقژکرنێ بەری ئەنجامدانا نشتەگەریان بەلاڤکرن لێ چ زانا و نوژداران باوەری ب ڤەکۆلینێن وی نەبوو و گرنگی پێ نەدا، لەورا لیستەر نەچاربوو پشتی هینگێ بچیتە وەلاتێن ئەلمانیا و ئەمریکا و ل زانکۆییێن وێ هندەك گوتاران پێشکێش بکەت ل دور گرنگیا پاقژکرنا دەست و جلك و کەرەستە و ژورێن نشتەگەریان و ل وێرێ زانایان باوەری ب کارێن وی ئینا و لدویڤ رێکا وی چوون.

ژبەر تیورێن وی و ب کارئینانا ماددێن پاقژکەر د نشتەکریاندا، لیستەری گەلەك باوەرنامێن رێزلێنانێ وەرگرتن و پشتی هینگێ بۆ ماوێ پێنچ سالان بۆ سەروکێ کومەلا شاهانە و ل دووڤدا بوو برینپێچی تایبەت یێ شاهـژن ڤیکتوریایێ.

لیستەری ژیانا هەڤژینیێ پێکئینابوو لێ چ زاروك نەبوون، ل سالا 1912 د ژیێ 85 سالییێ دا وەغەرکر.

ئەو تشتێ لیستەری ئەنجامدای بوو ئەگەرێ رزگارکرنا گیانێ ملیونەها مرۆڤان ژ مرنەکا مسوگەر بتایبەت ئەوێن نشتەگەری ئەنجامددایـن.

راستە کو رێك و ماددێن پاقژکرنێ ل سەردەمێ ئەڤروکە گەلەك یێن پێشکەفتین لێ ئەم دشێن رۆلێ سەرەکی بۆ لیستەری و ڤەکولینێن وی ب زڤرینین زێدەباری ئەو گوتارێن وی ل ئەورۆپا و ئەمریکا پێشکێش کرین.

## 61. نیکۆلاس ئوگوست ئۆتۆ Nikolous August Otto

## (1823ز.-1891ز.)

### نیکولاس ئوگوست ئۆتۆ

### ئەو داهێنەرێ بەرێ بنیاتێ ئێکەم ترۆمبێل ل جیهانێ دانای

نیکولاس ئوگوست ئۆتۆ ئەو زانایێ ئەلمانی بوو یێ شیای بۆ ئێکەم جار ترومبێلەکا سادە ب چوار تائێران کو ب ئامیرەکێ سووتنا ناڤخۆیی کاردکر دروست بکەت کو پشتی هینگێ ئەڤ ترۆمبێلە بۆ بنەمایێ دروستکرنا هەمی جورێن ترۆمبێلێن دی ل جیهانێ.

ئەڤ ئامیرێ سووتنا ناڤخۆیی دناڤ پاپۆر و بەلەم و ماتۆرسکلاندا ژی هەیە، هەردیسان دناڤ گەلەك ئامیرێن دی یێن جوداجودا ل کارگەهان هەیە و ل دووڤدا ئەڤ ئامیرە بوونە ئەگەرێ پەیدابوونا فرۆکەیان، ئەڤ جورێ فرۆکەیان هەتا سالا 1939 ژی دهاتنە بکارئینان لێ پشتی هینگێ فرۆکەیێن ب دویکێل و خەلوزێ کاردکر هاتنە ب کارئینان.

هەرچەندە بەری نیکولاسی گەلەك زانایێن دی بزاڤێن دروستکرنا ترۆمبێلان کربوون وەك زانا "سیمری کارکوس" ل سالا 1875، "ئوستین لوفور" ل سالا 1862، "نیکولاس کونیوت" ل سالا 1769، ئەڤ زانایە هەمی شیابوون هندەك نموونەیێن سەرکەفتی یێن ترۆمبێلان دروست بکەن لێ کەس ژ وان نەشیابوو ڕێکەکێ یان ئامیرەکێ سووتنا ناڤخۆیی ب داهێنیت کو بیتە ئەگەر ترۆمبێل ب وێ گرانیا خۆڤە بلەز بچیت.

پشتی 15 سالاَن ل سەر داهێنانا ئامیرێ سووتنا ناڤخۆیی ژلایێ نیکولاس ئۆتۆی ڤە، دوو داهێنەرێن ئەلمانی ب ناڤێن "کارل بنزووگو" و "تلیب دیملەر" شیان ئامیرێن ترۆمبێلان دروستبکەن و فرێکەنە بازاری، پشتی هینگێ هندەك جورێن دی یێن ترۆمبێلان دەرکەفتن کو ب هێزا هەلی و پاترییێن کارەبایی کاردکرن، لێ ئەو ترۆمبێلێن ب ئامیرێ نیکولاسی کاردکرین ژ هەمیان سەرکەفتیتربوون ب ڕەنگەکی ل چەرخێ نوزدێ دا نێزیکی 90٪ ژ وان ترۆمبێلێن هاتینە دروستکرن ب ئامیرێ سووتنا ناڤخۆیی کاردکرن.

پتریا داهێنانێن هاتینە ئەنجامدان بووینە ئەگەرێ باشترکرنا ژیانا خەلکی و مفایەکێ مەزن ژێ هاتیە وەرگرتن ب تنێ چەك و تەقەمەنی نەبن. بوو نموونە داهێنانا حەبکێن پەنسلین و ئامیرێ بەفرگرێ نەبووینە ئەگەرێ کوشتنا چ مرۆڤان لێ بەروڤاژی مفایێن هەرە مەزن گەهاندینە مرۆڤی، ژلایەکێ دیڤە دبیت ژ ئەگەرێ ب کارئینانا ترۆمبێل و فرۆکە و پاپۆران ڕویدانێن دلتەزین ژێ پەیدابووینە و ژینگەهێ پیس دکەن، لێ دگەل هندێ کەس داخازا هندێ ناکەت کو ئەڤ ئامیرە بهێنە قەدەغەکرن و ئێدی کەس بکارنەئینیت.

ل سەردەمێ ئەڤروکەدا گەلەك کومپانییێن دروستکرنا ترۆمبێلان دەرکەفتینە و بووینە مارکەیێن جیهانی و هەر ئێك ژلایێ خۆڤە هەڤڕکیێ ل سەر بەرهەم ئینانا ترۆمبێلێن بچووکتر و بلەزتر و باشترو جوانتر دکەت. هەردیسان ترۆمبێل بویونە ئەگەر ب هزارەها کرێکار ل ڤان کومپانیان کاربکەن زێدەباری کرێکارێن چاککرنا ترۆمبێلێن ژکارکەفتی و پانزیخانە و پارکێن ڕاوەستاندنا ترۆمبێلان. ئانکو د سەردەمێ ئەڤروکە ترۆمبێل بوویە ئێك ژ پێدڤیێن هەرە گرنگ و سەرەکی یێن ژیانا مرۆڤی.

نیکولاس ئوگوست ئۆتۆ ل سالا 1832 ل باژێرێ "هولسهاوزن" یێ ئەلمانی ژدایکبویە، هێشتا یێ زاروك بابێ وی وەغەرکر لەوڕا نەشیا خۆاندنا خۆ تەمام بکەت، د ژیێ 16 سالیێ دا بەرەڤ کارێن بازرگانیڤە چوو و بۆ خۆ دوکانەکا فروتنا فێقی ڤەکر و پاشی ل کومپانیەکێ وەك نڤیسەر کارکر.

ل سالا 1860 نیکولاسی زانی کو ئامیرەکێ سووتنا ناڤخۆیی ژلایێ داهێنەرێ فرەنسی ئوستین لوفواری (1922-1900) ڤە یێ هاتیە دروستکرن لێ ئامیرێ وی ب غازێ کاردکر، نیکولاسی هزرکر ئەگەر لشوینا غازێ شلەمەنیەکێ شل وەکی گازێ یان پانزینێ یان گازوایلێ بهێتە بکارئینان دێ بیتە ئەگەر ئەڤ ئامیرە باشتر کاربکەن و د گەلەك بوارێن دیدا بهێنە بکارئینان. نیکولاسی ئامیرێ کاربوراتوری داهێنا لێ ئەڤ داهێنانا وی ژلایێ نڤیسینگەها تومارکرنا داهێنانێن زانستیڤە نەهاتە تومارکرن ب هێجەتا هندێ کو گەلەك ئەندازیارییێن دی داخازا تومارکرنا هندەك ئامیرێن وەکهەڤی وان کریە.

لێ نیکولاس بێ هیڤی نەبوو بەلکو یێ بەردەوام بوو ل سەر پێشخستنا وی ئامیرێ لوفواری داهێنای، ل سالا 1861 شیا ئامیرەکی نوو دروستبکەت کو ب چوار تائێران کاردکر لێ ئەو ئامیرێ لوفواری دروستکری ب دوو تائێران کاردکر.

ل دووڤدا نیکولاسی دگەل هندەك کەسێن دی کومپانیەك ژبۆ دروستکرنا ڤان تائێران دامەزراند، ل سالا 1867 ئەڤ ئامیرە شیا مەدالیا زێری ل پێشانگەها نیڤدەولەتی ل پاریسێ وەربگریت، ل سالا 1872 ئەندازیارەکێ دی یێ چەلەنگ ب ناڤێ دیملەر هاتە کومپانیا وان و هاریکاریا وان دکر.

نیکولاس یێ بەردەوام بوو ل سەر پێشخستنا ئامیرێ سووتنا ناڤخۆیی کو ڕادبیت ب کومکرنا هەوایی و سووتەمەنیێ بەری دەست بکاری بکەت، ل سالا 1876 نێزیکی 30 هزار ئامیرێن ژڤی جوری کەفتنە بازاری. هەرچەندە ل هەمان سالێ زانایەکێ فرەنسی ب ناڤێ "فونس دروشا" ئامیرەکێ وەکی یێ نیکولاسی دروستکر لێ ڤی ئامیرێ وی دەنگڤەنەدا و کەسێ ژێ نەکری لەوڕا ئامیرێ وی چ کاریگەری ل سەر فرەنسا و ئەوروپا نەبوو.

نیکولاس ئۆتۆ ل سالا 1891 وەرغەکر کو لوی دەمی زەنگینترین کەس بوو ل ئەڵمانیا، بەری مرنا خۆ ب ماوەیەکێ کێم کومپانیا خۆ ڕادەستی ئەندازیار "گوتلیب دیملەر"ی کر، دیملەری ل سالا 1893 ئەڤ ئامیرە گەلەك پێشئێخست و شیانێن وێ پترلێکرن برەنگەکی ئەو ئامیری نیکولاسی دروستکری 180 خۆل د خۆلەکەکێ دا دبرین لێ ئامیرێ دیملەری دروستکری ژ 700 هەتا 900 خۆلان د خۆلەکەکێ دا د برین، پشتی هینگێ شیا قەبارێ ڤان ئامیران بچوکتر وسڤکتر لێ بکەت هەتا شیای ئێکەم ماتورسیکل د دیروکێ دروست بکەت.

د هەمان دەمدا ئەندازیاەکێ دی ب ناڤێ "کارل بنز" شیا ئامیرەکی دروست بکەت کو سێ تائێرە هەبوون و گەلەك یێ بلەز و سڤك بوو کو د هەر خۆلەکەکێدا 400 خۆل د برین. پشتی هینگێ هەردوو کومپانیێن بنز و دیملەر بوونە ئێك و کومپانیا مارسیدس بنز یا ناڤدار دامەزراند.

هەردیسان کەسەکێ دیژی دەست دگەل پیشخستنا ئامیرێن ترۆمبێلێ هەبوو ئەوژی داهێنەرێ ئەمریکی "هێنری فورد" بوو کو ئێکەم ترۆمبێلا فورد ل جیهانێ ل سالا 1908 ب بهایەکێ گەلەك ئەرزان ئێخستە بازاری، لێ بەری وی چەندین ترۆمبێلێن دی یێن

ئەزران هاتبوونە فروتن وەك ترۆمبێلا ئۆلدزموبیل ب بهایێ 650 دولاران و ترۆمبێلا کادیلاك ب بهایێ 875 دولاران. لێ ئەو ترومبێلا فوردی دروستکری گەلەك باشتربوو دیزاینا وێ یا ناڤخۆیی جوانتر بوو لەورا هەر زوی ل سەرانسەری جیهانێ بەلاڤ بوو و هاتەفروتن.

ڕاستە ڕولێ داهێنانا ترۆمبێلێ بۆ گەلەك کەسان دزڤڕیت و هەمی هەژی ڕێزگرتنێ نە، لێ ڕۆلێ هەرە مەزن بۆ نیکولاس ئۆتۆی دزڤڕیت ژبەرکو ئەو ئامیرێ سووتنا ناڤخۆیی یێ وی دروستکری بوو ئەگەر زویکا ترۆمبێل بهێنە دروستکرن و ل دووڤدا فرۆکە ژی بهێنە دروستکرن، دبیت ئەگەر ئەو نەبا کەسەکێ دی هاتبا وئەڤ چەندە کریا لێ دا ئەڤ چەندە گیروبیت لەورا نیکولاس ئۆتۆ دهێتە هەژمارتن ئێك ژ وان کەسێن ژیانا سەردەم ئاڤاکری.

## 62. فرانسیسکو بیسارۆ Francisco Pizarro

## (1475ز-1541ز.)

### فرانسیکو بیسارۆ

### ئەو سەرکێشێ ب 200 چەکداران شیای ئیمپراتۆریا ئەنکاسێ ژناڤ ببەت

فرانسیسکو بیسارۆ ئەو سەرکردێ ئیسپانی بوو یێ شەڕێ ئیمپراتۆریا "ئەنکاس"[1] ل وەلاتێ پیرو کری و ژناڤبری، بیسارۆ ل سالا 1475 ل باژێرێ "ترۆجیلو" ل ئیسپانیا ژدایکبوویە. هەر ژ بچووکاتیا خۆ حەز ژ ناڤودەنگی و زەنگینیێ دکر و بەردەوام ژبۆ ڤێ مەرەمێ خەبات دکر هەتا مری.

ل ماوێ دناڤبەرا سالێن 1502 هەتا 1509 بیسارۆ ل سەر گزیرتا "هیسبانیولا" ل سەر دەریا کاریبی دژیا کو هەردوو کومارێن هایتی و دومنیکان ل وێرێ بوون، ل سالا 1513 ژی ئێك ژ وان کەسان بوون یێن ب هەوەکێ ب سەرکێشیا فاسکو توینسی گزیرتا ئارام ئاشکەرا کری، ل سالا 1519 ل وەلاتێ بەنەما ئاکنجیبوو، ل سالا 1522 و د ژیێ 47 سالیێ دا بیسارۆی زانی ئیمپراتۆریەك ب ناڤێ ئەنکاس ل وەلاتێ پیرو یا هەی کو بەری هینگێ گەرۆکێ ئیسپانی "پاسکال ئەنداگویا" سەرەدانا وێرێ کربوو لەوڕا بریاردا بچیت شەڕێ وان بکەت و وەلاتێ وان داگیربکەت.

بزاڤا ئێکێ یا بیسارۆی دناڤبەرا سالێن 1524 و 1525 دا یا سەرکەفتی نەبوو لەوڕا بریاردا هەردوو پاپۆرێن خۆ بزڤڕینتەڤە ، بزاڤا وی یا دووێ دناڤبەرا سالێن 1526 و 1528 دا سەرکەفتی بوو شیا کنارێن دەریایی ل وەلاتێ پیرو داگیربکەت و گەلەك زێر و گیانەوەر و هندوکێن سۆر دگەل خۆ بینیت.

---

[1] ئەنکاس یانژی ئەنکا Inca ئیمپراتۆریەکا کەڤن بوو ژلایێ هندوکێن سۆرڤە ل کیشوەرێ ئەمریکا هاتبوو دانان و روبەرەکێ بەرفرەھ هەبوو کو وەلاتێن بۆلیڤیا و پیرو و ئیکوادور و چیلی و ئەرژەنتین ب خۆڤە دگرتن، پایتەختێ وان باژێرێ "کوسکو" بوو.

ل سالا 1528 ڤەگەریا وەلاتێ ئیسپانیا، لێ پشتی سێ سالان شاهـ کارلوسێ پێنجێ ئەو ڕاسپارد داکو بچیت وەلاتێ پیرو داگیربکەت لەوڕا پارەیەکێ مەزن و زەلام و پاپۆر دانە دگەل، ل سالا 1531 کو هینگێ ژیێ وی 56 سالێ بوون ژ وەلاتێ ئیسپانیا ب ڕێکەفتن، هژمارا ئەو زەلامێن دگەل وی ب تنێ 200 کەس بوون لێ هژمارا ئەو ئیمپراتۆریا دا چن داگیربکەن پتر بوو ژ شەش ملیون مرۆڤان.

ل ئیلونا 1532 ب هەڤالێنیا 177 زەلام و 62 هەسپان بەرەڤ ئیمپراتۆریا ئانکاسێ ڤە چوو و هێزێن خۆ ل چیایێ ئەندیس بەلاڤکرن هەتا دگەهنە باژێرێ "کاخامر" کو ل وێرێ 40 هزار شەڕکەرێن لەشکەرێ ئەنکاسێ ل هیڤیا وان بوون. ل چریا دوێ یا هەمان سالێ گەهشتنە وی باژێرێ و پاشی لدویف داخازیا بیساروی هیزێن ئەنکاسێ خۆ ڤەکێشان و پاشی سەرکردێ ئیمپراتۆریا ئەنکاسێ دگەل 5000 شەڕکەران بێ چەك هاتنە دەڤ بیساوی داکو هەڤپەیمانیەکێ دگەل گرێدەن.

کەسێ نەدزانی کا بوچی سەرکردێ ئەنکاسێ بێ چەك چوو دەڤ بیساوی و بوچی هێلا هێزێن ئیسپانی بهێنە دناڤ وەلاتێ واندا و دەلیڤە داییێ هەتا دگەهنە پایتەختێ وان ژبەرکو ئەو دشیان ئێکسەر زەلامێن بیسارۆی هێشتا ل سەر لێڤێن دەریایی بکوژن، دیروکنڤێس د وێ باوەرێ دانە کو مللەتێ ئەنکاسێ گەلەك د دانا تەلهاندا دشارەزابوون و دبیت وان هزرکر بیت پیلانەکا ژڤی ڕەنگی بو هێزێن ئیسپانی بدانن. تشتێ سەیر ل ڤێرێ ئەوبوو بیساوی ئەڤ چەندە بدەلیڤە دیت و هەر ئێکسەر سەرکردێ ئیمپراتۆریا ئەنکاسێ دەستگیرکر و د ماوێ نیف دەمژمێرێ هەمی لەشکەرێ وی یێ بێ چەك کوشت بێی کو خۆ زەلامەکێ وی بهێتە کوشتن، لێ بیسارۆ ب تنێ بریندار بوو دەمێ بزاڤ کرین سەرکردێ وان بپارێزیت.

ئەڤ فێلا بیسارۆی بوو ئەگەرێ سەرکەفتنەکا مەزن ژبەرکو خەلکێ ئەنکاسێ بۆ دەستهەلاتداریێ پشت بەستن دکرە سەر کەسەکی ب تنێ و هزرکر دکر ئەو خۆداوەندێ وانە، هەرچەندە سەرکردێ ئەنکاسێ کو ناڤێ وی "ئانا هولایا" بوو یێ ئامادەبوو دیاریەکێ بدەتە بیسارۆی ب بهاییێ 28 ملیون دولاران لێ بیسارۆی پشتی بورینا دوو هەیڤان ژ دەستەسەرکرنا وی ئەو سێدارەدا.

پشتی سێدارەدانا وی هێزێن ئیسپانی شیان بێی شەڕ بچنە د پایتەختێ ئەنکاسێ باژێرێ "کوسکو" دا. ل سالا 1535 وان باژێرێ لیما دیت کو هەتا سەردەمێ ئەڤروکە ژی بوویە پایتەختێ وەلاتێ پیرو. ل سالا 1536 شۆڕەشەك دژی ئیسپانیا هاتەکرن لێ هێزین ئیسپانی هەر زوی شیان ڤێ شۆڕەشێ بێدەنگ بکەن و جارەکا ئێمناهیێ بۆ وەلاتی بزڤڕینەڤە ب تایبەت پشتی مرنا بیسارۆی.

بیسارۆ ژلایێ هێزێن ئیسپانی بخۆڤە هاتە کوشتن ب تومەتا هندێ کو کەسەکێ تەماع بوو وهەمی تشت بۆ خۆ دهەلگرتن و چ تشت نەدانە هەڤالێن خۆ یێن دگەل وی شەڕدکر، ژبەر ڤێ چەندێ سالا 1541 هێرش کرە سەر مالا وی ل باژێرێ لیما و د ژیێ 66 سالێیێ دا کوشت، ئانکو پشتی هەشت سالان ژ داگیرکرنا وەلاتێ پیروی.

بیسارۆ زەلامەکێ چاڤنەترس و دلڕەق بوو لەوڕا هەمی ئەو شەڕێن ب سەرکێشیا وان هاتینە ئەنجامدان د خویناوی بوون، د هەما دەمدا کەسەکێ گەلەك دیندار ژی بوو، دیروکنڤیس دبێژن دەمێ ئەو هاتیە کوشتن و کەفتیە سەر عەردی ب خوینا وی وێنێ خاچەکێ هاتەکێشان و دوماهیك پەیڤا وی ئەوبوو گازی حەزڕەتێ مەسیحی دکر.

ئەگەرێ سەرەکی یێ دانانا ناڤێ بیسارۆی دگەل لیستا کەسێن کاریگەر د دیروکێ دا ژبۆ هندێ دزڤڕیت کو ئەو شیا ئیمپراتۆریا ئەنکاسێ ژناڤ ببەت کو پشتی هینگێ خەلکێ ڤێ ئیمپراترویێ نەشیان خۆ لبەر هێرشێن هێزێن ئیسپانی و ئەورۆپی بگرن، ئەڤ دەڤەرێن بەرفرەھ ب شارستانی و ڕەوشەنبیریا ئیسپانیا داخباربوون، لێ هندوکێن سۆر شیان خۆ ل هندەك جهێن تەنگ و ئاسێ ل کێشوەرێ ئەمریکا ڤەشێرن و ژ ئێدی وێڤە هندوکێن سور چ دەستهەلات نەما ب تنێ بەرەڤانی ژخۆ دکر و خۆ دڤەشارتن، ژبەر ڤێ چەندێ زمانێن ئەورۆپی و ئاینێ مەسیحی و شارستانیا وان لڤان دەڤەران بەربەلاڤ بوون.

سەرکەفتنێن بیسارۆی ل سەر هێزەکا مەزن بوونە ئەگەر ناڤێ وی د دیروکێ دا بهێتە تومارکرن، ئەگەر هێزێن ئیمپراتۆریا ئەنکاسێ چەکێ خۆ دگەل خۆ ئینابا ڕەنگە بۆ ماوەیەکێ درێژ کو ب سالان ڤەکێشابا هێزێن ئیسپانی نەشیابان وەلاتێ وان داگیربکەن، لێ بیسارۆی ئەڤ چەندە بدەلیڤە دیت و سەرکێشێ وان گرت و هەمی لەشکەرێ بێ چەك کوشت، ئەڤێ چەندێ ڕێکەکا بەرفرەھ لبەر داگیرکرنا کێشوەرێ ئەمریکا لاتینی ڤەکر.

## 63. هێرناندۆ کۆرتیس Hernando Cortes

## (1485ز-1547ز.)

### هێرناندۆ کۆرتیس

### ئەو گەرۆکڤانێ شیای وەلاتێ مەکسیکێ داگیربکەت

گەرۆکێ جیهانی هێرناندۆ کۆرتیس یێ کو بۆ ئێکەم جار وەلاتێ مەکسیکێ داگیرکری، ل سالا 1485 ل باژێرێ مەدەلین ل وەلاتێ ئیسپانیا ژ خێزانەکا هەژار و دەستکورت ژدایکبوویە. ل ژیێ گەنجاتیێ کۆرتیسی ل زانکۆیا سالامانکا دەست بخواندنا یاسایێ کر، دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 19 سالێ وەلاتێ ئیسپانیا بجھ هێلا و دگەل گەرۆکێن دەریایی بەرەڤ وان جهان چوو یێن شنی هاتینە ئاشکەراکرن ب تایبەت کێشوەرێ ئەمریکا لاتینی. ل سالا 1504 گەهشتە دەڤەرا "هیسبانیولا" و بۆ ماوێ چەندین سالان ما ل وێرێ و سالا 1511 د بەشداری د شەڕێ ئیسپانیا دژی وەلاتێ کوبا دا کر, پشتی هینگێ ژیانا هەڤژینییێ دگەل خویشکا ئیمپراتۆرێ کوبا پێکئینا لەوڕا وەك پارێزگەهێ باژێرێ "سانتیاگو" هاتە دامەزراندن.

ل سالا 1518 کۆرتیس ژلایێ ئیمپراتۆریڤە هاتە هەلبژارتن داکو سەرکێشیا وی لەشکەری بکەت یێ کو دێ چیت وەلاتێ مەکسیکێ داگیرکەت، هەرچەندە پشتی هینگێ ئیمپراتۆر ژڤێ بریارا خۆ پەشیمان ببوو لێ دەم بسەرڤە چوبوو چونکی کۆرتیسی ل هەیڤا شواتا سالا 1519 گەشتا خۆ دگەل 11 پاپۆر و 110 دەریاڤان و 553 کەسان دەستپێکربوو کو 13 ژ وانان خودانێن تڤەنگان و 32 خودانێن تیرکوڤانان و 10 ل سەر توپهاڤێژێن گران و 4 خۆدان توپهاڤێژێن سڤك بوون زێدەباری هندێ 16 هەسپ دگەل بوون. پشتی هینگێ ئەو گەهشتنە کارێن دەریایی و ل وێرێ مان ژبەرکو کۆرتیسی دڤیا گەلەك پێزانینان ل سەر وەلاتێ مەکسیکێ کوم بکەت کو هینگێ لژێر دەستهەلاتا هوزێن "ئەزەتیك"ڤە بوو و گەلەك بەر کانزایێن بهاگران لێ هەبوون.

هەرچەندە كۆرتيسى بريياردا شەڕێ ڤان هوزان بكەت لێ لەشكەرێ وى تووشى ترسێ و دوودليێ بوو ژبەركو ڤان هوزان لەشكەرەكێ گەلەك مەزن ئينا بەر سينگێ وان و گەلەك ژ لەشكەرى وى هاتنە كوشتن.

داكو كۆرتيس خۆ ژ ڤێ ئاريشى قۆرتال بكەت ڕابوو ب سووتنا هەمى وان پاپۆرێن دگەل وى داكو لەشكەرى ْخۆ نەچاربكەت پاشڤە نەزڤڕن و شەڕێ هندوكێن سور بكەن چونكى ئێدى وان چ هەلبژارتن ژبلى شەڕى نەمان.

پشتى هينگێ شەڕەكێ دژوار و خويناوى دناڤبەرا شەڕكەرێن ڤان هوزان و لەشكەرێ ئيسپانى دا هاتنەكرن، لدەستپێكى وان بريياردا شەڕێ هوزێن هندوكێن سۆر نەكەن ژبەركو هندوكانژى حەز ژ دەستهەلآتا هوزێن ئەزەتيكى نەدكر لەوڕا هەر زوى هاتنە پشتا لەشكەرێ ئيسپانى و هارى وان شەڕێ دژى ئەزەتيكان بكەن

لوى سەردەمى شاهەكى ب ناڤێ "مونتيزوما يێ دووێ" دەستهەلآت ل هوزێن ئەزەتيكى دكر، لەشكەرێ ئيسپانى شيان ڤى شاهى بگرن و لەشكەرێ وى بشكێنن و پايتەختێ وان كو ل سەردەمێ ئەڤروكە دكەڤيتە باژێرێ مەكسيكێ داگيربكەن.

پشتى هينگێ هندەك هێزێن لەشكەرى يێن ئيسپانى گەهشتنە مەكسيكێ و هاتبوونە ڕاسپاردن كو كۆرتيسى ب هەر ڕەنگەكێ هەبيت بگرن و ب زڤڕينە ڤە ئيسپانيا ڤێجا چ يێ مرى يان يێ ساخ بيت، پشتى كۆرتيسى ئەڤ چەندە زانى هندەك ژ لەشكەرێ خۆ كومكر وشەڕێ ڤى لەشكەرێ ئيسپانى يێ ژ نوو هاتيە وێرێ كر و شيا بشكێنيت لەوڕا ئەو كەسێن ماينە ساخ هاتنە دگەل وى و دووبارە كۆرتيس بەرەڤ پايتەختى چوو.

ئێك ژ ڕويدانێن هەرە سەير د ديروكێ دا ئەوبوو دەمێ سەركردەيەكێ وەكى كۆرتيسى ب هژمارەكا كێم يا لەشكەرى شەڕێ هوزەكا مەزن بكەت و بشكێنيت، هەلبەت ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژى بۆ هەبوونا توپهاڤێژان و هەسپان دزڤڕيت زێدەبارى دانانا پيلانێن شەڕى يێن سەركەفتى و زيرەكى و چاڤنەترسيا لەشكەرى.

لێ ئەگەرێ دى يێ سەرەكى هەيە كو ڕەنگە د هزرا كەسێ دا نەبيت ئەوژى ئەوبوو كو هندەك چيڤانوكێن مللەتێ ئەزەتيكى دهاتنە ڤەگێران و دگوتن ل دوماهيێ خۆداوەندێ وان يێ ڕاستەقينە دێ هێت وان قورتال كەت كو خۆدان بەژنەكا بلند و ڕيهێن سپى نە،

لەوڕا وان هزرکر کۆرتیس ئەو خوداوەندە، کۆرتیسی هەر زوی ئەو فێری چاندن و پیشەسازیا کانزایان کرن لەوڕا وان گەلەك حەز ژێ کر و هەڤڕکیا وی نەکر.

کۆرتیسی بزاڤێن مەزن دکرن شەڕێ هندوکێن سۆر نەکەت بەلکو ئارمانجا ڤێ هەوا وی ئەوبوو وان فێرێ ئاینێ مەسیحیەتێ بکەت، ئەو ب خۆژی کەسەکێ ئایندار و زیرەك بوو، دەمێ شاهێ ئیسپانیا ئەو ژ پۆستێ وی ئیخستی و زڤڕاندیە وەلاتێ ئیسپانیا، هیڤیا وی یا هەرە مەزن ئەوبوو جارەکا ب زڤڕیتە وەلاتێ مەکسیك.

کۆرتیس ل سالا 1547 ل باژێرێ "ئەشبیلە" ل ئیسپانیا وەغەکر کو هینگێ کەسەکێ گەلەك زەنگین و خۆدان مالۆملك بوو، لێ مالۆملکێ وی یێ بەرفرەهـ ل وەلاتێ مەکسیکێ هەمی بۆ کورێ وی ما.

بەری مرنا خۆ، کۆرتیسی د وەسیەتناما خۆدا بۆ کورێ خۆ نڤێسابوو: ئەز نزانم کا گونەهە یان ژی دروستە مرۆڤی هژمارەما کولەیێن هندوکێن سۆر هەبن، لەوڕا وی داخاز ژ کورێ خۆ کر هزرا ڤێ چەندێ بکەت و چارەسەر بکەت داکو ئەو د گۆڕێ خۆدا یێ ئارام بیت. ئەڤ هەستا ئێکانەیا کۆرتیسی ل دەف هەردوو گەرۆکڤانێن دی یێن ئیساپنی بیسارۆی و کریستوفەر کولمبوسی نەبوو.

لێ دگەل هندێ ژی هندەك وەکهەڤی دناڤبەرا بیسارۆی و کۆرتیسی دا هەبوون، هەردوو ژ ئێك خێزان بوون و جهێ ژدایکبوونا وان 50 میلان یێ ژێکدوور بوو، و جوداهیا ژیێ وان ب تنێ 10 سالێ بوون ئانکو بیسارۆ 10 سالان ژ کۆرتیسی مەزنتربوو، هەردیسان ئەڤ هەردوو گەرۆکە شیان ڕوبەرەکێ بەرفرەهـ یێ عەردی داگیربکەت کو ڕوبەرێ وان هندی یێ کێشوەرەکی بوو، د هەمان دەمدا شیان زمانێ ئیسپانی و ئاینێ مەسیحیەتێ ل سەر مللەتێ، داگیرکری ب سەپینن، لەورا هەر ژ هینگێ وەرە ئێدی شارستانی و سیاسەتتا ئیسپانیا شیا کونترۆلێ ل سەر دەڤەر و وەلاتێن جیهانێ بکەت.

ئەو سەرکەفتنێن بیسارۆی و کۆرتیسی پێکڤە تومارکرین گەلەك مەزنتربوون ژ سەرکەفتنا سیمون بولیڤاری، ژبەرکو ئەڤ هەردوو کەسە شیان دەستهەلاتێ ژ دەستێ هندوکێن سۆر ل کێشوەرێ ئەمریکا لاتینی بینە دەرێ و بکەنە د دەستێ ئەورۆپیاندا.

## 64. تۆماس جیفەرسۆن Thoman Jefferson

## (1826_1743)

### تۆماس جیفەرسۆن

### سێیەم سەروکێ ویلایەتێن ئێگرتی یێن ئەمریکا

تۆماس جیفەرسۆن سێیەم سەروکێ ویلایەتێن ئێکگرتی یێن ئەمریکا و خودانێ بەلگەناما "ڕاگەهاندنا سەربەخۆبونێ"[1] ل سالا 1743 ل دەڤەرا "شادول" ل ویلایەتا فیرجینا ژدایکبوویە، بابێ وی ڕوپیڤەر و خودانێ هژمارەکا مەزن یا زەڤیێن عەردی بوو و ئەڤ سامانە هەمی پشتی مرنا وی بۆ کورێ وی جیفەرسۆنی مان. جیفەرسونی ل زانکۆیا ویلیەم ماری هاتە وەرگرتن لێ نەشیا چ پلەیێن زانستی بدەستخۆڤە بینیت ژبەرکو پشتی بورینا دوو سالاْن زانکۆ بجه هێلا.

پشتی بورینا چەند سالەکان ژ نوو دووبارە زڤڕی زانکۆیێ و باوەرناما یاسایێ ل سالا 1767 وەگرت و بۆ ماوێ حەفت سالێن ل دویڤدا کارێ پارێزەیێ دکر و دگەل هندێ و سەرپەرشتیا عەردێ خۆ یێ چاندنێ دکر، ژبەر زەنگینیا وی هاتە هەلبژارتن وەك ئێك ژ ئەندامێن جڤاتا نوینەران ل ویلایەتا فیرجینیا.

جیفەرسۆنی ئێکەم ڤەکۆلینا خۆ ل سالا 1774 ب ناڤێ "دیتنەکا پۆختەیی ل دور مافێن ئەمریکی یێن بەریتانی" بەلاڤکر، ل سالا ل دووڤدا ژلایێ ویلایەتا فیرجینیاڤە هاتە هەلبژارتن داکو نوینەراتیا وان بکەت ل کونگرێ دووێ یێ کێشوەرێ ئەمریکا. ل سالا 1776 وی بەلگەناما "ڕاگەهاندنا سەربەخۆبوونێ" نڤیسا و پاشی زڤڕی ویلایەتا فیرجینیا داکو هندەك گوهۆرینان د سیستەمێ حوکمڕانییێ دا بکەت. وی دوو گوهۆرینێن گەلەك

[1] بەلگەناما سەربەخۆبوونا ئەمریکا ئەوا ژلایێ تۆماس جیفەرسۆنیڤە هاتیە نڤیسێن ل 4 تیرمەها 1776 ژلایێ کونگرێسی ئەمریکاڤە هاتە پەسەندکرن، بریارهاتەدان ئەو هەر 13 مێتینگەهێن (مستعمرات) ئەمریکی یێن ناکوکی هەی دگەل بڕیتانیا دێ بنە ویلایەتێن سەربەخۆ و ئێدی نامیننە لژێر حوکمرانیا بڕیتانیاڤە.

گرنگ ئەنجامدان ئەوژی یاسایا ڕێکخستنا ئازادیا بیروباوەران و یاسایا ڕێکخستنا پرۆگرامێن خواندنێ بوو.

د یاسایا ڕێکخستنا پرۆگرامێن خواندنێ دا وی بریاردا خۆاندنا سەرەتایی بێ بەرامبەر ژبۆ هەمی کەسان بهێتە دابینکرن، هەردیسان بریاردا زانکۆ وپەیمانگەهـ بهێنە ئاڤاکرن و پشتەڤانیا قوتابیێن زیرەك کر بچنە دەرڤەی ویلایەتێن دی بۆ تەمامکرنا خۆاندنا خۆ، هەرچەندە لدەستپێکێ هندەك دەنگین نەڕازیبوونێ دژی ڤان بریارێن وی بلند بوون، لێ پشتی هینگێ ب ماوەیەکێ کورت ئەڤ بریارە نەك تنێ ل ویلایەتا ڤێرجینیا بەلکو ل گەلەك ویلایەتێن دیژی هاتنە بجهئینان.

د یاسایا ڕێکخستنا بیروباوەران دا ژی وی بزاڤ دکرن گیانیێ لێبورینێ دناڤ تەخوچین و ئاینێن جوداجودا بەلاڤ بکەت و بریاردا ئێدی دێر مایێ خۆ د کاروبارێن دەولەتێ دا نەکەت، هەردیسان هندەك کەس دژی ڤی یاسایێ ژی بوون لێ ل سالا 1786 ئەڤ یاسایە چوو دناڤ دەستورێ ویلایەتا ڤیرجینیا دا و هێدی هێدی ل ویلایەتێن دیژی هاتە بجهئینان هەتا چوویە دناڤ دەستورێ هەمی ویلایەتێن وەلاتی دا.

دناڤبەرا سالێن 1779 هەتا 1781 جیفەرسۆن بوو دادوەرێ ویلایەتا ڤیرجینیا لێ پشتی هینگێ دەست ژ ژیانا سیاسی بەردا، دڤی ماوەی دا وی پەرتووکا خۆ یا ئێکانە ب ناڤێ "چەند تیبینەك ل دور ویلایەتا ڤیرجینیا" بەلاڤکر کو تێدا ب توندی ڕەخنە ل بازرگانیا بەندەیان دگرت. ل سالا 1782 هەڤژینا وی وەغەکر، هەرچەندە ئەو هێشتا یێ گەنج بوو دەمێ ژیانا هەڤژینیێ پێکئینای لێ بەرهەمێ هەڤژینیا وان یا نێزیکی دەه سالان وان شەش زاروك هەبوون لەوڕا وی بریارا ئێدی چ ژنێن دی نەئینیت.

پشتی هینگێ وی بریاردا دووبارە بچیتە دناڤ ژیانا سیاسی دا و ڤێ جارێ هاتە هەلبژارتن وەك ئێك ژ ئەندامێن کونگرێسێ ئەمریکا، ئێکەم پرۆژێ وی پێشکێشی کونگرێسی کری، پرۆژی ب کارینانا "سیستەمی دەهی" بوو ژبۆ دراڤی، ئەڤ پرۆژێ وی ژلایێ کونگرێسیڤە هاتە پەسەندکرن، لێ هەمان پرۆژێ وی ژبۆ ب کارئینانا سیستەمی دەهی بۆ کێشان و پیڤانی و پرۆژێ نەهێلانا بازرگانیا بەندەیان ل ویلایەتێن نوو ژلایێ ئەندامێن کونگرێسیڤە هاتە ڕەتکرن.

ل سالا 1784 جیفەرسۆن ژبۆ کارەکێ دیبلوماسی بەرەڤ وەلاتێ فرەنسا چوو، پشتی هینگێ وەك بالیوزێ ئەمریکا ل فرەنسا هاتە هەلبژارتن ل شوینا بالیوزێ بەرێ کو ئەوژی سیاسەتمەدارو زانایێ ئەمریکی "بنیامین فرانکلین" بوو. جیفەرسۆن بۆ ماوێ پێنج سالاْن ما ل فرەنسا، لێ دڤی ماوەیی دا پتریا دەستورێ ئەمریکی هاتە نڤێسین و پەسەندکرن بێی کو جیفەرسون پشکداریێ تێدا بکەت.

ل سالا 1789 دوبارە زڤری وەلاتێ ئەمریکا و وەك ئێکەم وەزیرێ دەرڤە یێ ئەمریکا هاتە هەلبژارتن، لێ هەر زوی ناکوکی کەفتە دناڤبەرا وی و وی وەزیری دارایی "ئەلیکساندەر هاملتون"ی دا ژبەرکو هەر ئێکی ژ وان هندەك بوچوونێن سیاسی یێن هەڤجودا هەبوون، هاملتونی دگەل پشتەڤانێن خۆ پارتەك ب ناڤێ "پارتا ئێکەتی" دامەزراند و جیفەرسۆنی ژی دگەل پشتەڤانێن خۆ پارتەك ب ناڤێ "پارتا دیموکراتی" دامەزراند.

ل سالا 1796 جیفەرسۆنی خۆ کاندید کر ژبۆ سەروکاتیێ لێ ڕێزبەندا وی یا دووێ هات پشتی یا "جۆن ئادەم"ی لەورا لدویڤ دەستوری، جیفەرسون بوو جێگرێ سەروکێ ویلایەتێن ئێکگرتی یێن ئەمریکا و پاشی ل سالا 1800 دوبارە خۆ کاندید کر و ئەڤ جارە شیا پتریا دەنگان بدەستخۆڤە بینیت و ببیتە سەروك.

پشتی وەك سەروك دەستبکاربووی، هەر زوی فەلسەفەیا وی د حوکمڕانیێ دا دیاربوو، ژبەرکو ئەو کەسەکێ دادپەروەر و ئاشتیخواز بوو لەورا دگەل هەڤرکێن خۆ پێکهات و ناکوکی نەهێلان، لێ مەزنترین کارێ جیفەرسونی د ماوێ سەروکاتیێ دا ئەنجامدای، گرێبەستا "لویزیانا"[1] یا ناڤدار بوو کو بوو ئەگەر ڕۆبەرێ وەلاتێ ئەمریکا دوو جارا پتر لێ بهێت و ببیتە خودان هێزەکا مەزن.

هەرچەندە یا ڕوهن و ئاشکەرا نینە کا جیفەرسۆن خودانێ ڤێ بیروکێ بوو یانژی ناپولیون بۆناپەرت ژبەرکو ناپولیونی بریاردابوو ڤی عەردێ ئەمریکی ئەوژێ ژلایێ فرەنساڤە هاتیە داگیرکرن بفروشیت و ل وی دەمی بالیوزێ ئەمریکا ل وەلاتێ فرەنسا

---

(1) گرێبەستا لویزیانا Louisiana Purchase دناڤبەرا ویلایەتێن ئێکگرتی یێن ئەمریکا و فرەنسا ل سالا 1803 هاتە ئیمزاکرن ژبۆ کرینا عەردێ لویزیانا یێ فرەنسی کو روبەرێ وی نێزیکی 2 ملیون کیلومەترێن دووجابوو ب بهایێ 60 ملیون فرەنکێن فرەنسی و پێهێلانا 18 ملیون فرەنکێن دی ژلایێ ئەمریکاڤە. د سەردەمێ ئەڤروکە دا ئەڤ عەردە 15 ویلایەتێن ئەمریکی پێکدئینیت.

جیفەرسۆن ڕازیکر ڤی عەردی بکریت، د هەماندا دەمێ جیفەرسۆن بەحسێ دەستکەفتێن خۆ بۆ وەلاتێ ئەمریکا دکەت ب چ ڕەنگان بەحسێ ڤێ گرێبەستێ نەکربوو.

ل سالا 1804 ژی وی خۆ کاندید کر بۆ سەروکاتییێ و دووبارە هاتە هەلبژارتن لێ ل سالا 1808 وی ماف نەبوو بۆ جارا سییێ خۆ کاندید بکەت لەوڕا ل سالا 1809 وی دەست ژ سەروکاتییێ بەردا هەروەکی کا چەوا بەری هینگێ جۆرج واشنتونی ب تنێ بۆ دوو خولان خو کاندید کربوو و یێ ئامادە نەبوو بۆ جارا سییێ خۆ کاندید بکەت.

پشتی هینگێ جیفەرسۆنی زانکۆیا ڤیرجینیا ل سالا 1819 دامەزراند، ل ڕێکەفتی 4 تیرمەها 1826 پشتی 83 سالێن دوور و درێژ ژ کارێ سیاسی وەغەکر کو ڕۆژا وەغەرکرنا وی یا ڕێکەفت بوو دگەل سالڕۆژا پێنچی سالیا سەربەخۆبوونا ئەمریکا.

ژبلی کارێ سیاسی، جیفەرسۆنی گەلەك بەهرەیێن دیژی هەبوون، وی شیانێن ئاخفتنێ ب شەش زمانان هەبوون، هەردیسان گەلەك گرنگی ددا گیانەوەر و شینکاتی و زانستێ ماتماتیکێ، دهەمان دەمدا دەستەکێ زێرین هەبوو دکارێن دەستی یێن هونەری دا و دهەمان دەمدا ئەندازیارەکێ بیناسازی یێ چەلەنگ بوو.

ژبەرکو جیفەرسونی گەلەك بەهرە و شیان هەبوون لەوڕا دیروکنڤیس ژی ڕۆلێ وێ ب مەزنی د نرخینن، لێ گومان تێدا نینە کو ڕۆلێ وی یێ سەرەکی بۆ نڤێسینا بەلگەناما ڕاگەهاندنا سەربەخۆبوونێ دزڤڕیت، دڤێت ئەم بزانینن کو ئەڤ بەلگەنامە نەك پشکەك بوو ژ دەستورێ ئەمریکا بەلکو بەلگە بوو ل سەر فەلسەفەیا ڤی کەسایەتی و گیانێ وی یێ لێبورینێ.

هەرچەندە گەلەك ئەو هزرێن دڤێ ڕاگەهاندنێ دا هاتین بەری هینگێ فەیلەسوفێ ئینگلیزی جۆن لۆکی ئاماژە پێکربوو، لێ مەرەما وی ژ ڤێ چەندێ ئەونەبوو فەلسەفەیەکا نوو ب ڕاگەهینیت بەلکو وی دڤیا وان هزروبیران دووپات بکەت یێن گەلێ ئەمریکا باوەری پێ هەی، ئەو شێوازێ دەربرینێ یێ جوان و هویربین یێ جیفەرسۆنی ب کارئیناى بۆ نڤێسینا ڤێ بەلگەنامێ پالدەرێ هەرە مەزن بوو کو ئەمریکا سەربەخۆبوونێ ب ڕاگەهینیت.

ئەو شۆڕەش و شەڕێن بەری هینگێ هاتینە ئەنجامدان ژبۆ ئازادکرنا عەردێ ئەمریکا یێ هاتیە داگیرکرن ژلایێ هێزێن ئینگلیزیڤە، مەترسیەکا مەزن ل سەر ئەمریکا

ب خۆژی هەبوو چونکی ئینگلیزان ب هەمی ڕەنگان دژایەتیا وان دکر، لێ ئەمریکا بریاردا بگەهتە ڕێکەفتنەکا ناڤنجی دگەل بریتانیا و پاشی جیفەرسۆن هاتە هنارتن داکو دانوستاندنێ دگەل ئینگلیزان بکەت. ئەندامێن کونگرێسی هەمی پێکڤە ل سەر پرۆژێ سەربەخۆبوونێ ڕازیبوون، پاشی وان گەنگەشە ل سەر وێ ڕاگەهاندنێ کر یا جیفەرسۆنی نڤیسای و هندەك گوهۆرین تێداکرن و ل ڕێکەفتی 4 تیرمەها 1776 ئەڤ چەندە ڕاگەهاند.

ئەگەرێ سەرەکی یێ دانانا جیفەرسۆنی ل ڤی ڕێزیەندێ نە ژبەر پەرتووکێن وی یان نڤیسیا دەقێ بەلگەناما ڕاگەهاندنا سەربەخۆبوونێ بوو، بەلکو ژبەر کاریگەریا هزروبیرێن وی بوو ل سەر کەسێن پشتی وی، هەرچەندە وی ئەڤ هزروبیرە ژ فەیلەسوفێن ئەوروپی وەك ڤۆلتێر و لۆکی وەرگرتبوون، لێ ڕەفتارێن کەسایەتی یێن جیفەرسۆنی کاریگەریا درێژخایەن هەبوو. ڕەوشا وی یا سیاسی و شیانێن وی ل دەمێ حوکمڕانییێ بوونە ئەگەر ئەم ناڤێ وی پشتی سەروکێ ئەمریکا جۆرج واشنتونی د ڤێ لیستێ دا ب دانین.

## 65. شاهژن ئیزابێلا یا ئێکێ Queen Isabella I

## (1451ز. - 1504ز.)

### شاهژن ئیزابێلا یا ئێکێ

### ئەو شاهژنا شیای وەلاتێ ئیسپانیا یێ پارچەبووی بکەتە ئێك

شاهژن ئیزابێلا یا ئێکی ئەو شاهژن بوو یاکو هاریکاریا گەرۆکڤانێ جیهانی کریستۆفەر کۆلومبوسی ژلایێ ماددیڤە کری هەتا شیای کێشوەرێ ئەمریکا ئاشکەرا بکەت. ئەڤ شاهژنە خۆدان کەسایەتیەکا ب هێز و کاریگەر بوو و شیا هندەك بریارێن گەلەك گرنگ و چارەنڤیس بدەت کو بۆ ماوێ چەندین چەرخان کاریگەری ل سەر وەلاتێ ئیسپانیا و ئەمریکا لاتینی هەبوو و هەتا سەردەمێ ئەڤروکەژی کاریگەریا وی ل سەر ملیونەها مرۆڤان یا بەردەوامە.

هەرچەندە پتریا ئەو بریارێن ڤێ شاهژنێ ددایین ب هاریکاریا هەڤژینێ وێ "فرناندو"ی بوون لەورا پێدڤی بوو مە ناڤێ وان هەردوو پێکڤە دناڤ ڤێ لیستێ دا دانا، لێ مە جهێ ئیزابێلایێ بلندتر دانایە ژبەرکو ئەو هەمی گاڤان خۆدان بیروکە و هزرێن جوان بوو لێ هەڤژینێ وێ هاریکاریا وێ ژبۆ شرۆڤەکرنا ڤان بیرۆکەیان و بجهئینانا وان دکر.

ئیزابێلا ل سالا 1451 ل باژێرێ "مادریگال" ل شاهنشینا کاستیلا ژدایکبوویە. لدەستپێکێ چوویە بەر خواندانێن ئاینی یێن توندڕەو هەتا بوویە کەسەکا کاسولیکی و گەلەك ب ئاینی ڤە هاتیە گرێدان، برایێ وێ هێنری یێ چوارێ ژ سالا 1454 ببوو فەرمانڕەوایێ کاستیلا هەتا مرنا وی ل سالا 1974. ل وی سەردەمی ئیسپانیا شانشینەکا ئێکگرتی نەبوو بەلکو ل سەر هژمرەکا شانشینێن بچووك هاتبوو دابەشکرن، کاستیلا مەزنترین شانشینا ئیسپانیا یا وی سەردەمی بوو، شانشینا "ئاگون" دکەڤتە باکورێ ڕۆژهەلات و شانشینا "گرناتە" دکەڤتە باشوری و شانشینا "ناڤارا" دکەڤتە باکوری.

ل سالا 1460 ئیزابێلا شاهژنا چاڤەڕێکری یا شانشینا کاستلێ بیت کو ل ویسەردەمی زەنگینترین شاهژن بوو ل ئەوروپا هەمیێ، ژبەر هندێ ژی گەلەك ژ سەرکردە

و دەستهەلاتدارێن ئەوروپی داخازا هەڤژینیێ ژێ دکر، هەرچەندە برایێ وێ هێنری یێ چوارێ دڤیا وێ بدەتە شاهێ پورتوگالێ لێ وێ ئەڤ چەندە ڕەتکر و ڕەڤی و ژ کەربێن برایێ خۆ دا شوی ب فێرناندی کر.

دەمێ برایێ وێ وەغەرکری، ئیزابێلایێ داخازکر ببیتە شاهژنا شانشینا کاستیلایێ لەوڕا چەندین شەڕێن ناڤخۆیی ئەنجامدان و هێزێن وێ شیان سەرکەفتنێ بدەستڤە بینن، پشتی هینگێ شاهێ شانشینا ئاڕاگوانێ "خوانێ دووێ" وەغەرکر لەوڕا هەڤژینێ وێ فێرناندو بوو شاهێ شانشنیا ئاڕاگونێ و بڤێ چەندێ ئەو و هەڤژینێ وێ شیان بۆ ماوێ پتر ژ 25 سالاًن دەستهەلاتێ ل پتریا عەردێ ئیسپانیا بکەن.

ئەڤ هەردوو شانشینە ژلایێ کارگێری و سیاسیڤە د ژێکجودابوون. هەرچەندە وان گەلەك بزاڤ دکرن ئیسپانیا هەمیێ بکەنە ئێك و گەلەگ کار پێکڤە ئەنجامددان وەك شەڕێ وان یێ هەڤپشك دژی شانشینا گرناتە کو هەتا هینگێ د دەستێ موسلماناندا بوو, ڤی شەڕێ هەڤپشك ل سالا 1841 دەستپێکر هەتا سالا 1892 ب سەرکەفتنا ئیزابێلا و فێرناندوی بدوماهی هات و شیا پتریا عەردێ وەلاتێ ئەڤروکە یێ دبێژنێ ئیسپانیا داگیربکەن. لێ ب تنێ شانشینا ناڤارا مابوو کو پشتی مرنا ئیزابێلایێ هەڤژینێ وێ فێرناندو شیا ل سالا 1512 داگیربکەت.

ئێکەم کارێ ئیزابێلا و هەڤژینێ وێ کری پشتی گرتنا دەستهەلاتێ، دامەزراندنا "دادگەهێن پشکنینێ" بوون. ڤان دادکەهان دڕندەترین کار د دیروکێ دا ئەنجامددان کو بێی دادگەهکرن یان هەبوونا بەلگەیان خەلك دکوشت، ئەگەر وان تا ڕادەیەکێ بچووك ژی ژلایێ ئاینیڤە گومان ژ کەسەکی ببرایە دا دادگەهـ ئێکسەر وی تاوانبار کەت و حوکمێ سێدارەدانێ یان سووتنێ یان نقوومکرنا د ئاڤێ دا بۆ دەرێخیت، ژبەر ڤێ چەندێ ب هزارەها خەلکێ بێگونەهـ هاتنە کوشتن.

ئیزابیلایێ ب ڕێڤەبرنا ڤان دادگەهان کربوو د دەستێ قەشەیێ ناڤدار "تۆماس تورکومیدا"ی دا و مەرەم ژ ڤان دادگەهان ئەوبوو خەلك ژلایێ سیاسی و ئاینی ڤە خزمەتا شاهـ و شاهژنێ بکەن. لەوڕا هەر کەسەکێ خۆ نەڕازیکربا یان بوچوونەکا ئاینی یان سیاسی یا هەڤدژ هەبایە هەر ئێکسەر ب خائین دا هێتە تاوانبارکر و کوشتن.

مەرەما ئاشكەرا یا ڤان دادگەهان ئەوبوو كونترۆلێ ل سەر موسلمان و جوهیان ل ئیسپانیا بكەن، هەرچەندە وان خەلك نەچار دكر ب زۆری بهێنە سەر ئاینێ مەسیحیەتێ لێ ب شێوەیەكێ نهێنی ڤە هەر ل سەر ئاینێ خۆ مابوون ورێورەسمێن خۆ دگێران.

ل سالا 1492 بریاردەك هاتەدان كو دڤێت هەمی جوهی ببنە مەسیحی یان ژی د ماوێ چوار هەیڤاندا دڤێت وەلاتێ ئیسپانیا بجهـ بهێلن و مالومڵكێ خۆژی لپاش خۆ بهێلن و دگەل خۆ نەبەن، ژبەر هندێ نێزیكی 100 هزار جوهیان ئیسپانیا بجهێلا و گەلەك ژ وان ب رێكێڤە مرین دەمێ دچووینە وەلاتێن دی، لێ دەمێ ئیزابێلا و هەڤژینێ وێ شانشینا گرناتە داگیركری، ئازادی دا موسلمان ل سەر ئاینێ خۆ بمینن و رێورەسمێن خۆ یێن ئاینی بگێرن لێ هەر زوی ژ ڤێ بریارا خۆ لێڤەبوون و ئەوژی نەچاركرن یان دڤێت ببنە مەسیحی یان وەلاتی دەركەڤن.

ئێك ژ گرنگترین بریارێن ئیزابێلا د ماوێ دەستهەلاتا خۆدا دای ئەوبوو دەمێ ل سالا 1492 هاریكاریا گەرۆكڤانێ جیهانی كریستۆفەر كۆلومبوسی كری بچیت كێشوەرێ ئەمریكا ئاشكەرا بكەت.

ئیزابێلا ل سالا 1504 وەغەركر كو كورەك و چوار كچ هەبوون. كورێ وێ "خوان" ل سالا 1497 مر. كچا وێ یا مەزن ژی "خوانا" ل سەر داخازا دەیكوبابێن خۆ شوی "فیلیپێ ئێكێ" كورێ ئیمپراتۆرێ نەمسا كر. ژبەر ڤێ هەڤژینیێ نەڤیێ ئیزابێلایێ "كارلوسێ پێنجێ" بوو زەنگینترین و زیرەكترین شاهێ ئەوروپا هەمیێ لوی سەردەمی ژبەركو شیا دەستهەلاتێ ل وەلاتێن ئیسپانیا و ئەڵمانیا و هۆلەندا و بەلجیكا و نەمسا و سویسرا و گەلەك دەڤەرێن ئیتالیا و فرەنسا و چیكوسلوڤاكیا و پۆلەندا و مەجەر و یوگیوسلاڤیا بكەت. كارلوسێ پێنجێ هەمی مالومڵكێ ژ كێشوەرێ ئەمریكا دهاتن ژبۆ دژایەتیكرنا پرۆتستانتان د مەزاخت.

ژبەر ڤێ چەندێ ئەم دشێن بێژین هەڤژینیا ئیزابێلایێ دگەل فێرناندوی كاریگەریەكا مەزن ددیروكا ئەوروپا بۆ ماوێ چەندین چەرخێن پشتی مرنا وان ژی هەبوو. ژبەركو ئەو شیان وەلاتێ ئیسپانیا بكەنە ئێك و سنورێن وێ دەستنیشان بكەن كو هەتا نوكەژی سنورێن عەردێ وەلاتێ ئیسپانیا هەر ئەون یێن ڤان هەردوو كەسان دانایین.

ژلایەکێ دیڤە ئەو ڕابوون ب دانانا دادگەهێن پشکنینێ ژبۆ موکمکرنا ڕێبازا کاسولیکی ل ئیسپانیا و بێدەنگکرنا دەنگێن نەڕازیبوون و ئازادیێ، ژبەر ڤێ چەندێ ژی وەلاتێ ئیسپانیا پیچەکێ دڕەنگتر ژ وەلاتێن دی یێن ئەوروپی گەهشتە شۆڕەشێن هزری و زانستی و پێشکەفتنێ.

دیسان گەریانا کۆلومبوسی و ئاشکەراکرنا کێشوەرێ ئەمریکا بوو ئەگەر ئیسپانیا بچیت ڤی کێشوەری داگیربکەت و خێروبێرێن وێ بۆ خۆ بینیت و شارستانیا خۆ ل وێرێ بەلاڤ بکەت کو بوو ئەگەر ب ملیونەها کەس بکەڤنە ژێر کاریگەریا ڤی وەلاتی و ئەڤ چەندەژی ژ ئەنجامێ وێ هاریکاری و پشتەڤانیێ هات یا ئیزابێلایێ بۆ کۆلومبوسی کری.

## 66. جوزێف ستالین Joseph Stalin

## (1879ز-1953ز)

### جوزێف ستالین

### مەزنترین دیکتاتور د دیروکا مرۆڤایەتیێ دا

ستالین دهێته هەژمارتن ئێك ژ سەرکێشێن دیکتاتور ل ئێکەتیا سوڤیەتا بەرێ، ناڤێ وی یێ دروست جوزێف ڤیساریونوڤیچ گوگاشفیلی یە، ل سالا 1879 ل باژێرێ "گوری" ل ویلایەتا جۆرجیا ل قەوقازێ ژدایکبوویە، زمانێ وی دەیکێ زمانێ جۆرجی بوو کو ب تەمامی ژ زمانێ ڕۆسی یێ جودا بوو کو پشتی هینگێ خۆ فێرکربوویێ.

ستالین ژ خێزانەکا گەلەك هەژاربوو و بابێ وی بەردەم مەی ڤەدخار هەتا سەرخوش دبوو د کەفتە عەردی، و گەلەك جاران کورێ خۆ ستالین د قووتا هەتا ڕۆژەکێ ب گرانی قوتای کو بوو چەندین ڕۆژا خوین دگەل میزا وی دەردکەفت. دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 11 سالێیێ بابێ وی مر لەوڕا ستالینی دەست ب خواندنێ ل ئێك قوتابخانەیێن سەر ب دێرێ ڤە کر و دەمێ مەزن بووی بەردەوامی دا خواندنا خۆ یا ئاینی ل باژێرێ "تەفلیس"، لێ ژبەرکو بوچوونێن نەڕەوا و وێرانکەر دناڤ قوتابیاندا بەلاڤدکرن لەوڕا هەر زوی ل سالا 1899 هاتە دەرخستن ژ قوتابخانێ.

ل دویڤدا پەیوەندی ب بزاڤەکا شیوعی یا نهێنی کر و دەمێ ئەڤ بزاڤە تێکچووی، ستالین چوو دگەل ئالیێ "بولشفیك" و تێدا بوو ئەندامەکێ کارا هەتا سالا 1917 کو شەش جاران ژلایێ پولیسانڤە هاتبوو گرتن. لێ ماوێن زیندانکرنا وی د کورتبوون و سزایێن سڤك ل سەر دهاتە سەپاندن، هەردیسان گەلەك جاران شیا ژ زیندانێ بڕەڤیت ڕەنگە گوما تێدا هەیە کو ئەو هەڤالێ پولیسان بوو، لێ د ڤی ماوەی دا وی ناڤێ "ستالین"[1] بۆ خۆ هەلبژارت.

---

[1] پەیڤا ستالین د زمانێ رۆسی دا ب ڕامانا زەلامێ ئاسنی یێ دلڕەق دهێت.

هەرچەندە ستالینی ڕۆلەکێ گەلەك مەزن د شۆڕەشا شیوعی یا ڕۆسی ل سالا 1917 نەگێرا لێ ل دوو سالێن پشتی هینگێ چالاکیێن گەلەك مەزن ئەنجامدان و ل سالا 1922 بوو سکرتێرێ گشتی یێ پارتا شیوعی و ئەڤ چەندە بوو ئەگەر ئەو ڕۆلەکێ مەزن د ڕێکخستنا ڤێ پارتێ دا بگێریت و سەرکەفتنێن مەزن د ژیانا خۆ یا سیاسی دا تومار بکەت ب تایبەت ئەو ئاڕیشەیێن پشتی مرنا لینینی کەفتینە د ڕێکا ویدا.

یا خویابوو کو لینینی دڤیا پشتی وی "لیون تروتسکی" بهێتە جهێ وی ژبەرکو وی هزردکر ستالین کەسەکێ گەلەك دلڕەق و زۆردارە، لەوڕا وی بزاڤ دکرن ستالینی ژ پۆستێ وی لادەت لێ پشتی مرنا لینینی ل سالا 1924 ستالینی جهێ وی گرت و وەسیەتناما لینینی بجهـ نەئینا، پشتی هینگێ ستالینی دوو کەسێن دی یێن مەترسیدار ژی ل پارتا خۆ زێدەکرن ئەوژی "کامینوف" و "زیتوفیف" بوون و هوسا بەرەیەکێ سێ کەسی پێکئینا و شیان ب سانەهی خۆ ژ ترۆتسکی خولاس بکەن.

ل دووڤدا ستالینی خۆ ژ ڤان هەردوو کەسان ژی خولاسکرن و وی ب تنێ دەستهەلات ب ڕێڤەبر، ژ سالا 1930 وێڤە ستالین بوو دەستهەلاتدارێ ئێکانە ل ئێکەتیا سوڤیەتا بەرێ.

پاشی ستالینی دەست ب ڤاڤارتنەکا خویناوی کر و لدەستپێکا کارێن خۆ ڕابوو ب کوشتنا ئێك ژ شیرەتکارێن خۆ یێن نێزیك بناڤێ "سرچی کیروف" ل سالا 1934، ل دویڤدا ستالینی گونەها غیانەتێ دا پالێ هەمی سەرکردێن شۆڕەشا شیوعی ل سەردەمێ لینینی و ئەو نەچارکرن دانپێدانێ ب ڤێ تاوانێ بکەن و هێدی هێدی خۆ ژ هەمیا قورتال کر هەروەکی کا چەوا سەروکێ ئەمریکی جیفرسونی هەمی ئەو کەسێن پەیمانا ڕزگاربوونێ دگەل ئیمزاکری گونەهبارکرن و پاشی پێکڤە سێدارەدان.

ل سالا 1938 ستالینی ئەو کەسێ بەرپرس ژ کوشتنا ڤان سەرکردان ژی کوشت پشتی کو نەچارکری دانپێدانێ بڤان تاوانێن خۆ بکەت. ئەڤ ڤاڤارتنا خویناوی ژ سەرکردێن پارتا شیوعی بەرەڤ هێزێن چەکداری چوو و ستالینی هژمارەکا مەزن ژ دویفکەفتیێن ڤێ پارتێ کوشتن کو هژمارا وان دوو جارا پتر بوو ژ یێن قەیسەری کوشتین. تشتێ جهێ کەنیێ ئەوبوو د ماوێ ڤان کوشتناندا ستالینی دەستورەکێ دیموکراتی بۆ ئێکەتیا سوڤیەتا بەرێ دانا.

ل سەردەمێ ستالینی، سیستەمێ کارکرنا تیرروێ ب کۆمەل ل سەر خەلکی هاتە سەپاندن، هەردیسان ل سالا 1930 و وێڤە ب بریارەکا ستالینی نێزیکی سێ ملیون جوتیاران د زینداناڤە ژبەر برسێ گیانێ خۆ ژدەستدا لەورا ئێدێ ئاستێ بەرهەم ئینانا کشتۆکالی ل ڕۆسیا هەمییێ گەلەك هاتە خوارێ.

هەر ل سەردەمێ ستالینی سیاسەتا پیشەسازی یا گشتگر ل ڕۆسیا هاتە بجهئینان، ئەڤ سیاسەتە ب گەلەك شێواز و ڕەنگان هاتە ئەنجامدان و ناڤێ وێ کرە پیلانا پێنج سالێیا ئێکێ و دووێ و سییێ و پشتی هینگێ گەلەك وەلاتێن بیانی ژی ئەڤ پلانە بجهئینا ب تایبەت پشتی وەلاتێ ڕۆسیا شیای سەرکەفتنێ د بوارێ پیشەسازییێ دا تۆماربکەت، سەرەرای وان زیانێن مەزن یێن تووشی ئێکەتیا سوڤیەتا بەرێ بووین ل شەرێ جیهانی یێ ئێکێ لێ شیا خۆ ل سەر پێن خۆ بگریت و ببیتە وەلاتێ دوێ ل سەر ئاستێ جیهانێ پشتی وەلاتێ ئەمریکا.

ل تەباخا سالا 1939 هێتلەری و ستالینی پەیمانەکا ئاشتییێ ئیمزاکر، پشتی بورینا دوو حەفتیان ل سەر ڤێ پەیمانێ هێتلەری شەرێ وەلاتێ پۆلەندا ژلاییێ ڕۆژئاڤای ڤە کر و پشتی هینگێ ب چەند حەفیتەکان ئێکەتیا سوڤیەتێ ژی بەرەڤ پۆلەندا چوون و ژلاییێ ڕۆژهەلاتیڤە داگیرکر, ل دوماهیا وێ سالێ ئێکەتیا سوڤیەتێ گەف ل هەر سێ وەلاتێن لاتیڤیا و لیزوانیا و ئەستونیا کرن و بێی شەرکرن ئەڤ وەلاتە داگیرکرن، لێ وەلاتێ فێنلەندا خۆ ب دەستڤە نەبەردا و بریاردا شەری بکەت.

مەرەما ستالینی ژ داگیرکرنا ڤان وەلاتان ئەوبوو دڤیا سنورەکی بۆ مەترسیا هێزێن نازی ب دانیت، پشتی ب دوماهی هاتنا شەرێ جیهانی یێ دووێ و ژناڤچوونا پارتا نازی ل ئەلمانیا، ئێدی نە ستالین و نە کەسێن ل دووڤدا نەشیان کونترۆلێ ل سەر مێترەکا عەردێ ڤان وەلاتان بکەن یێن داگیرکرین.

ل دوماهیا سالێن شەرێ جیهانی یێ دووێ ئێکەتیا سوڤیەتێ شیا پتریا وەلاتێن ئەورپا ڕۆژهەلاتی داگیربکەت و ستالینی ئەڤ چەندە بدەلیڤە دیت ڤان حکومەتێن شوعی یێن هەڤالێ ژبۆ ئێکەتیا سوڤیەتێ بدامەزرینیت، لوی دەمی حکومەتەکا مارکسی ل وەلاتێ یوگیوسلافیا دامەزراند لێ ژبەرکو ڤێ حکومەتا شیوعی چ پیتە ب وەلاتێ ڕۆسیا نەدکر وبریارێن وێ ب جە نەدئینان لەورا ستالین نەچاربوو ڕێکێ لهەمبەر وەلاتێن دی یێن

ئەوروپی بگریت داکو لدویڤ حکومەتا شیوعی یا یوگیوسلاڤیا نەچن و بۆ ڤێ چەندێ بزاڤێن مەزن و خویناوی ئەنجامدان.

پشتی بدوماهی هاتنا شەڕێ جیهانی یێ دووێ، ئێدی شەڕێ سارِ دناڤبەرا ڕۆسیا و ئەمریکادا دەستپێکر، هەرچەندە هندەك كەس دبێژن "ترۆمان" ئەگەرێ سەرکی یێ پەیدابوونا ڤی شەڕێ سارِبوو لێ د ڕاستی دا ستالینی ڕۆلەکێ گەلەك مەزنتر هەبوو ژبۆ پەیدابوونا ڤی شەڕی.

ل سالا 1953 حکومەتا سوڤیەتێ ڕاگەهاند وان هندەك نوژدار یێن گرتین ژبەرکو وان بزاڤ کربوون هندەك سەرکردەیێن سوڤیەتێ بکوژن و بڤێ چەندێ بۆ جیهانێ خرێ دیاربوو کو ستالینی دڤێت هندەك ڤاڤارتنێن نوو بکەت و تومەتان بۆ هندەك کەسان دروست بکەت داکو ژناڤ ببەت.

ل 5 ئادارا 1953 ستالینی دژیێ 73 سالێیێ دا ل موسکو وەغەرکر، گورێ وی ب ڕەخ گورێ لینینی ل گورستانا مەیدانا سۆر ل موسکو هاتەدانان.

ستالینی ژیانەکا خێزانی یا سەرکەفتی بوراند، ل سالا 1904 ژیانا هەڤژینیێ پێکئینابوو لێ پشتی سێ سالان هەڤژینا وی ژبەر نەخۆشیا سلێ وەغەرکر و کورەك ب تنێ هەبوو ب ناڤێ "جاکوب" کو ل شەڕێ جیهانی یێ دووێ ژلایێ ئەلمانیاڤە هاتبوو ئێخسیرکرن و پشتی هینگێ حکومەتا ئەلمانی ڕاگەهاند ئەو بەرهەڤن جاکوبی بەرامبەر هژمارەکا ئێخسیرین ئەلمانی ئازاد بکەن لێ ستالینی ئەڤ داخازە ڕەتکر لەوڕا جاکوب ل زیندانەکا وەلاتێ ئەلمانیا ڤە مر.

ستالینی دووبارە ل سالا 1919 ژیانا هەڤژینیێ پێکئیناڤە و کچەك و کورەك ژێ هەبوون، کورێ وی بۆ سەرکردەیەکێ لەشکەری یێ فرۆکەڤانی ل ئێکەتیا سوڤیەتا بەرێ هەتا ل سالا 1962 ژبەر هوگریا وی یا زێدە ژبۆ ماددێن بێهوشکەر گیانێ خۆ ژدەستدا، کچا وی "سفلتانا" ژی ل سالا 1967 ڕەڤی چوو ئەمریکا، ل سالا 1932 هەڤژینا وی یا دووێ ژی وەغەرکر، هندەك ژێدەر دیارکەن کو وی هەڤژینا خۆ یا دووێ کوشت بیت

ستالین کەسەکێ دلڕەق بوو و دلوڤانی ب کەسێ نەدبر و گومان ژ هەمی کەسان دبرن، د هەمان دەمدا کەسەکێ چالاك و هزرمەند بوو بیرتیژیەکا زێدە هەبوو. ستالینی بۆ ماوێ چارێك سەدەی دەستهەلاتداریێ ئێکانەیێ ئێکەتیا سوڤیەتا بەرێ بوو و کاریگەری ل

سەر ژیانا ملیونەها مرۆڤان کربوو لەورا دهێتە نیاسین ب مەزنترین دیکتاتور دیروکێ دا ژبەرکو ئەو بوو ئەگەرێ کوشتنا نێزیکێ 20 ملیون مرۆڤان.

هەرچەندە پشتی مرنا ستالینی ئێدی پیچەکێ زۆداریا سیاسی ل ڕۆسیا بەرەڤ کێمبوونێ چوو، لێ یا پشت ئەوبوو کو ئازادیا تاکەکەسی و دیموکراتی د دەستورێ ئێکەتیا سوڤیەتا بەرێ دا نەبوو و چ شینوارێن ڕێزگرتنا مرۆڤی د ژیانا وان یا جڤاکی دا دیار نینن.

ستالینی بەردەوام بانگەشا هندێ بۆ خۆ دکر کو ئەو ئێکەم کەس بوو شۆڕەشا پیشەسازی ل ڕۆسیا ڕاگەهاندی لێ ئەڤ چەندە بانگەشەیەکا درەوبوو ژبەرکو بەری وی شۆڕەشا پیشەسازی ل ڕۆسیا دەستپێکربوو و ئەگەر خۆ ستالین نەهاتبایە ژی ئەڤ شۆڕەشە هەر دا دەستپێکەت.

## 67. يوليوس قەيسەر Julius Caesar

## (100ب.ز-44ب.ز)

### يوليوس قەيسەر

### ئەو سەركردێ بوويە ئەگەر چەندين چەرخان ئيمپراتۆريا ڕۆمانى د ئێمناهيێ دا بژيت

سەركردێ لەشكەرى و سەركێشى سياسى يێ ڕۆمانى يولويس قەيسەر ل سالا 100 بەرى زاينى ل باژێرێ ڕۆما ژدايكبوويە كو لوى سەردەمى هەڤڕكيێن سياسى و جڤاكى د ئاستەكێ هەرە خراب و نەباشدا بوون.

ل چەرخێ دووێ بەرى زاينى و پشتى سەركەفتنێن ڕۆمانيان د شەڕێن خۆدا دگەل قرتاجە توماركريت ئێدێ ئيمپراتۆريا ڕۆمانى بۆ خۆدانا عەردەكێ بەرفرەهـ و ژ ئەنجامێ ڤێ بەرفرەهبوونا باژێرێ ڕۆما گەلەك زەنگين بوو و دهەمى بوارەندا پێشكەفت.

لێ ژلايەكێ ديڤە ئەڤ شەڕە بوونە ئەگەرێ ژناڤبرنا جڤاكى و ورەيا خەلكێ هاتە خوارێ و كەسێن زەنگين گەلەك ژ ماڵوملكێ خۆ ژدەستدا، هەرديسان ژبەر بەرفرەهبوونا عەردێ ئيمپراتۆريا ڕۆمانى ئێدى جڤاتا پيران ژى ئەوا دەستهەلات د دەستاندا نەشيا كونترۆلێ ل سەر هەمى دەڤەران بكەت، ئەو وەلاتێن دكەفتينە سەر دەريا سپى يا ناڤەڕاست تووشى گەندەلى و لاوازيێ بوون.

هەرديسان ڕۆما ب خۆژى پشتى سالا 133 بەرى زاينى كەفتە بەر پێلێن دژوار و چەندين سەركردەيێن سياسى بزاڤ دكر خۆ بگەهينە دەستهەلاتێ لەوڕا ئێدى لەشكەر ژى هەمى بەرەڤ ڕۆما چوو و ل دەڤەرێن دى نەما و ئەڤ چەندە بەلگەبوون ل سەر هندێ كو ڕۆما پێتڤى ب سيستەمەكێ نوو يێ دەستهەلاتيێ يە.

يوليوس قەيسەر ڕەنگە ئێكەم كەسايەتيێ سياسى يێ مەزن بيت دياركرى كو سيستەمێ ديموكراتى ل ڕۆما ئێدى نەشێت خۆ لبەر ڤان كاودانێن دژوار و سەخت بگريت لەوڕا پێدڤيە گوهۆرين د ڤى سيستەمى دا بهێنەكرن ژ پێخەمەت قورتالكرنا ڕومێ ژناڤچوونێ.

ژبەرکو یولیوس قەیسەر ژ خێزانەکا دەولەمەند و ناڤداربوو لەوڕا هێشتا یێ زاروك چوو بەر خواندنێ و لبەر دەستێ باشترین ماموستایێن وی سەردەمی ڕابوو و گەلەك زانین و زانست بدەستڤەئینا، دەمێ بوویە گەنج چوو دناڤ جیهانا سیاسەتێ دا، ل سالا 58 بەری زاینی بوو حاکمێ سێ ویلایەتان ئەوژی باکورێ ئیتالیا و یوگیوسلافیا و باشورێ فرەنسا، ل وی سەردەمی نێزیکی 20 هزار سەربازان لبن فەرمانا ویڤە بوون.

دناڤبەر سالێن 54 هەتا 51 بەری زاینی شیا ب ڤێ هێزا لەشکەری هندەك دەڤەرێن دیژی بێختە لبن دەستهەلاتا خۆڤە ئەوژی تەمامەتیا وەلاتێ فرەنسا و بەلجیکا و سویسرا و ئەلمانیا و هۆلەندا بوون، هەرچەندە هێزێن وی گەلەك ژ هێزێن هوزین ڤان دەڤەران کێمتربوون لێ ئەو ب شیا ب زیرەکی و شارەزاییا خۆ و پیلانێن خۆ یێن سەرکەفتی دەستێ خۆ ب دانیتە سەر ڤان دەڤەران و بسانەهی داگیربکەت، پشتی هینگێ دوو هەوێن مەزن برنە سەر وەلاتێ بریتانیا یێ ئەڤروکە لێ ئەڤ هەوێن وی د سەرکەفتی نەبوون.

ڤان سەرکەفتنان یولیوس کرە قارەمانەکێ بناڤودەنگ ل ڕۆما، دەمێ هێزا وی یا لەشکەری لاواز بووی و کونترۆلا وی ل سەر کێمبووی، جڤاتا پیران ل ڕۆما داخازا ژێکر ئەو ب تنێ ب زڤریتە باژێرێ ڕۆما، یولیوس قەیسەری زانی کو ئەڤ چەندە پیلانەکە دوژمێن وی دژی وی گێرای لەوڕا بریارا ئەو ب خۆ سەرکێشیا لەشکەری خۆ بکەت و بچتە ڕۆما، ئەڤ چەندە بۆ ئەگەرێ پەیدابوونا شەرەکێ ناڤخۆیی دناڤبەر لەشکەرێ وی و هێزێن جڤاتا پیران و ئەڤ شەرە بۆ ماوێ پتر ژ چوار سالان ڤەکێشا و ل دوماهیێ شیا سەرکەفتنێ توماربکەت ل دەڤەرا "موندا"[1] ل ڕۆژا 7 ئادارا سالا 45 بەری زاینی.

ل دووڤدا یولیوس قەیسەری زانی ئەو نەشێت چارەسەریا ڤان کاودانان بکەت ئەگەر ئەو ب خۆ نەمینتە ل ڕۆما، لەوڕا ئێدی ما ل باژێری و وەك دەستهەلاتدارێ ئێکانە ل وەلاتی هاتە دەستنیشانکرن. ل سالا 44 بەری زاینی تانجەکا زێری بۆ هاتە پێشکێشکرن لێ وی ئەڤ چەندە ڕەتکر ژبەرکو وی هزرکر ئەڤ تانجە چ مفای و زیرەکیێ لوی پەیداناکەت بەلکو ب تنێ دێ دوژمنێن وی سیاسی زێدەتر لێکەت.

یولیوس قەیسەر 15 نیسانا سالا 44 زاینی ل ئاڤاهیێ جڤاتا پیرانڤە هاتە کوشتن ژبەرکو گەلەك دوژمن بۆ وی پەیدابوون وهەمیانژی بزاڤا کوشتنا وی دکر.

---

[1] ل سەردەمێ ئەڤروکە دەڤەرا "موندا" بوویە وەلاتێ ئیسپانیا.

ل سالێن دوماهیێ ژ ژیانا خۆ گەلەك چاكسازی ئەنجامدان، لدەستپێكی شەڕكەرێن كەڤن و خودان ئەزمون ئینانە دناڤ ڕێزێن لەشكەرێ خۆدا و گەلەك خانی و جهێن حەواندنێ بۆ خەلكێ هەژار و كێم دەرامەت ئاڤاكرن و موچە بۆ وان تەرخانكرن، هەردیسان ناسنامەیێن ڕۆمانی بۆ گەلەك كەسێن بیانی دەرێخست و پیلانەكا نوو ژبۆ پێشخستنا سیستەمێ ب ڕێڤەبرنا باژێرڤانییێن هەر دەڤەرەكا ئیتالی دانا. سەرەڕای ڤان چاكسازیێن مەزن گرنگ لێ نەشیا دەستورەكێ جێگیر بۆ ڕۆماییێ بدانیت و ئەڤ چەندە ئەگەرێ سەرەكی یێ كەفتن و كوشتنا وی بوو.

پشتی كوشتنا وی ئێدی گەلەك بریارێن وی هاتنەلادان و كەسێ بجە، نەدئینان، لێ تشتێ ئێكانە یێ پشتی وی مای و هەتا سەردەمێ ئەڤروكە ژی كار پێ دهێتەكرن ئەوژی دانانا سالنامێ بوو كو هەتا نوكەژی ب تنێ هندەك گوهۆرینێن بچووك ل سەر هاتینەكرن و دهێتە بجهئینان.

یولویوس قەیسەر دهێتە هەژمارتن ئێك ژ زیرەكترین و چاڤنەترسترین سەركردەیێن لەشكەری د دیروكێ دا ژبەركو كەسەكێ سیاسی یێ سەركەفتی و سەركردەیەكێ زیرەك و گوتاربێژەكێ كاریگەر و نڤیسەرەكێ دەستڕەنگین بوو. ئەو پەرتووكا وی ل سەر شەڕێن هوزێن "گال"ێ نڤیسای دهێتە هەژمارتن ئێك ژ شاكارێن ئەدەبی یێن هەرە باش، هندەك دیروكنڤێس دیاردكەن كو ئەڤ پەرتووكە پڕفرۆشترین پەرتووكا ئەدەبێ لاتینی یێ كەڤن بوو .

یولیوس قەیسەر كەسەكێ كەشخە و ڕێكوپێك بوو و لەشەكێ بهێز هەبوو، هەردیسان كەسەكێ ئەڤیندار ژی بوو و ناڤداترین چیرۆكا وی یا ئەڤینیێ دگەل "كلیوپاترا" یێ بوو

گەلەك كەسان ڕەخنە لێ دگرن ژبەركو دەستهەلات هەمی ئێخستبوو بن دەستێ خۆ و گەلەك ئاسنكاری بوو زەنگینان دكرن، هەردیسان د شەڕان دا ژی كەسەكێ دلڕەق بو چ ڕەوشتێن شەڕی بجە نەدئینان، هەردیسان گەلەك پرۆپاگندە و سەرژمێرییێن نەدروست ل دور دوژمنێن خۆ بەلاڤدكرن ب تایبەت ئەو زیانێن وی دگەهاندینە دوژمنێن خۆ گەلەك مەزنتر لێدكرن.

یولیوس قەیسەر گەلەك ژ کورمامێ خۆ ئوگوست قەیسەری کو دهێته هەژمارتن دانەرێ ئیمپراتۆریا ڕۆمانی ناڤدارتربوو، هەردیسان ئەو کاریگەریا یولیوس قەیسەری ل پشت  خۆ هێلای گەلەك کێمترە ژ وێ ناڤودەنگیا وی ددیروکێ دا بدەستخۆڤە ئینای، دبیت ئەڤ ناڤداریا وی ژبەر هندێ هاتبیت کو ل سەر دەستێ وی کومارا ڕۆمانی ژناڤچوو، لێ ب چ ڕەنگان ناڤداریا وی ب تنێ نەبوویە ئەگەر ئەم ناڤێ وی دگەل کەسێن کاریگەر د دیروکێ دا بدانینن.

مەزنترن سەرکەفتنا یولیوس قەیسەری ئەبوو دەمێ شەڕ دگەل هوزێن گالی کری و سەرکەفتی، هەردیسان ئەو وەلاتێن وی ئێخستینە بن دەستێ خۆ بۆ ماوێ پتر ژ پێنج چەرخان مانە لژێر دەستهەلاتداریا ڕۆمانیاڤە، د ڤی ماوەی دا خەلکێ ڤان وەلاتان ب ڕەوشت و تیتالێن ڕۆمانیا ئانکو لاتینیان داخباربوون ل دووڤدا ژی ب ئاینێ مەسیحیەتێ داخباربوون و بوونە مەسیحی، هەردیسان زمانێ فرەنسی ژی پتریا وی ژ زمانێ لاتینی یێ کەڤن هاتیە وەرگرتن.

سەرکەفتنا یولیوسی ل سەر هێزێن گالی بوو ئەگەر بۆ ماوێ چەندین چەرخان ئیتالیا دناڤ ئاشتی و ئێمناهیێ دا بژیت، هەردیسان بوو ئێك ژ ئەگەرێن سەرەکی کو ئیمپراتۆریا ڕۆمانی بمینتە ساخ، ژبەر ڤێ چەندێ یولیوس قەیسەر شیا جهێ خۆ دناڤ ڤێ لیستێ دا بکەت.

## 68. ویلیەمێ جیهانگێر William The Conqueror

## (1087-1027)

### ویلیەمێ جیهانگێر

### ئەو شاهێ کاریگەریەکا درێژخایەن ل سەر ئینگلیزان کری

ل سالا 1066، شاهەکێ نورماندی ب ناڤێ ویلیام دگەل لەشکەرەکێ پێکهاتی ژ چەند هزار سەربازان شیان ژ سنورێن وەلاتێ ئینگلتەرا دەربازبن و بچنە دناڤ ئاخا وی وەلاتی دا داگیربکەت و خۆ بکەتە دەستهەلاتدار، وی سەرکەفتن دڤێ بزاڤا خۆیا چاڤنەترسی دا ئینا و ئەڤە دوماهیك جار بوو د دیروکا وەلاتێ ئینگلتەرا دا کەسەکێ بیانی بشێت وەلاتێ وان داگیربکەت.

داگیرکرنا وەلاتێ ئینگلتەرا ژلایێ نورماندیانڤە ڕویدانەکا بێ وێنەبوو د دیروکا ڤی وەلاتی دا، ژبەرکو کاریگەریا وێ نە ب تنێ ژلایێ شەڕیڤە و هژمارا قوربانیانڤە بوو بەلکو کاریگەریەکا درێژخایەن ل سەر دیروکا ڤی وەلاتی کر کو هەتا نوکەژی شینوارێن وێ ددیارن.

ویلیەمێ جیهانگێر ل سالا 1027 ل باژێرێ "فالیس" یێ نورماندی ئەوێ دکەڤیتە باکورێ فرەنسا ژدایکبوویە، ویلیەم کورێ نەشەرعی یێ میری نورماندیا "رۆبەرتێ ئێکێ" بوو، ئەوێ ل سالا 1035 ل دەمێ ڤەگەریانا خۆ ژ باژێرێ قودسێ وەغەرکری، بابێ وی بەری ڤێ گەشتێ بکەت کورێ خۆ ویلیەم لجهێ خۆ دانابوو و کربوو جهگرێ خۆ، ژبەر ڤێ چەندێ هێشتا ژیێ وی ب تنێ هەشت سالێ بوون دەمێ بوویە میرێ نورماندیا.

پشتی مرنا بابێ وی، ویلیام دناڤ هندەك کاودانێن نەخۆش و دژواردا ژیا چونکی هێشتا دژیێ زاروکینیێ دا بابێ وی ئەو بجه هێلا و ئێخستە دناڤ هەڤڕکیا گەلەك کەسێن خانەدان و دەستهەلاتدار یێن دڤیا بهێنە سەر تەختێ حوکمڕانیێ، ژبەر ڤێ چەندێ گەلەك پیلان دژی وی هاتنەدانان و گەلەك کەس هاتنە کوشتن، لێ ب هاریکاریا شاهێ فرەنسا

"هێنری یی ئێکی" شیا ژ گەلەك پیلانێن ژبۆ کوشتنا وی هاتینەدانان قورتال بیت و بمینتە ساخ و حوکمڕانییێ ل نورماندیا بکەت.

ل سالا 1042 هێشتا کو ژییێ وی نەگەهشتبوو 20 سالییێ، ویلیەمی سەرکێشیا لەشکەری کر و هەر زوی شیا هەبوونا خۆ ب سەلمینیت و دژی وان کەسان ب ڕاوەستیت یێن پیلان ژبۆ کوشتنا وی داناین و دڤیان جهێ وی بگرن، پشتی بورینا ماوەیەکێ کێم شیا کونترۆلێ ل سەر وەلاتێ خۆ یێ بچووك بکەت و هەمی ئەو نەیارێن دهاتنە د ڕێکا ویدا ژناڤ ببەت. ژبەرکو ئەو نە کورەکێ شەرعی بوو، ڤێ چەندێ گەلەك ئاریشە و نەخۆشی ژبۆ وی پەیدادکرن لێ دگەل هندێ ژی ڤێ چەندێ کارتێکرن لوی نەکر پاشڤە بزڤریت بەلکو یێ بەردەوام بوو ل سەر تومارکرنا سەرکەفتنان.

ل سالا 1063 ویلیام شیا هندەك دەڤەرێن دەوروبەری وەلاتێ خۆ داگیربکەت و دەستێ خۆ بدانیتە سەر و ل سالا 1064 ب ناسناڤێ "سەروەرێ هەرێما دەوروبەری بڕیتانیا" هاتە ناڤکرن.

د ماوێ دناڤبەرا سالێن 1042 هەتا 1066 شاهـ ئێدواردێ دانپێدەر حوکمڕانی ل وەلاتێ ئینگلتەرا دکر، ژبەرکو ڤی شاهی چ زاروك نەبوون لەوڕا گەلەك کەسان بزاڤ دکر جهێ وی بگرن، ویلیام ژی ئێك بوو ژ وان کەسێن بوو یێن بزاڤا ڤێ چەندێ دکری ب بەهانەیا هندێ کو دەیکا ئێدوەردی خویشکا باپیری ویلیامی بوو، ڤێ چەندێ باوەری بو شاهـ ئێدوەردی دروستکر کو ویلیام ژ هەر کەسەکێ دی ژهەژیترە ببیتە جهگرێ وی.

ل سالا 1064 ئێك ژ لوردێن هەرە ب هێز و ناڤودەنگ یێن ئینگلیز ب ناڤێ "هارۆلد گودوین" بۆ ئێخسیر لبەردەستێ لەشکەرێ ویلیامی، لێ ویلیامی بریاردا وی ئازاد بکەت ب مەرجەکی ئەو هاریکاریا وی بکەت جهێ ئێدوەردی بگریت، هەرچەندە دڤان کاودانێن دژوار دا گودوینی چ ڕێك نەبون ژبلی کو سوزێ بدەتە ویلیامی، لێ پشتی ئازادکرنا وی هەر زوی ژ سوزا خۆ لێڤەبوو، هەر د وی دەمیدا شاهـ ئێدوەردی ژی وەغەرکر لەوڕا گودوینیی بریاردا ئەو ببیتە شاهێ ئینگلتەرا، جڤاتا کوچکا شاهی ل سەر ڤێ چەندێ ڕازیبوون و هارۆلد گودوین وەك شاهێ نوو یێ ئینگلتەرا هەلبژارت.

ئەڤ چەندە بوو ئەگەرێ تۆرەبوونا ویلیامی لەوڕا وی بریاردا ئەو شەڕی دژی ئینگلتەرا ب ڕاگەهینیت و داگیربکەت، ل تەباخا سالا 1066 وی پاپورێن خۆ یێن شەڕی ل

نێزیکی کنارێن دەریایی ل فرەنسا کومکرن داکو هێرشێ بکەنە سەر ولاتێ ئینگلتەرا، لێ هاتنا هرۆبایێن بهێز بوونە ئەگەر ئەو ژڤانێ شەڕی پاشبێخیت.

د هەمان دەمدا شاهێ نەرویج "هارۆلد هاردرید" ی هێرشەکا دی ژلایێ دەریایا باکوریڤە کرە سەر ئینگلتەرا. ل ڤی دەمی ل سەر شاهێ ئینگلتەرا یا پێدڤی بوو ئەو هێزێن خۆ بکەتە دوو بەش، بەشەك ژ وان بەرەڤ باشورێ ئینگلتەرا چوون داکو شەڕی دژی هێزێن نورماندیان بکەن و بەشەکێ دی بەرەڤ باکوری چوون داکو بەرسڤا هێرشێن لەشکەرێ نەرویجیان بدەن، ل ڕێکەفتی 20 ئیلونا هەمان سالێ شاهێ نەرویج هاتە کوشتن و هێزێن ویژی هاتنە دورپێچکرن.

پشتی هێنگێ هرۆبایێ دژوار نەما، لەورا شاهێ ئینگلتەرا بێی بێهنڤەدانەکێ بدەتە لەشکەرێ خۆ یێ واستیایی، بریاردا هەر ئێکسەر هەمی لەشکەرێ خۆ فرێکەتە باشوری داکو شەڕی دژی نورماندیان بکەن، لەشکەرێ ئینگلیز ب سەرکێشیا گودوینی و لەشکەرێ نورماندیان ب سەرکێشیا ویلیامی ل ڕێکەفتی 14 چریا ئێکێ یا سالا 1066 د شەڕێ ناڤدار "هاستینگ"دا کەفتنە بەر سینگێ ئێك، ل دوماهیا ڕۆژێ سیارچاکێن نورماندی شیان لەشکەرێ ئینگلیزی دورپێچ بکەن و شاهێ ئینگلتەرا یێ نوو و برایێ وی و گەلەك کەسایەتیێن دی یێن ناڤدار بکوژن تا وی ڕادەی ئێدی کەسێ ئەو مێرخاسی نەبوو بهێتە بەرامبەر نورماندیان و شەڕی بکەت. ل شەڤا سەرێ سالا 1067 ویلیامێ جیهانگێر بوو شاهێ ئینگلتەرا.

د ماوێ پێنج سالێن ل دووڤدا گەلەك پیلانێن جوداجودا ژبۆ کوشتنا ویلیامی هاتنە دارێژتن لێ ویلیام شیا هەمیان ژناڤ ببەت، هەر دڤان سالێن کێمدا ویلیام شیا خانەدان و لوردێن ئینگلیز ژ جهێ وان ڕاکەت و لوردێن فرەنسی بدانیتە جهێ وان، لێ ڤێ چەندێ کارتێکرن کرە سەر ڕەوشا جوتیاران ژبەرکو زەنگینێن ئینگلیز هێدی هێدی بەرزەبوون و یێن فرەنسی ل شوینا دیاربون کو وان ژی چ گرنگی نەددا جوتیاران و کەسێن هەژار.

شاه ویلیامی هەمی گاڤا هوسا خۆ بەرچاڤ دکر کو ئەو کەسەکێ ژ هەژیە و ژبۆ جهەکێ ژ هەژی هاتیەدانان و ئەو ژ هەمی شاهێن ئینگلتەرا بکێرهاتیترە، دبیت تا ڕادەیەکی ئەڤ بوچوونا وی یا دروست بیت ژبەرکو ئەو ڕابوو ب گوهۆڕینا گەلەك یاسا و سیستەمێن حوکمڕانیێ یێن بەری هینگێ، هەردیسان ڕابوو ب تومارکرنا گشت ماڵوسامانێ

گەلێ ئینگلیز و هەمی د پەرتووکەکێ دا نڤێسین کو هەتا نوکەژی وەك ژێدەرەکێ دیروکی یێ گرنگ دهێتە بکارئینان، ئەڤ پەرتووکە ل نڤێسینگەها تومارێن گشتی ل لەندەن هاتیە پاڕاستن.

ویلیامی ژیانا هەڤژینییێ پێکئینا و چوار کور و پێنج کچ هەبوون، ل سالا 1078 ل باژێرێ "ڕوان" یێ فرەنسی وەغەرکر، پشتی مرنا وی هەمی میراتگرێن وی بوونە شاهێن ئینگلتەرا. هەرچەندە ویلیام ئێك بوو ژ ناڤدارترین و گرنگترین شاهێن ئینگلتەرا، لێ ئەو ب خۆ کەسەکێ فرەنسی بوو ل وەلاتێ فرەنسا ژدایکببوو و هەر ل وێرێ وەغەر ژی کر، هەردیسان وی ب ئینگلیزی ژی نەدئاخفت و کەسەکێ نەخواندەڤان بوو.

هەژی گوتنێ یە کو ویلیەمێ جیهانگێر کاریگەریەکا مەزن ل سەر دیروکا وەلاتێ ئینگلتەرا کریە، دبیت یا ب زەحمەت بایە بۆ فرەنسا شەڕێ ئینگلیزان بکەن هەکە ویلیام نەهاتبایە، هەردیسان ویلیەم ئێکەم کەس بوو بشێت پشتی ڕۆمانیان شەڕێ ئینگلیزان بکەت کو بەری وی ب هزار سالان شیابوون ئینگلتەرا داگیربکەن، بەلکو هەمی ئەو بزاڤێن د ماوێ چەرخێن پشتی هینگێ دا هاتینەکرن بۆ داگیرکرنا ئینگلتەرا شکەستن.

ئەگەر ئەم پرسیار بکەین ئەرێ کا کارتێکرنا ڤی شەڕی چبوو ل سەر دیروکا ئینگلتەرا ل دەمەکی هژمارا فرەنسیان ب خۆ گەلەك یا کێم بوو، هەلبەت ئەڤ شەڕە بۆ ئەگەر ئێدی ڕەوشەنبیریا فرەنسی و ئینگلیزی تێکەلی ئێك ببیت ژبەرکو بەری هاتنا ویلیامی ڕەوشەنبیریا ئینگلتەرا گەلەك ب ڕەوشەنبیریا ئەورۆپاڤە یا گرێدایی بوو و ئەگەر ئەڤ شەڕە نەبایە دبیت ئەڤ هەردوو وەلاتە تێکەل نەبانە.

پشتی ویلیام هاتیە سەرتەختێ حوکمڕانییێ ل ئینگلتەرا، بریاردا سیستەمەکێ دەرەبەگایەتییێ یێ پێشکەفتی بکاربینیت، هەر خانەدانەکێ دەرەبەگ ماف هەبوو لەشکەرەکێ ڕێکسختی هەبیت داکو بەرەڤانییێ ژ عەرد و مالۆسامانێ خۆ بکەت، هەلبەت کەسێن فرەنسی ل ڕێزا ئێکێ دهاتن ژبۆ برێڤەبرنا ڤان کاران، ژبەر هندێ ئەو شیان هندەك حکومەتێن ئینگلیزی یێن ب هێز نەك ب تنێ ل ئینگلتەرا بەلکو ل سەرانسەری ئەورۆپا بدامەزرینن.

ئێك ژ تشێن هەرە سەیر یێن ژ ئەنجامێ ڤی شەڕی پەیدابووی ئەوبوو کو ئێدی خەلکی ب زمانەکێ ئینگلیزی یێ نوو دئاخفت ژبەرکو گەلەك پەیڤێن فرەنسی و لاتینی

هاتنە دناڤ زمانێ ئینگلیزیێ دا، ئەگەر ئەم تەماشەی فەرهەنگێن ئینگلیزی یێن سەردەمێ ئەڤروکە بکەین دێ بینین کو هژمارا وان پەیڤێن ئینگلیزی یێن بنیاتێ وان فرەنسی گەلەك پترن ژ وان پەیڤێن بنیاتێ وان سەکسونی و ئەلمانی و سویدی. هەردیسان ئەو بوو ئەگەر ئێدی رێزمانا زمانێ ئینگلیزیێ ژی ب سانەهی بکەڤیت.

هەردیسان گەلەك شەرێن دی دناڤبەرا شاهێن ئینگلتەرا رویدان ئەوێن مالوسامان ل وەلاتێ فرەنسا هەین ژبەرکو د بنیاتدا ئەو خەلکێ فرەنسا بوون، ئەگەر ویلیامێ جیهانگێر ئینگلتەرا داگیر نەکریا دبیت ئەڤ شەرەژی پەیدانەبان ژبەرکو بەری سالا 1066 چ شەر دناڤبەرا ئینگلتەرا و فرەنسا دا نەرویدابوون.

هەژی گوتنێ یە کو ئینگلتەرا وەلاتەکە ژ هەمی وەلاتێن دی یێن فرەنسی یێ جودایە ژبەرکو سامانەکێ گەلەك بەرفرەهـ یێ هەی و شێوازێ وی یێ حوکمرانیێ ژی دیموکراتییە، لێ ئەڤ کاریگەریا مەزن یا وەلاتێ ئینگلتەرا ل سەر جیهانێ کری دگەل قەبارێ وێ یێ بچووك ناگونجیت لەورا ل ڤێرێ پرسیار ئەوە ئەرێ هەتا چ رادە ئەم دشێن ڤی رۆلی هەمیێ بۆ ویلیەمێ جیهانگێر بزڤرینین؟

هەتانوکە دیروکنڤێس ل سەر هندێ رێکنەکەفتینە کا بوچی ئینگلتەرا بویە وەلاتەکێ دیموکراتی و وەلاتەکی دی یێ وەکی ئەلمانیا نەبوویە، جهێ ئاماژە پێکرنێ یە کو رەوشەنبیریا ئینگلیزی تێکەلەکە ژ رەوشەنبیریا فرەنسی و ئەلمانی، لێ رەوشەنبیریا فرەنسی نەچوبوو دناڤ ئینگلتەرا هەتا پشتی نورماندی چووینە دناڤ ئاخا وێ دا، لەورا ب دیتنا نڤیسەرێ ڤێ پەرتووکێ مایکل هارڤی، نەیا بەرئاقلە ئەڤ رۆلە هەمی بوو کەسەکێ دکتاتورێ وەکی ویلیەمی بزڤریت ژبەرکو هەتا پشتی داگیرکرنا ئینگلتەرا ژلایێ ویلیەمیڤە ژی لێ هێشتا هندەك سیستەمێن دیموکراتیێ ل وێرێ مابوون.

دەربارەی پەیدابوونا ئیمپراتۆریا ئینگلیزی، گومان تێدا نینە کو ویلیەمی رۆلەکێ کاریگەر تێدا هەبوو، بەری سالا 1066 وەلاتێ ئینگلتەرا ل قوناغا دوماهیێ دا بوو کو ئێدی تووشی چ شەرێن بیانی نەبیت لێ پشتی سالا 1066 کاودان بەروڤاژی هاتنە گوهۆرین، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤریت کو حکومەتەکا رێکخستی یا بهێز ل سەر دەستێ ویلیامێ جیهانگێر هاتەدانان و هەر کەسێ پشتی ویژی دهاتە سەر حوکمی بزاڤ دکر ڤی سیستەمێ بهێز بپارێزیت لەورا ئێدی چ وەلات نەشیان شەرێ ئینگلتەرا بکەن.

دەمێ هەڤوەلاتێن ئەوروپی ڕابوین ب بەرفەرهکرنا عەرد و ملکێ خۆ ل دەرڤەی سنورێن خۆ ب تایبەت ل پشت  دەریایان، وەلاتی ئینگلتەرا ژی ئەڤ چەندە کر تا وی ڕادەی وان میتانگەهێن خۆ ژ هەمی وەلاتێن دی پێن داگیرکەر پتر بەلاڤکرن.

ژبەر هندێ نابیت ئەم ڤان پێشکەفتنان هەمیان ژبۆ ڕۆلێ ویلیامێ جیهانگێر ب تنێ بزڤڕینین و ڕەنج و خەباتا کەسێن دی ل پێشچاڤ نەوەرگرین لێ ب تنێ دێ بێژین کو داگیرکرنا ئینگلتەرا ژلایێ نورماندیانڤە خالەکا بهێزبوو ژبۆ پێشکەفتنا ئینگلتەرا و ئەڤ کارتێکرنا دوورخایەن یا ویلیەمی کری گرنگیەکا مەزن هەبوو ژبەر هندێ مە ئەو ژ هەژی دیت بکەینە دناڤ لیستا 100 کەسێن کاریگەر د دیروکێ دا.

## 69. سیگموند فروید Sigmund Freud

## (1856ز-1939ز.)

### سیگموند فروید

### ئەو زانایێ کراسەکێ نوو ژبۆ زانستێ سایکولوژیێ دروستکری

سیگموند فروید یێ کو دهێته نیاسین ب دانەرێ زانستێ "شرۆڤەکرنا سایکولوژی" ل سالا 1856 زاینی ل باژێرێ "فرایبورگ" ل وەلاتێ چیکوسلوڤاکیا ژدایکبوویە، ئەڤ باژێرە لوی سەردەمی بەشەك بوو ژ ئیمپراتۆریا نەمسا. دەمێ ژیێ وی بووینە چوار سالێ مالباتا وان هاتە ڤەگوهاستن ژبۆ باژێرێ ڤیەنا کو پتریا ژیانا خۆ ل وێرێ بوراند، هەر ژ بچووکاتی فروید قوتابیەکێ زیرەك بوو و دەمێ مەزن بووی ل سالا 1881 ل زانکۆیا ڤیەنا دەست ب خواندنێ پزیشکی کر.

پشتی دەرچوونا وی ژ زانکۆیێ بۆ ماوێ 10 سالان خواندنا خۆ تەرخانکر بۆ زانستێ فسیولوژی یێ کو پەیوەندی ب خواندنا فرمانێن لەشێ مرۆڤی ڤە هەیە، ل دووڤدا ژی بوارێ خواندنا خۆ ژ فسیولوژی گوهارت بۆ بوارێ چارەسەریا دەماران و وان نەخۆشیێن پەیوەندی ب سیستەمێ دەماری یێ لەشێ مرۆڤی ڤە هەی، ل دووڤدا ل پاریس دگەل نوژدارێ فرەنسی یێ ناڤدار "جان شارکو"ی کارکر و پاشی دگەل نوژدارێ نەمساوی "جوزێف بروير"ی کارکر

تیورێن فرویدی دەربارەی زانستێ سایکولوژی هێدی هێدی پێشکەفتن، ل سالا 1895 پەرتووکەك ب ناڤێ "هێستریا" ب هەڤپشکی دگەل نوژدار برویری بەلاڤکر. لێ پەرتووکا وی یا ب ناڤێ "شرۆڤەکرنا خەونان" ئەوا ل سالا 1900 هاتیە بەلاڤکرن دهێتە هەژمارتن ژ گرنگترین و باشترین کارێن وی، هەرچەندە ئەڤ پەرتووکا وی زوی بەلاڤ نەبوو لێ ببوو ئەگەرێ ناڤودەنگیا وی. هەرچەندە فرویدی پشتی هینگێ گەلەك پەرتووکێن دی بەلاڤکرن لێ نەشیا ناڤداریەکا جیهانی بدەستڤە بینیت هەتاکو چوویە وەلاتێ ئەمریکا چەندین وانە و دیدار ل زانکۆیێن وێ ئەنجامداین.

ل سالا 1902 کومەلەك بۆ گەنگەشەکرنا زانستێ سایکولوژی ل ڤیەنا هاتە دامەزراندن و دناڤ ڤێ کومەلێ دا دوو ژ ناڤودەنگترین زانایێن شرۆڤەکارێن سایکولوژی هەبوون ئەوژی "ئەلفرێد ئەدلەر" و " مارل یونگ" بوون.

ل دووڤدا فرویدی ژیانا هەڤژینیێ پێکئینا و شەش زاروك هەبوون، ل سالا 1923 تووشی نەخۆشیا پەنجەشێرا پدیێ بوو، هەرچەندە هەتا بەری وەغەرکەر بکەت ژی نێزیکی 30 نشتەگەریێن مەترسیدار ئەنجامدان ژ پێخەمەت ڕاوەستاندنا گەشەکرنا پەنجەشێرا وی لێ نشتەگەریێن وی د بێ مفابوون. سەرەڕای ڤێ نەخۆشیا دومدرێژ لێ فروید یێ بەردەوام بوو ل سەر کارێ خۆ و د ڤی ماوێ نەخۆش دا هژمارەکا مەزن یا کارێن هەرە باش و گرنگ ئەنجامدان.

ل سالا 1938 هێزێن نازی وەلاتێ نەمسا داگیرکر لی ژبەرکو فروید کەسەکێ جوهی بوو لەوڕا د ژیێ 88 سالیێ دا ڕەڤی باژێرێ لەندەن و پشتی سالەکێ ل وێرێ وەغەکر.

دبیت بومە یا ب زەحمەت بیت ئەم ب کورتی بەحسێ کارێن فرویدی و ڕۆلێ وی د زانستێ سایکولوژی دا بکەین ژبەرکو وی ئەڤ زانستە تا ڕادەیەکێ مەزن پێشئێخست و گەلەك تشت ل سەر زێدەکرن، فروید شیا گرنگیا مێشکێ ڤەشارتی یانژی نەهەستیاریێ د چالاکیێن هەستپێکەر یێن مرۆڤی دا بکەت یێن کو پەیوەندی ب هزرکرن و ڕەوشتێن مرۆڤی ڤە هەی. زێدەباری هندێ کا چەوا ئەڤ نەهەستیاریە ب خۆ کارتێکرنێ ل پێکهاتنا خەونێن مرۆڤی دکەت و دبیتە ئەگەرێ پەیدابوونا هندەك شاشیێن ئاسایی د ژیانا مە یا ڕۆژانەدا وەك ژبیرکرنا ناڤان و هلنگفتنێن زمانی (ئەزمانێ تر تری).

فروید ئەو زانابوو یێ کو ڕابووی ب پێشخستنا شرۆڤەکرنا سایکولوژی وەك ڕێبازەك ژبۆ چارەسەکرنا نەخۆشیێن مێشکی. هەردیسان ڕابوو ب دانانا تیورا خۆ یا ناڤدار دەربارەی ئاڤاکرنا کەسایەتیا مرۆڤی زیدەباری دانانا چەندین تیورێن دی ژبۆ شرۆڤەکرنا دوودلی و خەمۆکی و بەرەڤانی ژخۆکرن و گرێیێن دەروونی و والقمع والتسامی و چەندین ئاریشەیێن دی یێن سایکولوژی و نەخۆشیێن مێشکی، لێ پتریا بوچوونێن فرویدی بوونە جهێ نەڕازیبوون و گەنگەشەکرنێ و تا ئەڤروکەژی گەنگەشە ل سەر بوچوونێن وی د بەردەوامن.

فروید خودانێ وێ تیورێ یە یا دبێژیت کپرکرنا هەستێن سیکسی ڕۆلەکێ گرنگ د نەخۆشیێن مێشکی و دەماری دا دگێریت، هەردیسان دیارکر کو هەست و حەزێن سیکسی دگەل ژدایکبوونا مرۆڤی پەیدادبن نەک ل ژیێ سنێلەیێ دا.

ژبەرکو هەتا نوکەژی هێشتا بوچوونێن فرویدی جهێ گەنگەشێ نە دناڤ زانایێن سایکولوژی دا لەوڕا ئەم نەشێن ب دروستاهی جهێ د دیروکێ دا دەستنیشان بکەین لێ ناهێتە ڤەشارتن کو کەسەکێ خۆدان شیان و بەرهەمەند بوو و شیا کراسەکێ نوو ژبۆ زانستێ سایکولوژیێ دروست بکەت. هەردیسان تیورێن فرویدی وەکی تیورێن هندەك زانایێن دی وەك باستور و داروین و گەلەکێن دی ژلایێ پتریا زانایانڤە نەهاتینە پشت ڕاستکرن لەورا یا بزەحمەتە بۆمە ئەم بشێن دیارکەین کیژ تیورا وی یا دروستە و کیژك یا شاشە.

سەرەڕای هەبوونا ڤان گەنگەشە و بوچوونێن هەڤدژ ل دور تیورێن وی، لێ هەمی زانا ل سەر هندێ هەڤڕانە کو فروید گوپیتکەکە ژ گوپیتکێن هزرا مرۆڤی. ئەگەر گەنگەشە ل سەر وان تشتێن فرویدی ل سەر زانستێ سایکولوژی زێدەکرین چەند د مەزن و ب هێز بن لێ ئەم دشێن بێژین کو کاریگەریا فرویدی هەتا سەردەمێ ئەڤروکە ژی گەلەك یا ب هێزە لەوڕا مە ناڤێ ژ هەژی دیت دگەل ناڤێن کاریگەرترین مرۆڤ د دیروکێ دا بهێتە دانان.

پشتی فرویدی هندەك زانایێن دی هاتن و دیارکر کو حەزێن سیکسی کارتێکرنەکا کێمتر ل سەر ڕەوشتێن مرۆڤی هەیە، دیسان هندەك زانایێن دی دیارکر کو مێشکێ ڤەشارتی یێ مرۆڤی چ ڕۆلێن گرنگ د ژیانا مرۆڤی دا نینە.

# 70. ئێدوەرد جێنەر Eswadr Jenner

## (1749 ز – 1823ز)

### ئێدوەرد جێنەر

### ئەو نوژدارێ مرۆڤ ژ نەخۆشیا خۆریکان قورتالکرین

نوژدارێ ئینگلیزیی ئێدوەرد جێنەر ئەو کەس بوو یێ شیایی هندەك شێوازێن نوو و پێشکەفتی یێن ڤاکسیدانێ دژی نەخۆشیا خۆریکان Smallpox ئەوا کو بوویە ئەگەرێ کوشتنا هژمارەکا مەزن یا مرۆڤان ب داهێنیت، ل سەردەمێ ئەڤروکە نەخۆشیا خۆریکان بەرەڤ نەمانێ یا چووی و خەلك ژ ڤێ نەخۆشیا کوژەك یێن قورتال بووین لەورا یا ل سەر مە پێدڤیە ئەم بیرا خۆ لوی کەسی بینین یێ بوویە ئەگەرێ نەمانا ڤێ نەخۆشیێ.

خۆریك نەخۆشیەکا ڤەگر و کوژەکە کو دبیتە ئەگەرێ کوشتنا مرۆڤان، بەری داهێنانا ڤێ ڤاکسینێ ئەڤ نەخۆشیە گەلەك بەربەلاڤ بوو ب تایبەت ل ئەوروپا و نێزیکی 10٪ هەتا 20٪ ژ کەسێن تووشی ڤێ نەخۆشیێ دبوون گیانێ خۆ ژدەستدا و ئەو کەسێن ژڤێ نەخۆشیێ قورتال ژی دبوون لەشێ وان تێکدچوو یانژی ئەڤ نەخۆشیە بۆ هندەك کەسێن دی یێن ساخلەم د ڤەگۆهاست.

ئەڤ نەخۆشیە ل ئەوروپا ب تنێ یا بەربەلاڤ نەبوو بەلکو ل گەلەك وەلاتێن دی وەك ئەمریکا باکوری و چین و هندێ ژی یا بەربەلاڤبوو و لڤان وەلاتان ژی گەلەك کەس ببوونە قوربانییێن وێ.

هەرچەندە نوژدارێن وی سەردەمی گەلەك بزاڤ دکرن ڤێ نەخۆشیێ بنبڕ بکەن یانژی هەر چنەبیت بەلاڤبوونا وێ ب ڕاوەستینن و چارەسەریەکێ بۆ کەسێن توشبووی ب داهێنن لێ بزاڤێن وان دبێ ئەنجام بوون بەلکو بتنی وان دزانی کو ئەو کەسێ جارەکێ تووشی خوریکان بیت چ جارێن دی دژیانا خۆدا تووشی ڤێ نەخۆشیێ نابیت خو هەکە چەند تێکەلیا کەسێن توشبووی ژی بکەت لێ وان نهێنیا ڤێ چەندێ نەدزانی.

ل هندەك وەلاتێن ڕۆژهەلاتی ب تایبەت وەلاتێ تورکیا یێ وی سەردەمی خەلکی دزانی ئەگەر ئەو ڤێ نەخۆشیێ ژ کەسەکێ توشبووبی بۆ کەسەکێ ساخلەم ڤەگوهێزن، کەسێ ساخلەم دێ ب شێوەیەکێ سادە تووشی ڤێ نەخۆشیێ بیت و هەر زویکا دێ ساخلەم بیتەڤە و ئێدی تووشی نەخوشیێ نابیت.

بەری جێنەری ب گەلەك سالاں، خاتینەکێ ب ناڤێ "ماری مونتاگیو" ئەڤ شێوازێ خۆ پاڕاستنێ ئینا وەلاتێ خۆ و بزاڤکرن کەسەکێ توشبووی ب نەخۆشیا خۆریکان هەر ب خوریکێن کەسەکێ دی یێ توشبووی ڤاکسین بکەت، لدەسپتپێکێ ڤێ ڕێکێ بۆ ماوەیەکێ بەروەخت سەرکەفتن ئینا لێ پشتی هینگێ ئەو کەسێ ڤاکسین بۆ هاتیەدان نەخۆشیا وی گەلەك دژوارتر لێ هات هەتا گیانێ خۆ ژدەستدای.

لێ نوژدارێ ئینگلیز جێنەری بزاڤکر ڤێ ڤاکسینێ ل سەر لەشێ خو تاقی بکەت کو ئەو یێ ساخلەم بوو، ل دووڤدا ئەو ب شێوەیەکی سڤك تووشی خوریکان بوو و پاشی زویکا ساخلەم بووڤە، ئەڤێ چەندێ ئەو پالدا ل ڕێکەکێ بگەریت و ئەو کەسێن تووشی نەخۆشیێ ژی بووین ڤورتال بکەت.

ئێدوەر جێنەر ل سالا 1749 ل باژێرێ "بارکلی" ل وەلاتێ ئینگلتەرا ژدایکبوویە، دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 18 سالێیێ وی خو فێری کریارێن نەشتەگەریان کر و پاشی خۆ فێری کریارا کەلاشتنا لەشێ مرۆڤی کر و ڤێ چەندێ هاریکاریا وی کر ئەو بشێت ل نەخۆشخانەیەکێ کاربکەت، ل سالا 1792 ئەو شیا بروانامەیەکا نوژداری ل زانکۆیا سانت ئەندرو بدەستخۆڤە بێخیت و دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 40 سالێیێ بوو نوژدارەکێ ناڤدار و باوەرپێکری یێ نشتەگەریان.

دەمێ هێشتا یێ زاروك، جێنەری دزانی کو ئەو جوتیارێن تووشی نەخۆشیا خوریکێن چێلان دبن، ئەو تووشی خۆریکێن مرۆڤان نابن، هەرچەندە نیشانێن نەخۆشیا خوریکێن چێلان هەروەکی نیشانێن نەخۆشیا خوریکانە ل دەف مرۆڤی، لێ ئەگەر هاتە ڤەگۆهاستن بۆ مرۆڤان ژی چ مەترسیێ ل سەر ساخلەمیا وان پەیداناکەت.

وی هزرا خۆ د ڤێ چەندێ دا کرو دیاکر کو دەمێ خوریکێن چێلا تووشی مرۆڤی دبن دبنە ئەگەر کو لەشێ مرۆڤی جورەکێ بەرەڤانیێ دژی ڤێ نەخۆشیێ دروست بکەت لەوڕا ئەو خوریك ناهێنە مرۆڤی، جێنەری گەلەك بابەت ل سەر ڤێ چەندن خاندن و

تیبینیا وان جوتیاران دکر یێن دناڤ گوڤێن چێلان کاردکەن و ل دوماهیێ بۆ وی دیاربوو کو ئەو تشتێ وی هزردکر ڕاستە و بریارا هەر ئێکسەر ڤێ چەندێ ل سەر هندەك کەسان تاقی بکەت.

ل گولانا 1796، جێنەری ژنکەکا توشبووی ب نەخۆشیا خوریکێن چێلان ئینا و پیچەکا کەرەستەیی ژ کولکەکا سەر دەستێ وێ ڕاکر و زاروکەکێ هەشت سالی یی ساخلەم پێ ڤاکسین دا، پاشی نەخۆشیا خوریکان بۆ ڤی زاروکی هاتە ڤەگوهاستن لێ هەر زوی زاروك ساخلەم بووڤە، پشتی چەندین حەفتیان جارەکا وی ئەڤ کارە دووبارە کرەڤە لێ ڤێ جارێ چ نیشانێن نەخۆشیێ ل دەف زاروکی پەیدانەبوون.

پشتی هینگێ جێنەری ئەنجامێن ڤەکۆلین و تاقیکرنێن خۆ د پەرتووکەکا بچووك دا ب ناڤێ "لێگەریانا ئەگەرێن پەیدابوون و چارەسەرکرنا خۆریکان" ل سالا 1798 بەلاڤکرن، ل دووڤدا ئەڤ پەرتووکە بوو ئەگەر کو ڤاکسینێن دژی نەخۆشیا خۆریکان پێشبکەڤن، هەرچەندە جێنەری پشتی هینگێ پێنج ڤەکۆلینێن دی یێن درێژ ل سەر نەخۆشیا خۆریکان ئەنجامدان لێ هەر گەهشتە وان ئەنجامێن دەستپێکی لەوڕا ئەڤ پەرتووکا وی ژ هەمی کارێن دی یێن ئەنجامداین گرنگتر بوو و پتر مفا ژێ هاتە وەرگرتن.

هێدی هێدی کریارا ڤاکسیدانێ دژی نەخۆشیا خۆریکان وەلاتێ ئینگلتەرا هاتە بجهئینان تا وی ڕادەی ل سەر لەشکەری هێزێن دەریایی یا پێدڤی بوو ڤان ڤاکسینان بدانن، پاشی ل سەرانسەر کێشوەرێ ئەورۆپا بەربەلاڤبوو و ل دووڤدا وەك شێوازەکێ خۆپاراستنێ دژی خۆریکا ل سەرانسەری جیهانێ دانپێدان پێ هاتەکرن.

هەرچەندە جێنەری ئەڤ داهێنانە بێ بەرامبەر کرە دیاری بۆ جیهانێ هەمیێ بێی کو بزاڤێ بکەت مفایەکی ماددی ب دەستڤە بینیت، لێ ل سالا 1802 پەرلەمانێ ئینگلتەرا بریاردا 10 هزار جۆنەیهان وەك پاداشت بدەنێ و پشتی چەند سالەکان بریاردا 20 هزار جۆنەیهێن دیژی بدەنێ داکو یێ بەردەوام بیت ل سەر ڤەکۆلینێن خۆ، بڤی ڕەنگی جێنەر بوو ئێك ژ زانایێن هەرە ناڤدارو زەنگین ل سەرانسەر جیهانێ و گەلەك زانکۆ ز دەزگەهێن زانستی باوەرنامێن ڕێزلێنانی و نازناڤێن زانستی پێشکێشی وی کرن.

جێنەری ژیانا هەڤژینێ پێکئینا و سێ زاروك هەبوون، دژیێ 73 سالیێ دا ل سالا 1823 ل مالا خۆ ل باژێرێ"بارکلی" وەغەرکر.

تشتێ سەیر بومە دیاربووی ئەوە کو جێنەری ئەو چەندە ئاشکەرا نەکربوو کو ئەو کەسێن تووشی نەخۆشیا خۆریکێن چێلان دبن لەشێ وان جورەکێ بەرەڤانییێ دژی وێ نەخۆشییێ دروست دکەت و ناهێلیت مرۆڤ تووش بیتی، بەلکو وی ب تنێ گوھ ل ڤی چەندێ بوو و هزرێن خۆ تێداکرن و بریاردا تاقی بکەت.

جێنەر زانایەکێ گەلەك زیرەك و ڕەسەن نەبوو، لێ ئێك بوو ژ وان کەسێن کێم یێن شیایی ملیونەها مرۆڤان ژ نەخۆشیەکا کوژەك و مسوگەر قۆرتال کەت ئەوژی ب هاریکاریا هزروبیر و تیبینی و تاقیکرن و بێهنفرەهیا خۆ، هەرچەندە ئەو داهێنانا جێنەری پێشکێشی مرۆڤایەتیێ کری ببوو ئەگەرێ چارەسەرکرنا نەخۆشیەکێ ب تنێ، لێ ئەڤ نەخۆشیە لوی سەردەمی گەلەك یا بەربەلاڤ و مەترسیدار بوو و گەلەك کەس ببوونە قوربانییێن وێ.

هەردیسان ئەڤ کاری بوی بوو ئەگەر ڤاکسین دژی گەلەك نەخۆشییێن دی یێن ڤەگر بهێنە دروستکرن، لەوڕا ئەو یێ هەژی وان نازناڤ و باوەرنامێن ڕێزگرتنێ بوو یێن ب وی هاتینەدان، هەردیسان یێ ژ هەژیی ناڤی وی دگەل کەسێن کاریگەر بهێتە دانان.

## 71. ویلیەم کۆنارد ڕۆنگێن William Conrad Röntgen

## (1845ز. – 1923ز.)

### ویلیەم کونارد ڕۆنگێن

### ئەو زانایێ بۆ ئێکەم جار تیشکا ئێکس ئاشکەراکری

زانایێ ئەڵمانی و داهێنەرێ تیشکا ئێکس، ویلیەم کۆنراد ڕۆنگین، ل سالا 1845 ل باژێرێ "لینێپ" یێ ئەڵمانی ژدایکبوویە، باوەرناما دکتورایێ ل سالا 1869 ل زانکۆیا زیوریچ ل وەلاتێ سویسرا بدەستڤەئینایە و وەك ماموستا بۆ ماوێ پتر ژ 19 سالان ل چەندین زانکۆیێن جوداجودا کارکریە هەتا ل دوماهیێ وەك زانایەکێ بلیمەت و خودان ڕێز هاتیە گۆرەپانێ.

پشتی هینکێ ل سالا 1888 وەك پروفیسورێ فیزیایێ و سەروکێ پەیمانگەها فیزیایێ ل زانکۆیا وێزربۆرگ هاتیە دامەزراندن، هەر ل ڤی پەیمانگەهێ و ل سالا 1895 ڕۆنگین شیا تیشکا ئێکس ئاشکەرا بکەت ئەوا بوویە ئەگەرێ ناڤداربوونا وی ل سەرانسەری جیهانێ و ناڤێ وی د دیروکێ دا هێلایە ساخ.

ل ڕێکەفتی 8 چریا دوێ یا سالا 1895 ڕۆنگینی دەست ب هژمارەکا ڤەکۆلینان ل سەر تیشکا کاسود کر، ئەڤ تیشکە ژ پێلەکا ئەلیکترونان پێکدهێت. ئەم دشێن ڤێ تیشکێ بەرهەم بینین ب ڕێکا دانانا ڤۆلتیەکا گەلەك بلند ل سەر دوو جەمسەرێن ئەلیکترونی یێن هاتینە دانان ل هەردوو سەرێن بوریەکا شویشەی یا ڤالا ژ هەوایی. هەرچەندە ڤێ تیشکێ شیانێن تێرابورنیێ نینن لێ ئەگەر پیچەکا هەوایی ل سەر بهێتە زێدەکرن یان کەفتە بەر سینگێ وێ، لڤینا وێ دێ هێتە ڕاوەستاندن.

ڕۆنگینی هەردوو سەرێن ڤێ بوریا شویشەی ب پارچە کاغەکا ڕەش و ستویر نخافتن داکو چ پێلێن ڤێ تیشکێ نەدەرکەڤن. دەمێ وی ڤۆلتی بەردایێ چ ڕۆناهی ژ ڤێ بوریێ نەدەرکەفتن، لێ ئەو مەندەهوش ما دەمێ وی دیتی ئەو پەردا فلورنسی (ئەڤ پەردە ب تەخەکا ماددێ پلاتینوسیانیدێ باریومێ هاتبوو نخافتن) یا ل پشت وی هاتیە دانان

ئێکسەر ڕۆهن بوو، وی ڤۆلتی ڤەمراند دیت ئەو ڕۆناهیا سەر پەردێ ژی بەرزەبوو، ژڤێ چەندێ بۆ ڕۆنگینی دیاربوو کو ل دەمێ هلکرنا ڤۆلتیێ تیشکەك دناڤ ڤێ بوریێ دا دەردکەڤیت و دبیتە ئەگەرێ پەیدابوونا ڕۆناهیێ ل سەر پەردا فلورێنسی، وی ناڤێ کریە تیشکا ئێکس X-ray[1].

پشتی ڤێ داهێنانێ، ڕۆنگینی هژمارەکا ڤەکۆلینێن دی ئەنجامدان ژ پێخەمەت هندێ بزانیت کا ژێدەرێ ڤێ تیشکێ لکیڤەیە و چ تایبەتمەندی هەنە.

پشتی چەند حەفتیەکان ژ کاری، بۆ ڕۆنگینی دیاربوو کو ڤێ تیشکێ شیانێن تێرابورینێ د چەندین کەرەستەیێن دی یێن کیمیایی دا هەنە و دشێت ڕۆهن بکەت، هەردیسان ئەڤ تیشکە د کەرەستێن ڕۆهن و تەنك ژی ڕا دبوریت و ئەڤ چەندە بۆ وی دیاربوو دەمێ وی دەستێ خۆ دانایە دناڤبەرا بوریا شویشەی و پەردا فلورێنسی لێ وی دیت ئەڤ تیشکە ژلایێ هەستیکانڤە دهێتە گرتن لەوڕا وی وێنێ هەستیکێن دەستێ خۆ ل سەر پەردا فلورێنسی دیتن. ئەڤ تیشکە ب شێوەیەکێ ڕاست دچیت نەکو وەکی تیشکێن دی یێن ڕۆناهیێ بەربەلاڤ دبن و ناکەفتە ژێر کارتێکرنا بوارێن موگناتیسی.

ل کانونا ئێکێ یا سالا 1895 ڕۆنگینی ئێکەم ڤەکۆلینا خۆ ل دور تیشکا ئێکس بەلاڤکر، ڤێ ڤەکۆلینا وی هەر زی ل سەرانسەری جیهانێ دەنگڤەدا و پشتی بورینا هەیڤەکێ ب تنێ هژمارەکا مەزن یا زانایان ڤەکۆلین ل سەر ڤێ تیشکێ ئەنجامدان و د ماوێ سالەکێ دا هزارەها ڤەکۆلین ل سەرانسەری جیهانێ ل سەر ڤێ تیشکێ هاتنە ئەنجامدان و چەندین نهێنی یێن وێ هاتنە ئاشکەراکرن، ئێك ژ وان زانایێن ناڤدار یێن بڤێ داهێنانا ڕۆنگینی داخباربووی، زانایێ فرەنسی هێنری بیکرێل بوو ئەوێ پشتی هینگێ شیایی تایبەتمەندیێن تیشکدانێ یێن تیشکا ئێکس دیاربکەت.

بشێوەیەکێ گشتی، تیشکا ئێکس هینگێ پەیدادبیت دەمێ ئەلیکترونێن تێهنەکا مەزن هەی بەر ب تشتەکی بکەڤن، تیشکا ئێکس ژ ئەلیکترونان پێکناهێت بەلکو ئەو ب خۆ

---

[1] د زمانێ ئینگلیزیێ دا پیتا X بۆ وان تشتان دهێتە بکارئینان یێن ژێدەرێ وان نەیێ دیاربیت، لەوڕا ڕۆنگینی ژی ناڤێ وێ کرە تیشکا ئێکس ژبەرکو بۆ وی یا ئالۆز بوو ب زانیت ژێدەرێ ڤێ تیشکێ ژ کیڤە دهێت.

هندەك پێلێن كاروموگناتیسینە و وەكی تیشكێن بینراو (پێلێن تیشكا ڕۆناهیێ) تیشكان دهاڤێژیت، لێ جوداهیا وێ دگەل تیشكێن بینراو ئەوە كو پێلێن وێ گەلەك د كورتن.

رۆنگین هەژی ڕێزگرتنەكا تەمامە ژبەر ڤێ داهێنانا وی ژبەركو كەس هەڤپشكێ وی نەبوو و هاریكاریا وی نەكربوو دەمێ وی ڤەكۆلینێن خۆ ل سەر ڤی تیشكێ ئەنجامددابن، داهێنانا ڤێ تیشكی زانایێ فرەنسی بیكرێل و گەلەك زانایێن دیژی هاندا ڤەكۆلینان ل سەر ڤێ تیشكێ ئەنجام بدەن و داهێنانێن زانستی تومارێكەن

د سەدەمێ ئەڤروكە دا تیشكا ئێكس ب شێوەیەكێ بەرەبەلاڤ د زانستێ پزیشكی دا دهێتە بكارئینان ب تایبەت پزیشكا ددانسازیێ و ئەو نەخۆشیێن تووشی ددانان دبن، هەردیسان ئەڤ تیشكە وەك چارەسەریا تیشكی ژبۆ دەستنیشانكرنا جهێ وەرەمێن پەنجەشێری دناڤ لەشێ مرۆڤی دا دهێتە ب كارئینان ژێخەمەت ژناڤبرنا ڤان وەرمان یان ڕاوەستاندنا گەشەكرنا وان، د بوارێن پیشەسازیێ ژی دا ڤێ تیشكێ ڕۆلێ خو دیتیە و دهێتە ب كارئینان بۆ دیاركرنا ستویراتیا هندەك كەرەستەیان یان دەستنیشانكرنا كێماسیێن وان، ژبلی بوارێن زانستێن بایولۆژی و گەردوناسی كو مفاییێن وێ دبێ سنورن، تیشكا ئێكس بوو ئەگەرێ دیاركرنا پێكهاتنا ناڤوكی و ڕیشەیی یا گەلەك تۆخمێن كیمیایی و هەر ب هاریكاریا وێ پشتی هینگێ زانا شیان بۆمبێن ناڤكی دروست بكەن.

ڕاستە ئەو بوارێن تیشكا ئێكس تێدا دهێتە بكارئینان گەلەك د گرنگن، لێ ئەڤ چەندە هندێ ناگەهینیت كو ئەم ڤی ڕۆلی بدەینە ڕۆنگینی ب تنێ ژبەركو ل بەری وی هندەك زانایێن دی داهێنانێن مەزنتر ئەنجامداینە وەك داهێنانا زانا فارادای ل سەر تیشكا كاروموگناتیسی، یانژی تیشكا سەربنەفشی كو درێژاهیا پێلێن وێ ژ تیشكا بینراو كورترن و بەری هینگێ ب چەرخەكی هاتبوو ئاشكەراكرن.

هەرچەندە گەلەك تایبەتمەندیێن تیشكا ئێكس وەكی یێن تیشكا سەربنەفشینە لێ ژبەركو پێلێن وێ كورترن لەورا كێمتر زانستێ فیزیا كلاسیكی دا دهێتە بكارئینان. ژبەر هندێ مە ناڤێ ڕۆنگینی دانایە پشتی ناڤێ هندەك زانایێن دی ب تایبەت ڕۆزەرفوردی ژبەركو داهێنانا ڕۆزەرفوردی بوارێن مەزنتر بخۆڤە گرتن.

رۆنگینی چ زاروك نەبوون لێ وان كچەك بۆ خۆ ب خودان كر، ل سالا 1901 هاتە كاندیكرن بۆ وەرگرتنا خەلاتێ نوبل د فیزیاییێ دا و ئەو ئێكەم كەس بوو ئەڤ خەلاتە وەرگرتی. ڕۆنگین ل سالا 1923 ل باژێرێ میونیخ ل ئەڵمانیا وەغەركر.

## 72. یۆهان سیباستیان باخ Johann Sebastian Bach

## (1685ز - 1750ز)

### یۆهان سیباستیان باخ

### بلیمەترین موزیکژەنێ کلاسیکی د دیروکا ڕۆژئاڤایی دا

موزیکژەنێ بناڤودەنگ یۆهان سباستیان باخ ئێکەم کەس بوو شیایی ب شێوەکێ سەرکەفتیانە شێوازێن جوداجودا یێن موزیکا نەتەوەیی پێکڤە گرێدەت و موزیکەکا ئێکگرتی ژێ دروست بکەت ب تایبەت ل وەلاتێن ئەوروپا ڕۆژئاڤایی هەمیێ، ئەوژی ب ڕێکا تێکەلکرنا باشترین شێوازێن کلاسیکی یێن موزیکێ ل ئیتالیا و فرەنسا و ئەلمانیا. هەرچەندە باخ د سەردەمێ خۆدا نەیێ ناڤدار بوو و هەتا پشتی بورینا پێنجی سالان ژی کەسەکێ ژبیرکری بوو، لێ پشتی هینگێ گرنگیەکا مەزن ژلایێ ڕەخنەگر و دیروکڤانان ب کارێن وی هاتەدان و وەك ئێك ژ مەزنترین موزیکژەنێن سەرکەفتی هەژمارت.

باخ ل سالا 1685 ل باژێرێ "ئیزناخ" ل وەلاتێ ئەلمانیا ژدایکبوویە، باخ هەر ژ زاروکینیا خۆ کەسەکێ ب بەخت بوو ژبەکو ئەو دناڤ خێزانەکێ دا مەزن بوو کو هەمی حەژێکەرێن موزیکێ بوون و گرنگیەکا مەزن ددایێ. بەری ژدایکبوونا وی ب ماوەیەکێ درێژ، بابێ وی موژیکرەنەکێ دەستڕەنگین بوو ب ژەنینا ئامیرێ گیتارێ و دوو مامێن ویژی بەهرەیێن هونەری ل دەف هەبوون و هژمارەکا کورمام و کورمەتێن ویژی ئاوازدانەر و موزیکژەنێن ناڤداربوون.

دەمێ ژیێ وی نەهـ سال دەیکا وی وەغەرکر، لەوڕا هاتە هنارتن بۆ قوتابخانا "سانت مایکل" و ل ڤی قوتابخانێ گەلەك پشتەڤانی و هاریکاریا وی یا ماددی دهاتەکرن ژبەرکو ئەو گەلەك پێدڤی بڤێ هاریکاریێ بوو و دهەمان دەمدا ژبەرکو دەنگەکێ خۆش هەبوو. ل سالا 1702 ل ڤی قوتابخانێ دەرچو و پشتی هینگێ ب سالەکێ دگەل گروپەکێ موزیکێ یێ بچووك وەك موزیکژەنێ ئامیرێ گیتارێ کارکر.

د ماوێ بیست سالێن داهاتی یێن ژیانا خۆدا وی گەلەك كارێن موزیكێ ئەنجامدان و وەك موزیكژەنێ ئامیرێ ئورگێ، هەردیسان وەك ماموستایێ موزیكێ و ئاوازدانەر و سەركێشێ ئوركسترایێ ژی كاكریە. ل سالا 1723 دەمێ ژیێ وی بوویە 38 سالێ ل دێرا "تۆماس" ل باژێرێ "لایبزیگ" وەك موزیكژەن كاركر و ئەو بۆ ماوێ 27 سالێن مایی ژ ژیانا خۆ ل سەر ڤی كاری یێ بەردەوام بوو هەتا سالا 1850 وەغەركری.

هەرچەندە باخ د ماوێ ژیانا خۆدا نەشیا چ كارێن بلیمەت و مەزن بكەت لەوڕا نەشیا ناڤودەنگیەكا مەزن وەك یا بتهوڤن و لیست و شوبانی پەیدابكەت كو ددەمێ ژیانا خۆدا و هێشتا د زیندی دناڤودەنگ بوون و ژبلی كەسێن نێزیكی وی یێن دگەل كاردكر كەسێ دی نەدزانی ئەو كەسەكێ بیلمەتە.

دەمێ دێرا باژێرا لایبزیگ ڤیایی موزیكژەنەكێ پلە ئێك ل دەف خۆ بدەتە كاری، وان باخ هەلبژارت لێ نەژبەركو ئەو موزیكژەنەكێ بڤی ڕەنگی بوو بەلكو پشتی بزاڤێن وان بۆ ڕازیكرنا دوو موزیكژەنێن دی سەرنەگرتین ژ نوو ئەو نەچاربوون باخی ب هەلبژێرن، د هەمان دەمدا و پشتی باخ ڕازیبووی ڤی كاری بكەت ئەوی كارێ خۆ هێلا كو ل كوچكا ئێك ژ مەزنێن وی باژێری كاردكر لەوڕا وی كەسی بۆ ماوێ سێ ڕۆژان باخ زیندان كر.

دەمێ ژیێ وی 28 سالێ وی كچ ماما خۆ بۆخۆ ئینا و حەفت كور هەبوون و دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 35 سالێ هەڤژینا وی وەغەركر لەوڕا ل سالا ل دویڤدا هەڤژینەكا دی بۆ خۆ ئینا و ڤێ هەڤژینا ویژی 13 كورێن دی بۆ ئینان، لێ پشتی مرنا باخی ب تنێ نەهـ كورێن وی مابوونە ساخ كو چار ژ وان موزیكژەنێن باش بوون، ئەڤ چەندەژی بەلگەیە ل سەر هندێ كو ئەو بنەماڵەكا بەهرەمەند بوون.

باخ ژی كەسەكێ پڕی بەرهەم بوو و هژمارا كارێن وی یێن هونەری دگەهشتە نێزكیی 800 كاران. هەردیسان كەسەكێ دیندار بوو و بزاڤ دكرن كارێن وی یێن هونەری پەیوەندی ب هەستێ ئاینی ڤە هەبیت لەوڕا ژی پتریا كارێن وی یێن هونەری ڕاستەخۆ پەیوەندی ب ئاینی ڤە هەبوو. هەرچەندە چ باخی شێوزاێن هونەری یێن نوو نەداهێنان بەلكو وی شێوازێن كەڤن بكاردئینان و كارێن موزیك و ستران و ژەنینێ یێن ئێكانە ژێ دروستكرن.

پشتی 50 سالاَن ژ مرنا ویژی، باخ وەك كەسەكی ژبیركری بوو، هەرچەندە موزیكژەنێن نازدارێن وی سەردەمی وەك هایدن و موزارت و بتهوڤنی گەلەك رێز ل وی دگرت و گرنگی ددا كارێن وی لێ دگەل هندێ ژی باخ هەر كەسەكێ ڤەشارتی بوو.

دبیت ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ بزڤریت كو ڤان كەسان هندەك شێوازێن موزیكێ یێن نوو داهێنان لێ باخی ب تنێ گرنگی ددا موزیكا كلاسیكی لەورا لبن سیبەرا ناڤداریا ڤان كەسان هاتە ژبیركرن. ل سالاَ 1800 شۆرەشەكا موزیكێ دەستپێكر و ئەڤ شۆرەشە بوو ئەگەر جارەكی كارێن باخی هاتنە زیندیكرن و ئاماژە ب مەزناهی و بلیمەتیا وی هاتە كرن.

و پشتی هینگێ وەك ئێك ژ بلیمەتێن موزیكا كلاسیكی هاتە نیاسینن.

یا سەیر ل ڤێرێ ئەوە كو باخی گرنگی ددا موزیكا كەڤن لێ ئەو بوو موزیكژەنەكێ كلاسیكی یێ سەردەم، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤریت كو باخ دهێتە هەژمارتن ژهەژیترین دانەرێ موزیكێ یێ پرۆفیشنال یێ كو یاسا و رێسایین موزیكێ پەیرەو دكرین، دهەمان دەمدا ژ كەسێن دی زیرەكتر و باشتربوو ژبۆ بكارئینانا پتر ژ ئێك ئاوازەكێ د كارەكێ موزیكێ یێ ب تنێ دا لەورا ژی كارێن وی بوونە جهێ رازیبوونا هژمارەكا مەزن یا خەلكی چونكی درێكخستی و جوان بوون.

بسپورێن موزیكێ دیاردكەن كو دكارێن باخی دا كویراتی و هەمەجوری و فرەرەنگی تێدا هەبوون، د هەمان دەمدا كارێن وی ژ كارێن پتریا هونەرمەندێن دی پتر د رۆهن و ئاشكەرا بوون.

هەتا نوكەژی باخ دهێتە هەژمارتن ناڤدارترین موزیكژەنێ جەماوەری یێ موزیكا كەڤن ژبلی بتهوڤنی، چونكی سەمفونییێن وی ل سەرنسەری جیهانێ بەلاَڤبوون و پێشوزایەكا باش ژلایێ موزیكرەنێن نوو ژی لێ هاتەكرن لەورا مە ناڤێ وی پشتی یێ بتهوڤنی دانا، هەردیسان ژبەركو بتهۆڤن ژوی وێرەكتربوو و كارێن وی كاریگەریەكا مەزنتر ژ یا باخی هەبوون.

هەردیسان یا رەوایە ناڤی وی پشتی نیگاركێش مایكا ئەنجلو و هوزانڤان شكسپیری بهێت لێ ژبەر وێ كاریگەریا كویر یا وی ل سەر موزیكی كری مە ناڤێ وی دانایە بەری هەر موزیكەن یان نیگاركیش یان ئەدیبەكێ دی.

## 73. لاو تزو Lao Tzu

## (چەرخێ 6-5 بەری زاینی – چەرخێ 5-4 بەری زاینی)

### لاو تزو

### خۆدانێ دانەرێ پەرتووکا ئاینێ تاوی ل چینێ

ژ هزرەها پەرتووکێن د سەردەمێن کەڤندا ل وەلاتی چینێ هاتینە نڤێسین و بەلاڤکرن، لێ ب تنێ پەرتوکەکا بچووك بوویە ناڤدارترین پەرتووکا چینی یا کەڤن کو بەری دوو هزار سالان هاتیە نڤێسین و ژبۆ پتریا زمانێن جیهانێ هاتیە وەرگێران و ژدەرڤەی وەلاتێ چینێ هاتیە خواندن، ئەو پەرتووکە یا هاتیە نیاسین ژلایێ "لاو تزو" ب ناڤێ "پەرتووکا تاوی" ب رامانا وێ یا کلاسیکی "رێك و هێزا وێ" یا دهێتە هەژمارتن بنیاتێ ئاینێ تاوی[1] یێ چینێ.

لاو تزو فەیلەسوفەکێ چینی کەڤن و کەسایەتیەکێ گرنگە د ئاینێ تاوی دا و ل سالا 604 بەری زاینی ژدایکبوویە. لدویڤ بیروباوەرێن چینی ئەڤ کەسە ل چەرخێ شەشێ زاینی ژیایە لێ دیروکنڤێس دوێ باوەرێ دانە کو لاو تزو کەسایەتیەکێ ئەفسانەیی یە یانژی ژ ئەنجامێ خرڤەبوونا چەندین کەسایەتیێن جوداجودا پەیدابوویە.

ئەڤ پەرتووکا بچووك ب شێوازەکێ جوان و سەرنجراکێش هاتیە نڤێسین و گەلەك تشتێن نەئاشکەرا و ڤەشارتی تێدا هەنە کو دەرفەت هەیە ب گەلەك رەنگان بهێتە شرۆڤەکرن. بنیاتێ وێ یێ سەرەکی سەرەدەیێ دگەل تێگەهی ئاینێ تاوی یانژی "رێك" دکەت لێ دڤێ رێکێ بخۆژی دا گەلەك تشتێن ڤەشارتی تێدا هەنە و پەرتووك ب ڤێ رستێ دەستپێدکەت: ئەو رێکا دهێتە بەحسکرن نە رێکەکا هەروهەر و بێ دوماهیکە.

[1] تاوی یانژی تاویزمی Taoism کومەکا بنەمایێن فەلسەفی و بیروباوەرێن ئاینی نە کو پێکدهێن ژ بیروباوەرێن چینی یێن کەڤن و دهێتە هەژمارتن دووەم کاریگەرترین ئاین لسەر جڤاکێ چینی پشتی ئاینێ کونفۆشی.

ئەم دشێن ڤێ پەیڤا چینی یا ڕامانا ڕێك دهێت وەرگێرین بۆ پەیڤا "سرۆشتێ تشتێن دەوروبەر" یانژی "سیستەمێ تشتێن دەوروبەر" و ب ڤێ چەندێ پتر نێزیکی وێ پەیڤێ بیت یا وی مەرەم پێ هەی.

ڕێبازا ئاینێ تاوی دبێژیت: نابیت مرۆڤ بەرهنگاری ڕێکێ بیت، بەلکو دڤێت ب شێوەیەکێ هارمونی خۆ دگەل بگونجینیت.

هەردیسان دبەشەکێ دی یێ ڤێ پەرتووکێ دا هاتیە: ئەگەر هزرا خۆ د هندێ دا کر کا چەوا ئاڤ ژ جهەکێ بلند بەرەڤ جهەکێ نزم هاتە خارێ، یانژی ئەگەر مە دیت ئاڤ یا ل دور وان تشتان دزڤریت یێن بەرهنگاری وێ دبن، ئەڤ وێنەیە بەلگەیە ل سەر هندێ کو ئاڤێ ژی ڕێکا خۆ یا تایبەت یا هەی و سیستەمەکێ هەی بەرهنگاری نینە و ئەم نەشێن ڕژیانا وێ ب ڕاوەستینین. ئەم نەشێن ڕێکا ئاڤێ ژناڤ بەین یانژی کونترۆلێ ل سەر بکەین لێ د هەمان دەمدا ئەم دبینین کو بەرێن گەلەك ڕەق ژناڤ دچن چونکی چ ڕێك نینن.

ل سەر مرۆڤان یا پێدڤیە د سادە و ئاسایی بن و ژیانا خۆ ب ئارامی بورینیت، چ تشت ژ کەرب وکین و تەماعیێ نینن، دشیانێن مرۆڤاندا نینە جیهانی ٚهەمیێ ب گوهۆڕن لەوڕا دڤێت خۆ دگەل کاودانێن وێ ب گونجینن لەوڕا کەرب و کینا خەلکی وان پاڵددەتە پیلادانێن شەڕی و خراپکاریێ.

هەتا نوکە زانا و دیروکنڤێس ل سەر هندێ ڕێکنەکەفتینە ل سەر وی سەردەمێ یێ لاو تزو تێدا ژیایی لێ ب شێوەیەکێ گشتی گەهشتینە وێ باوەریێ کو بەری سالاٚ 320 بەری زاینێ ژیایە. هەردیسان ل سەر کەسایەتیا ویژی بوچوونێن جوداجودا هەنە ژبەرکو هندەك هزردکەن کەسەکێ ئەفسانەیی یە و چ ڕاستی بۆ هەبوونا وی نینن و ئەڤ پەرتووکا ویژی ب تنێ هژمارەکا ڕێنماییێن ڕەوشتی نە.

هەرچەندە ئەڤ پەرتووکە یا بچووکە ژی و قەبارێ وێ یێ ناڤنجیە لێ ئەو کاریگەریا ل سەر ڕێبازێن ڕەوشتی و ئاینی یێن چینی گەلەك یا ڕۆهن و ئاشکەرایە، تا وی ڕادەیی ئەڤ پەرتووکە دهێتە هەژمارتن بابێ ڕۆحی ل سەر وان گوهۆڕینێن هاتینەکرن ل سەر ئاینێ بودی و ڕیبازا "زان".

ئەم دشێن بێژین ڕەنگە چ فەیلەسوفێن چینی نەبن کو بۆ جارەکێ ب تنێ ژی نەبیت هەکە ئەڤ پەرتووکە نەدانابیتە بەر سینگێ خۆ و نەچوبیتە دناڤ جیهانا پەیڤێن وێ دا.

## 74. ڤۆلتێر Voltaire

## ( 1694 ـ 1778

### ڤۆلتێر

### ناڤدارترین هزرمەندێ ئەوروپی و پێشەنگێ تەڤگەرا ڕەوشەنگەرییێ ل فرەنسا

ناڤێ وی فرەنسوا ماری ئارۆی یێ ناڤدار ب ڤۆلتێر ئێکە ژ کەسایەتیێن بەرنیاس و پێشەنگێن تەڤگەرا ڕەوشەنگەرییێ ل فرەنسا، د هەمان دەمدا هوزانڤان و فەیلەسوف و هزرمەندەکێ ئازاد بوو و ناڤێ وی ل هەمی سەردەمان دهێتە گوتن.

ڤۆلتێر ل سالا 1694ل باژێرێ پاریسێ ژدایکبوویە کو ل وی دەمێ ژخێزانەکا تەخا ناڤنجی بوو، بابێ وی پارێزەر بوو. دەمێ گەهشتیە ژیێ گەنجاتیێ چوو کولیژا "جوزێت" ل پاریسێ و هەر زوی ب هندێ ناڤداربوو کو گەنجەکێ ڕەخنەگر بوو لێ ڤێ چەندێ مەترسی ل سەر ژیانا وی پەیداکربوو.

سیستەمێ کەڤن یێ بەری شۆڕەشێ حوکم ل فرەنسا دکر یێ ئارام نەبوو ژ کەسێن ڕەخنەگر ژبەر هندێ هەر زوی ئەو دەستەسەرکرن و زیندان کرن و ئێك ژ وان ڤۆلتێر بوو کو بۆماوێ پتر ژ سالەکێ هاتە زیندانکرن د کەلها پاستیلڤە. دڤی ماوەی دا وی داستەنەکا هوزانان نڤێسا و ناڤێ وێ کرە "هنریاد" و ل دووڤدا بوو ژبەر ڤێ داستانێ بوو ئەدیبەکێ ناڤدار. ل سالا 1718 هاتە ئازادکرن و پشتی هینگێ ب ماوەیەکێ کێم شانوگەریا "ئودیت" ل هۆلێن شانۆییێن فرەنسا پێشکشێکر و خەلکی پێشوازیەکا مەزن ل ڤی کارێ وی کر.

ڤۆلتێر هێشتا ژیێ وی ب تنێ 24 سالێ بوون وەك هرزمەندەکێ ناڤدار دناڤ خەلکی دا هاتە نیاسین و بۆ ماوێ 60 سالێن ل دووڤدا ژی وەك ناڤدارترین هزرمەندێ ئەوروپی دهاتە نیاسین. ئەڤ کەسە گەلەك یێ شارەزابوو بۆ بدەستڤەئینانا پارەی هەروەکی کا چەوا یێ شارەزابوو دبوارێ بکارئینانا پەیڤێن کاریگەردا لەوڕا ب درێژاهیا ژیانا خۆ کەسەکێ زەنگین بوو.

ل سالا 1726 هێدی هێدی نەخۆشی دژیانا ویدا پەیدابوون چونکی ئێدی خەلکی ب چاڤێ ڕەخنەگرەکێ توونڈ و هزرمەندەکێ بیرتیژ و شارەزا نیاسی و ڤێ چەندێ ژی گەلەك دوژمن بۆ وی پەیداکرن.

ژبەرکو ڤۆلتێر ژ تەخا ناڤنجی بوو، لەوڕا گەلەك ئاڕیشە بۆ وی دگەل کورێن کەسێن زەنگین دەستهەلاتدارا پەیدابوون. ڕۆژەکێ گەنگەشەکا دژوار دگەل کورێ زەنگینەکی کر و شیا ب شێوازێ خۆ وی شەڕمرزار بکەت و ل پاریسێ هەمیێ بکەتە لێبوك لەوڕا سەرا ڤێ چەندێ هاتە زیندانکرن و ب تنێ ب مەرجەکی هاتە ئازادکرن ئەوژی ئەگەر وەلاتێ فڕەنسا ب تەمامی بجهـ بهێلیت لەوڕا وی بریاردا بچیتە وەلاتێ ئینگلتەرا و دوو سالا ما ل وێرێ.

چوونا وی بۆ ئینگلتەرا وەکی خالا وەرچەرخانێ بوو د ژیانا وی دا ژبەرکو هەر زوی خۆ فێری خواندن و نڤێسینا ئینگلیزیێ کرو ڤێ چەندێ هاریکاریا وی کر ئەو پەرتووکێن فەیلەسوفان بخوینیت وەك پەرتووکێن "جۆن لۆك" و "فڕەنسیس بەیکۆن" و ئیسحاق نیوتن" و "ویلیەم شکسپیری". ل دویڤدا شیا هەڤنیاسینێ دگەل هژمارەکا مەزن یا هزرمەندێن ئینگلیز بکەت. دڤی ماوەی دا ڤۆلتێر گەلەك ب شکسپیری و زانایێن ئینگلیز و فەلسەفا وان یا پڕاکتیکی و کارەکی داخباربوو لێ تشتێ ژهەمیا پتر ڤولتێر پێ داخباربووی سیستەمێ وان یێ سیاسی بوو.

د وی ماوەی دا ئەو دیموکراتی و ئازادیێن کەسایەتی یێن ل ئینگلتەرا هەین ئەگەر دگەل فڕەنسا هەڤبەربکەین دێ د گوپیتکێ دابوون، ژبەرکو ل ئینگلتەرا بێی یاسایێ چ کەسان ئەو ماف نەبوو کەسەکێ دی زیندان بکەت لێ ل فڕەنسا هەر زەنگینەك ب سانەهی دشیا کەسەکێ ئاسایی زیندان بکەت ب تنێ ئەگەر نامەیەکا ئاگەهدارکرنێ بۆ پولیسان فڕێکربایە. هەردیسان ل ئینگلتەرا ئەگەر کەسەکێ تاوانبار بێ گونەهیا وی دیاربایە هەر ئێکسەر دا هێتە ئازاداکرن لێ چ تشتێن ب ڤی ڕەنگی ل فڕەنسا نەبوون.

دەمێ ڤۆلتێر دووبارە زڤڕیە فڕەنسا ئێکەم بەرهەمێ خۆ ب ناڤێ "نامەیێن فەلسەفی" بەلاڤکرن. ئەڤ پەرتووکە کو ل سالا 1732 دەرکەفتیە، دیروکنڤێس بدەستپێکا ڕاستەقینە یا تەڤگەرا ڕەوشەنگەریێ ل فڕەنسا ل قەلەم ددەن ژبەرکو دڤێ پەرتووکێ دا ئاماژە ب سیستەمێ سیاسی یێ ئینگلتەرا و بیروباوەرێن فەیلەسوفێن وان هاتیە کرن.

دەركەفتنا ڤێ پەرتووكێ بوو ئەگەرێ تۆرەبوونا دەستهەلاتدارێن فرەنسی لەوڕا ڤولتێر نەچاربوو بازێرێ پاریسێ بجهـ بهێلیت و نێزیكی 15 سالێن دی یێن ژیانا خۆ ل غەریبیێ ل ڕۆژهەلاتا فرەنسا بوراندن، ل ڤی دەڤەرێ وی هەڤنیاسین دگەل خاتینەكا بیرتیژ و ڕەوشەنبیر ب ناڤێ "دشاتلیه" كر و پەیوەندیەكا ئەڤینیێ دناڤبەرا واندا پەیدابوو. لێ پشتی سالەكێ ل سەر مرنا وێ ل سالا 1750 ڤۆلتێر لدویڤ داخازنامەكا فردریشێ مەزن كو ئیمپراتۆرێ برۆسیا بوو گەهشتە وەلاتێ ئەلمانیا.

د ئێكەم دیدارا خۆدا ڤولتێر گەلەك بڤی ئیمپراتۆری داخباربوو و دهەمان دەمدا ئیمپراتۆر ژی ب هزرو كەسایەتیا وی داخباربوو لێ هەرزوی ناكوكی كەفتە دناڤبەرا وانداژی لەوڕا ڤولتێر نەچاربوو ل سالا 1752 ئەلمانیا بجهـ بهێلیت. داكو سەرێ وی ژ شاهێن فرەنسا و برۆسیا ئارام بیت وی باخچەك لبازێرێ جنێڤ یێ سویسری كری و تێدا ئاكنجی بوو لێ هەر ل وێرێ ژی فەلسەفەیا وی بۆ جهێ تۆرەبوونا دەستەلاتدارێن سویسری لەوڕا نەچاربوول سالا 1758 ل گوندەكێ ل سەر سنورێ فرەنسا ئاكنجی بیت داكو هەردەمێ پێدڤی بوو ب شێت ب سانەهی ژ سویسرا برەڤیتە فرەنسا یان بەروڤاژی.

ڤۆلتێر نێزیكی 20 سالان ل ڤی گوندی ژیا كو فەلسەفەیا خۆ ژ وێرێ بەرەڤ هەمی ئاراستەیان فرێدكر و نامە بۆ شاهـ و سەركردەیان فرێدكرن و هندەك جاران ل مالا خۆ مێهڤان دكرن و یاری ترانە بۆ دكرن. ڤۆلتێر تا دوماهیێ ژی ژ بەرهەم ئینانا فەلسەفەیا خۆ نەراوەستیا لەوڕا دهێتە هەژمارتن ئێك كەسێن نەمرێن پڕی بەرهەم چونكی هژمارا وان بەرپەرێن وی نڤێسان ژ 30 هزاران بوری بوون و پێكهاتیبوون ژ هوزانێن داستان و سترانان و گوتار و بەلاڤوك و كورتە چیرۆك و ڕۆمانان و ڤەكۆلینێن دیروكی و فەلسەفی.

ڤولتێری گەلەك باوەری ب لێبورینا ئاینی هەبوو، د ژیێ وی یێ شێت سالێ دا كەفتە د هەڤڕكیێ دا دگەل ڕێبازا پرۆتستانتی لەوڕا وی گەلەك هەڤڕكیا توندڕەویا ئاینی دكر و گەلەك نامەیێن ڕەخنەگر بەلاڤدكرن كو ل دوماهیا هەمیان دووپاتی ل سەر هندێ دكر كو دڤێت توندڕەویا ئاینی نەمینیت.

ل سالا 1778 دژیێ 38 سالێ دا ڤولتێر ڤەگەریا پاریس داكو یێ ئامادە بیت ل دەمێ پێشكێكرنا ئێكەم شانوگەریا وی ب ناڤێ "ئێرین" و گەلەك كەسان دەستخوشی ل ڤی

کاریٚ وی کر و ئەو ب سەرکێشیٚ تەڤگەرا ڕەوشەنگەرییٚ ل فرەنسا ل قەلەم دا ب تایبەت هزرمەندیٚ ئەمریکی "بنیامین فرانکلینی". لیٚ پشتی هینگیٚ ب ماوەیەکیٚ کێم وی ڤولتێریٚ ل ڕێکەفتی 30 ئەیارا 1778 وەغەرا دوماهییٚ کر لیٚ ژبەر هێرشێن وی یێن زڤڕ بۆ سەر زەلاٚمێن ئاینی لەوڕا نەهێلا ڕێوڕەسمێن ڤەشارتنا وی لدویڤ ئاینی مەسیحی بۆ بهێنە گێران.

لیٚ پشتی هینگیٚ ب سیٚ سالاٚن زەلاٚمێن شۆڕەشا فرەنسی دووبارە بەرمایکێن گوریٚ وی ئینانەدەریٚ و د ڕێوڕەسمەکیٚ نیشتیمانی ییٚ ژ هەژی دا گورستانا "باسنیون" ڤەشارت کو دهێتە هەژمارتن گورستانا ناڤدارێن فرەنسا.

ڤولتێری گەلەك بەرهەمێن جوراوجور و هەمەڕەنگ لدویڤ خۆ هێلان، ژ گرنگترین بوچوونێن وی باوەریا وی یا زێدە ب ئازادیا تاکەکەسی و عەقیدیٚ، هەردیسان ژ ناڤدارترین گوتنا وی ئەوبوو یا دبێژت "دبیت ئەز نەدگەل ویٚ ڕێکیٚ بم یا تو پیٚ بوچوونا خۆ ددەربری، لیٚ ئەز ییٚ ئامادەمە خۆ بدەمە کوشتن ژپێخەمەت هندیٚ تو ب ئازادی بوچوونا خۆ ب دەربری".

هەرچەندە ڤولتێریٚ باوەری ب خودیٚ هەبوو و ئەڤ باوەریا وی نەببوو ئەگەر ئەو ییٚ توندڕەوبیت دگەل چ ئاینێن دی لیٚ باوەریا وی ب ئازادیا تاکەسی وەلێکر ئەو باوەرییٚ ب دەستهەلاٚتا دیموکراتی بینیت کو بدیتنا وی ب تنیٚ وی سەرکردەی مافیٚ دەستهەلاٚتیٚ ییٚ هەی ئەویٚ ژلاییٚ خەلکیڤە دهێتە هەلبژارتن بیٚی کو چ دەستهەلاٚتێن ئاینی ل سەر بهێنە سەپاندن لەوڕاژی هەڤالێن وی ئەو ب کەسەکیٚ دیموکرات و ئازادیا هزری ل قەلەم ددا و هەر ئەڤ چەندەبوو بۆ ئەگەریٚ بەلاٚڤبوونا شۆڕەشا فرەنسی ل سالاٚ 1789.

هەرچەندە ڤۆلتێر کەسەکیٚ زانا نەبوو لیٚ وی باوەریا موکوم ب فەلسەفا کارەکی یا ئینگلیزان هەبوو چونکی وان سەرەدەری دگەل کەتواری دکر نەك دگەل ئەفسانە و هەستوسوزان، د هەمان دەمدا گرنگی ددا دیروکیٚ و پەرتووکەك ب ناڤیٚ "گوتارەك ل دور تیتالێن مللەتان" بەلاٚڤکر کو ئێکە ژبهاترین و مفاترین پەرتووکێن دیروکی ئەوژی ژبەر دوو ئەگەران: ئەگەریٚ ئێکیٚ ئەوبوو وی هزرکر ئەوروٚپا ب تنیٚ پارچەکا بچووکە ژڤیٚ جیهانیٚ لەوڕا دڤێت گرنگییٚ بدەتە وەلاٚتێن دی یێن جیهانیٚ ژی.

ئەگەرێ دووێ ژی ئەوبوو کو وی هزرکر دکر دیروکا ڕەوشەنبیری یا هەر ملەتەکی گەلەك گرنگترە ژ دیروکا سیاسی لەوڕاژی دڤێ پەرتووکێ دا وی گرنگی دابوو ڕەوشت و تیتالێن مللەتێن دی یێن جیهانێ پتر ژ شاهـ و دەستهەلاتدارێن مللەتان یان شەڕێن کرین ژبۆ پاراستنا کورسیکا خۆ.

هەژی گوتنێ یە کو ڤولتێر د پتریا بوچوونێن خودا نەکەسەکێ ڕەسەن بوو ژبەرکو وی بوچوونێن فەیلەسوفێن دی بەلاڤدکرن لێ وی ب شیانێن خۆ یێن مەزن گوهۆرین دڤان بوچووناندا کرن و ل فرەنسا و وەلاتێن دی یێن ئەوروپا بەلاڤکرن.

هەرچەندە گەلەك فەیلەسوفێن دیژی دگەل ڤولتێرێ بوونە ئەگەرێ بەلاڤبوونا تەڤگەرا ڕەوشەنگەرییێ وەك دیدیر و دلمبیر و ڕۆسو و مونتیسکیو لێ کارتێکرنا ڤولتێری ژ یا هەمیان مەزنتر و کویرتر بوو ژبەرکو شێوازی وی جوانتر و کاریگەرتربوو و بەرهەمێن وی پتربوون و زویتر هاتبوونە بەلاڤکرن، بۆ نموونە پەرتەکا "گیانێ یاسایان" یا مونتیسکیوی ل دوماهیا سالا 1748 هاتبوو بەلاڤکرن، ئێکەم گوتارا ڕۆسوی ل سالا 1755 هاتبوو وەشاندن و ئینسایکلوپیدیا دیدیری ل سالا 1750 بەلاڤبوو لێ نامەیین ڤولیتێری یێن ناڤدار ل دور سیستەمێ سیاسی ل ئینگلتەرا ل سالا 1734 هاتبوونە بەلاڤکرن.

هەرچەندە نوکە کێم کەس کارێن وی یێ، ئەدەبی دخوینن، ل چەرخێ هەژدێ کارێن وی ژ پێدڤی ڕەوشەنبیری بوو ژبۆ هزرمەند و فەیلەسوفێن وی سەردەمی، هەروەسا ڤولتێرێ کاریگەریەکا کویر ل سەر هزرمەندێن ئەمریکا ژی هەبوو وەك تۆماس جیفرسون و جێمس مادیسون و بنیامین فرانکلین.

دبیت جهێ سەیربیت ئەگەر ئەم وەکهەڤیەکێ دناڤبەرا ڤولتێرێ و هەڤدەمێ وی جان جاك ڕۆسوی دا بکەین، ڕاستە هەردوو دوو کەس بوون ب مێشکێ خۆ کاردکر، لێ ڕۆسوی کەسەکێ هەستدار ژی بوو بەلێ ڤولتێر هێزا بزوێنەر یا هزرێ بوو ل چەرخێ هەژدێ و کاریگەریا وی دوورتربوو لێ ژبەرکو ڕۆسو پتر یێ ڕەسەن بوو و هەتا نوکەژی بەرهەمێن وی ژ یێن ڤولتێرێ بهێزترن و پتر دهێنە خاندن.

## 75. جۆهانس کێپلەر Johannes Kepler

## (1571ز. – 1630 ز.)

### جۆهانس کپێلەر

### ئەو زانایێ یاسایێن لڤینا ئەختەران ل دور ڕۆژێ دانایین

زانایێ ناڤدار و دانەرێ یاسایێن لڤینا ئەختەران جۆهانس  کێپلەر ل سالا 1571 ل باژێرێ وێل دێرستاد یێ ئەلمانی ژدایکبوویە ئەوژی پشتی بورینا 28 سالاَن ل سەر بەلاڤبوونا پەرتووکا "زڤڕینا ستێرێن ئەسمانی ل دور تەوەرێ خۆ" یا زانایێ ناڤدار کوبەرنیکوسی کو دڤێ پەرتووکێ دا بۆ ئێکەم جار کوبەرنیکوسی دیارکربوو هەمی ئەختەر ل دور ڕۆژێ دزڤڕن نەك بەروڤاژی.

کێپلەری خاندنا خۆ یا ئەکادیمی ل زانکۆیا "توبنگین" ل سالا 1855 بدوماهی ئینا. زانایێن وی سەردەمی ب توندی دژی تیورا کوبرنیکوسی ڕاوەستیان و دانپێدان پێنەکر لێ پشتی کێپلەری ئەڤ چەندە زانی بریاردا ڤێ تیورێ بخوینیت و ل ڕاستیا وێ بگەرێت و ل دوماهیێ شیا باوەریێ پێ بینیت.

پشتی هینگێ کێپلەری باژێرێ توبنگین بجهـ هێلای وەك ماموستا ل ئەکادیمیا گراتس کارکر و ل وێرێ ئێکەم پەرتووکا خۆ ل دور گەردونی ل سالا 1596 بەلاڤکر. هەرچەندە ئەو تیورا کێپلەری دڤێ پەرتووکێ دا دانایی ب هیچ ڕەنگەکی یا دروست نەبوو لێ ڤێ پەرتووکێ شیانێن وی یێن ماتماتیکی یێن بێ سنور و ڕەسەنایەتیا هزرا وی دیارکرن تا وی ڕادەی زانایێ گەردونی یێ ناڤدار "تیچوو براهی" گەلەك ب شیانێن وی داخباربوو و ل سالا 1600 بریاردا وی بکەتە هاریکارێ خو یێ سەرەکی ل ڕۆانگەها خۆ.

ل سالا ل دووڤدا براهەی وەغەرکر و ئیمپراتۆرێ ڕۆدلفێ دووێ شاهێ ئیمپراتۆریا ڕۆمانی بریاردا کێپلەر ببیتە جهگرێ براهەی و د هەمان دەمدا ببیتە شیرەکاری ماتماتیکی یێ ئیمپراتۆری و کێپلەر ل سەر ڤی پۆستی ما هەتا وەغەرا دوماهیێ کری.

پشتی مرنا براهەی، هەمی راپۆرت و داتاییێن وی کەفتنە بەر دەستێ کێپلەری و ڤان راپۆرتان بهایەکێ گەلەك مەزن ل دەڤ کێپلەری هەبوو ژبەرکو پێزانینێن باش تێدا هەبوون.

دبیت د دیروکێ دا چ زانایێن گەردونی وەکو براهەی د زیرەك و هویربین نەبن دکارێ خۆ و ئەو دوماهیك زانایێ گەردونی یێ مەزن بەری داهێنانا ئامیرێ تێلسکوپێ. ب هاریکاریا ڤان راپۆرتان کێپلەر گەهشتە وێ باوەریێ کو ب تنێ ئەڤ پێزانین و داتاییێن براهەی لدویف خۆ هێلای دێ راستیا بابەتێ زڤرینا ئەختەران دیارکەت: ئەرێ کا ئەختەر ل دور رۆژێ دزڤرن هەروەکی کوبرنیکوس دیارکەت؟ یانژی ئەختەر ل دور عەردی دزڤرن هەروەکی بەتلیموس دیاردکەت؟ یانژی بوچوونا سییێ هەیە؟.

پشتی ڤەکۆلین و خواندنەکا دوور و کویر کێپلەر گەهشتە وێ باوەریێ کو داتاییێن براهەی دگەل ڤان هەردوو تیوران ناگونجن. کێپلەری دیارکر کو هەردوو زانایێن ئەڤ هەردوو تیورە داناین کەفتینە دشاشیەکێ دا ئەوژی وان هزردکر ئەو خۆلگەیا ئەختەر ل سەر دزڤرن ب شێوەیەکێ بازنەیی یە، لێ کێپلەری دیارکر شێوێ وان یێ هێلکەیی ئانکو نیمچە بازنەیی یە.

ل سالا 1609 کێپلەری پەرتووکەك بناڤێ "گەردونێ نوو" بەلاڤکر و تێدا یاسایێن ئێکێ و دووێ یێن زڤرینا ئەختەران دیارکرن و پشتی بورینا دەه سالان یاسایا سییێ ژی بەلاڤکر ئەوژی ب ڤی رەنگێ:

یاسایا ئێکێ: هەمی ئەختەر ب خۆلگەیەکا هێلکەیی ل دور رۆژێ دزڤرن.

یاسایا دووێ: زڤرینا ڤان ئەختەران بلەزتر لێ دهێت دەمێ پتر نێزیکی رۆژێ دبن.

یاسایا سییێ: هەرچەند ئەڤ ئەختەرە ژ رۆژی دوور بکەڤن دێ پێدڤی ب ماوەیەکێ درێژتر بن هەتا خۆلا خۆ تەمام بکەن.

سەرەرای وێ هویربینیا زانستی یا مەزن یا کێپلەر پێدڤی boوییێ ژبۆ دانانا ڤان یاسایان لێ ئەو نەشیا وێ چەندێ شرۆڤە بکەت کا بوچی ئەختەر ب شێوەیەکێ هێلکەیی ل دور رۆژێ دزڤرن تاکو ئەڤ ئاریشە ل سەردەمێ ئیسحاق نیوتنی هاتیە چارەسەرکرن لێ یاسایێن کێپلەری دەستپێکەکا هەرە گرنگ بوو ژبۆ نیوتنی هەتا شیایی یاسایێن خۆ پشتی

هینگێ بدانیت  هەر ژبەر هندێ ژی نیوتن ئاماژە ب هندێ دکەت کو ئەوی مفا ژ یاسایا و تیورێن گەلەك زانایێن یێن مەزن وەرگرتیە و کێپلەر ئێکە ژ وان زانایێن مەزن.

رۆلێ کێپلەری د زانستێ گەردونی دا ژ رۆلێ زانا کوبەرنیکوسی کێمتر نینە، ئاشکەراکرنا کێپلەری تا ڕادەیەکی کویتر و ڕەسەنتربوو ژبەرکو ئەو تووشی گەلەك ئاستەنگێن ماتماتیکی یێن مەزن بوو و ل سەر وی پێدڤی بوو ئەو ب تنێ وان ئاستەنگان چارەبکەت ژبەرکو هەتا وی سەردەمی ئامیرێ ژمێریارا ئەلیکترونی "حاسیبە" نەهاتبوو دروستکرن.

یا سەیربوو ئەوبوو ل وی سەردەمی یاسایێن کێپلەری ژلایێ گەلەك زانایێن فەلەکیڤە هاتبونە پشتگوهاڤێتن بتایبەت ژلایێ گالیلیڤە و ئەڤ چەندە ژی هەلویستەکی زێدە سەیرە ژبەرکو وان گەلەك جارا نامە بۆ ئێکو دوو فرێدکرن لێ هەکە گالیلی جارەکێ ب تنێ ژی گوهداریا تیورێن کێپلەری کر دا کارێن وی یێن گەردونی مەزنتر و کاریگەرتر بن و دا ب سانەهی هاریکاریا وی کەت بشێت تیورا بەتلیموسی دەربارەی زڤڕینا ئەختەران ل دور عەردی لادەت.

کێپلەری بخۆژی هەست ب هندێ دکر کو زانایێن دی گومان ژ کارێن وی هەیە و بوچوونێن وی لبەرچاڤ ناوەرگرن، لەوڕا ئاماژێ ب هندێ دکەت کو وی ئەڤ پەرتووکە یا نڤێسای و بۆ وی نەیا گرنگە کو کەسێن هەڤچەرخێ وی یان کەسێن ل دووڤدا دهێن بخوینن و بیت سەدەها سالێن دی ژ نوو هندەك کەس بهێن و ژ نوو ڤێ پەرتووکێ بخوینن هەروەکی کا چەوا خودایێ مەزن نێزیکی شەش چەرخان خۆ گرت هەتا شنی کەسەك هاتی و شیایی د ڕاستیا بابەتێ زڤڕینا ئەختەران ل دور ڕۆژێ بگەهیت و ئاشکەرا بکەت.

ژبەختڕەشیا کێپلەری ئەو ل وەلاتێ ئەلمانیا دژیا ل وی دەمێ شەڕێ 30 سالی لێ پەیدابووی و ئەڤ چەندەژی بۆ وی یا بزەحمەت بوو بشێت مووچێ خۆیێ هەیڤانە بدەستڤە بینیت ژبەرکو ئیمپراتۆرێن ڕۆمانی بزەحمەت مووچێ وی بۆ فرێدکر خو وەختێ ئیمپراتوی د زەنگیترین سەردەمێ خۆدا ژی.

هەردیسا وان دەیکا وی ب گونەهیا سێربەندیێ زیندان کربوو و وی گەلەك زەحمەت و نەخۆشی دیتن هەتا شیایی دەیکا خۆ ڕزگار بکەت چونکی لوی سەردەمی هەر

کەسەکێ ب تومەتا سێربەندییێ هاتبا گرتن سزایێ وی نقوومکرن دئاڤێ دا یانژی سووتن بوو.

کێپلەری دوو جاران ژیانا هەڤژینییێ پێکئینایە و 12 زاروك هەبوون، ل سالا 1630 ل باژێرێ ڕیگنسبۆرگ وەغەرا دوماهییێ کرن هەرچەندە پشتی هینگێ گورێ وی هاتە ژناڤبرن لێ ئەو یاساییێن وی دانایین هەتا هەتا دێ مینە ساخ.

## 76. ئێنرێكو فێرمی Enrico Fermi

## (1901ز. – 1954ز)

### ئێنرێكو فێرمی

### ئەو زانایێ دیزاینا ئێكەم بۆمبا ئەتومی دانایی

ئێنرێكو فێرمی كو دهێتە هەژمارتن ئێكەم كەسێ كارلێكێن نافكی دیزاینكری. ل سالا 1901 ل باژێرێ ڕۆما ژدایكبوویە، هەر ژ زاروكینیا خۆ كەسەكێ زیرەك و بیرتیژبوو و دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 20 سالێ شیا بروانامە دكتورایێ دیوارێ فیزیایێ دا ل زانكۆیا بیزا بدەستڤە بینیت و دەمێ ژیێ وی بوویە 26 سالی وەك پرۆفیسور ل هەمان زانكۆ هاتە دامەزراندن و هەر دڤی دەمی دا ئێكەم ڤەكۆلینا و گرنگترین ڤەكۆلینا بەلاڤكر.

ئەڤ ڤەكۆلینا وی بۆ ئەگەرێ ڤەكرنا لقەكێ نوو یێ فیزیایێ ئەوژی ئامارا كوانتەمی. دڤێ ڤەكۆلینا خۆدا فێرمی تیورەكا سەرژمێریاری یا نوو پێشئێخست ژبۆ شرۆڤەكرنا چەوانیا لێكخڕڤەبوونا دندكێن هەر ماددەیەكی كو ل سەردەمێ ئەڤروكە ئەڤ دندكە دهێنە ناڤكرن ب فێڕمیون. هەردیسان وی دیاركر ئەلیكترون و پرۆتون و نیوترۆن ژی فێڕمونن كو دهێنە هەژمارتن بەرێ بنیاتێ پیكهاتنا هەر ماددەیەكی. ئەو هاوكێشەیێن فێرمی داناین بوونە ئەگەر ئەم باشتر پێزانینان دهندەك بواریاندا بدەستڤە بینین وەك سرۆشتێ پێكهاتنا نافكا گەردیلێ و چەوانیا شرۆڤەبوونا ماددان هەروەكی وێ شرۆڤەبوونا دناڤ كویراتیا ستێران و تایبەتمەندییێن ماددێن كانزایی.

ل سالا 1933 فێرمی تیورەكا نوو دەربارەی شرۆڤەبوونا گەردیلێ كو جورەكە ژ چالاكیا تیشكی دانا. ئەڤ تیورە دهێتە هەژمارتن ئێكەم گەنگەشا سەرژمێریاری دەربارەی كارلێكێن هێواش و لاواز دناڤ نافكێن گەردیلاندا، ئەڤ بابەتێ فێرمی د ڤەكۆلینێن خۆدا گەهشتیێ نە هند یێ ب سانەهی بوو كو كەسێن ئاسایی تێبگەهن ژبەر هندێ هەر ئەڤ تیورە بۆ ئەگەر فێرمی ببیتە ئێك ژ زانایێن فیزیایی یێن ناڤدارو سەردەم لێ مەزنترین داهێنانا هەتا ڤی دەمی ژی نەهاتبوو دیاركرن.

ل سالا 1932 زانایێ برِیتانی "جێمس چادویك" پێكهاتنەكا دی یا گەردیلێ ئاشكەرا كر كو ئەوژی نیوترۆن بوو. ل سالا 1934 شیا نیوترۆنی بۆ سەر پترِیا وان ماددێن كیمیایی یێن هاتینە ئاشكەراكرن بدانیت. هەر ئەڤ چەندە بوو ئەگەر ئەو پترِیا جاران بگەهیتە وی ئەنجامی كو ئەو گەردیلەیێن ژ ڤان كارلێكێن كیمیایی دەردكەڤن چالاكیەكا تیشكی یا هەی. دبیت هندەك كەس هوسا هزربكەن كو هاڤێتنا نیوترۆنێ بۆ سەر گەردیلەیان دێ بیتە ئەگەرێ سووتنا وان ئەگەر لەزاتیا نیوترۆنێ یا زێدەبیت لێ فێرمی ئاشكەراكر كو بەروڤاژی ڤێ چەندێ راستە.

ئەوژی ئەگەر ئەم شیاین لەزاتیا لڤینا نیوترۆنێ كێم بكەین ئەوژی ب رێكا بوراندنا وێ دناڤ ناڤەندەكێ پارافینێ یان یێ ئاڤێ، گەردیلە دێ پتر شێن نیوترۆنان مێژن و هەلگرن. ئەڤ ئاشكەراكرنە بوونە ئەگەر فێرمی بشێت دیزاینا ئێكەم بومبا ئەتومی بدانیت. ئەو ماددەیێن دهێنە بكارئینان د كارلێكێن ئەتومی دا بۆ هێواشكرنا لڤینا نیوترۆنێ ئەون یێن دهێنە نیاسین ب ماددێن ناڤەندگێر.

ل سالا 1938 ڤەكۆلینا فێرمی ل دور مێژینا نیوترۆنان بوو ئەگەر ئەو خەلاتێ نۆبل دبوارێ فیزیایێ دا بدەستخۆڤە بینیت. ژلایەكێ دیڤە گەلەك ئارِیشە ل وەلاتێ ئیتالیا بۆ وی پەیدابوون، ژبەركو خێزانا وی جوهی بوو و حكومەتا موسولینی بریارێن توند دژی جوهیان دەركرن و ڤێ چەندێ ئەو نەچاركر دژی بریارێن ڤێ حكومەتێ ب راوەستیت لەورا ژی دەمێ چوویە باژێرێ ستوكهۆلم ژبۆ وەرگرتنا خەلاتێ نوبل بریاردا ئێدی نەڤەگەریتە وەلاتێ ئیتالیا بەلكو ل دووڤدا ئێكسەر چوو باژێرێ نیویورك و ل زانكۆیا كۆلومبیا وەك ماموستا دەستبكاربوو هەتا سالا 1944 شیایی رەگەزناما ئەمریكی بدەستخوڤە بینیت.

ل سالا 1939 ڤەكۆلینەك ژلایێ هەرسێ زانایێن "لیز مایتنەر" و "ئوتوو هان" و "فریتز ترِاسمان" هاتە بەلاڤكرن و دیاركربوو كو مێژینا نیوترونێ هندەك جاران دبیتە ئەگەرێ كەرتبوونا گەردیلەیێن یورانیومێ. پشتی بەلاڤبوونا ڤێ ڤەكۆلینێ ژبۆ فێرمی و گەلەك زانایێن دی یێن فیزیایی دیاربوو كو گەردێن یورانیومی یێن كەرتبووی رەنگە ببیتە ئەگەرێ هاڤێتنا هژمارەكا نیوترونان كو تێرا هندێ بكەن زنجیرەكا كەرتبوونێن نافكی پەیدابن.

ل ئادارا 1939 فێرمی پەیوەندی ب هێزا دەریایی یا ئەمریکا کر و بزاڤکر هاریکاریا وان ب دەستڤەبینیت ژبۆ پێشخستنا ڤان جورە تاقیکرنان ژپێخەمەت بکارئینانا وان ژبۆ دروستکرنا چەکێ ئەتومی لێ وان ئەڤ داخازیا وی بجهـ نەئینا هەتا بورینا چەند هەیڤەکان دەمێ زانا ئەلبێرت ئەنیشتاینی نامەك ل سەر هەمان بابەت ژبۆ سەروکێ ئەمریکا یێ وی سەردەمی ڕۆزەلفێتی هنارتی و ل دووڤدا حکومەتا ئەمریکا پشتەڤانیا وان بۆ ڤی پرۆژەی کر.

پشتی حکومەتا ئەمریکا بریارداى پشتەڤانیا ڤی پرۆژەی بکەت وان بریاردا فێرمی ببیتە سەرکێشی ڤی پرۆژەی ژبەرکو لوی سەردەمی ئەو ناڤداترین زانابوو ل سەر نیوترۆنان کاردکر و ئەو شیابوو شیانێن خۆ یێن تیوری و پڕاکتیکی پێکڤە بکاربینیت. فێرمی هاتە هاتە هەلبژارتن ژبۆ دروستکرنا ئێکەم بۆمبا ئەتومی ل جیهانی.

لدەستپێکێ وی دگەل زانکۆیا کۆلومبیا کارکر و پاشی دگەل زانکویا شیکاگو. ل ڕێکەفتی 2 کانوونا ئێکێ یا سالا 1942 فێرمی شیا کارێ خۆ ب سەرکەفتیانە ب دوماهی بینیت. پشتی بدوماهی هاتنا شەڕێ جیهانی یێ دووێ ل سالا 1944 فێرمی وەك پرۆفیسور ل زانکۆیا شیکاگو هاتە وەرگرتن و هەر ما دڤی پۆستی دا هەتا ل سالا 1954 وەغەرکری.

فێرمی ژیانا هەڤژینیێ پێکئینابوو و دوو زاروك هەبوون. وەك ڕێزگرتن ژبۆ خزمەتا وی یا هەرە مەزن، زانایان تۆخمێ کیمیایی یێ ژمارە 100 ب ناڤێ وی "فێرمیوم" نافکر.

فێرمی ژبەر چەند ئەگەران دهێتە هەژمارتن ئێك ژ زانایێن مەزن و بلیمەت. بێ گومان ئەو دهێتە هەژمارتن مەزنترین زانایێ چەرخێ بیستێ ژبەرکو ئەو د هەردوو بوارێن تیوری و پڕاکتیکی دا ژهەمیا پێشکەفتیتربوو، هەرچەندە ب تنێ ئاماژە ب هندەك ژ کارێن وی دڤێ گوتارێ دا هاتیە کرن لێ دڕاستی وی پتر ژ 250 ڤەکۆلینێن نایاب بەلاڤکرینە.

ژلایەکێ دیڤە سەرەڕای پشکداریا گەلەك زانایێن دی د پرۆژێ دروستکرنا چەکێ ئەتومی دا، لێ ڕۆلێ وی ژ یێ هەمی زانایان کاریگەرتر و چالاکتربوو.

گرنگترین سەرکەفتنا فێرمی ژهندێ هات کو ئەو ئێکەم کەس بوو شیایی دیزاینا کارلێکێن گەردی بدانیت زێدەباری ئەو خودانێ هەمی وان تیوران بوو یێن بنیاتێ دروستکرنا بومبێن ئەتومی ل سەر هاتینە دانان.

هەرچەندە ئەڤە ژ سالا 1945 وەرە چەکێ ئەتومی د شەڕاندا نەهاتیە بکارئینان لێ دگەل هندێ ئەڤ چەکە ل هەر پێنج کێشوەران هاتیە دروستکرن و ڕۆژ بۆ ڕۆژێ گرنگیا وی پتر لێ دهێت ژبۆ جهگرتنا ژێدەرێن تێهنێ یێن کلاسیکی. هەردیسان د سەردەمێ ئەڤروکە دا هندەك ژ ڤان کارلێکێن گەردی ژبۆ هندەك مەرەمێن پزیشکی و ڤەکۆلینێن زانستی دهێنە بکارئینان.

ئەڤ کارلێکە ژێدەرێ سەرەکی یێ دروستکرنا تۆخمێ بلوتونیومی نە کو دهێتە بکارئینان ژبۆ دروستکرنا بۆمبێن ئەتومی لەورا ترسەکا مەزن کو ڕۆژەکێ ئەڤ چەکە دووبارە ژبۆ مەرەمێن شەڕی بهێتە بکارئینان و کارەساتێن مەزن لدویڤ خۆدا بینیت لێ دگەل هندێ کەس نەشێت گرنگیا ڤان کارلێکان لادەت لەورا ژی ڤێ داهێنانێ کاریگەریەکا مەزن ل سەر دیروکا مرۆڤایەتیێ کریە.

## 77. ليونارد ئويلەر Leonhard Euler

## (1707ز. – 1783ز.)

### ليونارد ئويلەر

### ئەو زانايێ هژمارەکا مەزن یا هاوکێشەیێن ماتماتیکێ دانایین

زانایێ ماتماتیك و فیزیایی یێ سویسری لیونارد ئویلەر ئێکە ژ وان زانایێن کاریگەریەکا هەرە مەزن ل پاش خۆ هێلای، زانایان ب سینگەکێ بەرفرەهـ پێشوازی ل ڤەکۆلین و داهێنانێن وی دبوارێ فیزیای و ئەندازیایێ دا کر. لێ ڤەکۆلین و بەرهەمێن وی یێن ماتماتیکی و زانستی هند گەلەکن مرۆڤ نەشێت ب سانەهی باوەربکەتز

وی پتر ژ 32 پەرتووکێن قەبارێ مەزن بەلاڤکرینە کو هندەك ژ ڤان پەرتووکان ژ چەندین بەرگان پێکدهات، هەردیسان وی ب سەدەها گوتارێن زانستی ل دور ماتماتیکێ و بوارێن دی یێن زانستی بەلاڤکرینە. ئەم دشێن بێژین کو هەمی بەرهەمێن وی د 70 بەرگاندا دا هاتینە کومکرن و ئەڤ چەندە بوو ئەگەرێ زەنگینکرنا بوارێ ماتماتیکێ، هەردیسان کاریگەریا وی ل سەر پێشخستنا بوارێ فیزیایا پراکتیکی یا بێ دوماهیك بوو.

ڤەکۆلینێن ئویلەری هاریکاریا وی کر ئەو بشیت مفای ژ یاسایێن میکانیکی وەبگریت ئەوێن ژلایێ ئیسحاق نیوتنی ڤە هاتینەدانان داکو د هندەك حالەتێن تایبەت یێن فیزیایی دا بجهـ بینیت، بۆ نموونە بجهئینانا یاسایێن نیوتنی بۆ شرۆڤەکرنا چەوانیا لڤینا شلەمەنیان و ب ڤێ چەندێ ئەو شیا هاوکێشەیا هایدرودینامیکی کو پەیوەندی ب لڤینا شلەمەنیاڤە هەیە پێشبێخیت.

هەردیسان ئویلەر شیا هندەك هاوکێشەیێن نوو بدانیت کو ب رێکا وان دشێت ب شێوەیەکێ دروست لڤینا ماددێن رەق دیاربکەت کو د راستی دا چ māddە ب تەمامی د رەق نینن. ئویلەری شیا هندەك تیبینین گرنگ ل دور تیورا جیری یانژی لاستیکی یا māddەیان دیاربکەت ئەوژی ب رێکا هندێ کو دشیاندایە شێوێ هەر māddەیەکی بهێتە گوهۆرین ئەگەر هات و بکەفتە بەر هێزەکا دەرەکی.

ژلایەکێ دیڤە ئویلەر شیا هندەك هاوكیشەیان دبوارێ فیزیا شیكاری دا ب بدانیت ئەوژی ژبۆ شرۆڤەکرنا لڤینا ڕۆژ و عەرد و هەیڤێ و کا چەوا لڤینا وان وان هەرسێکان پەیوەندی پێکڤە هەیە و کا چەوا هەر ئێك کارتێکرنێ دکەتە سەر بوارێ موگناتیسی یێن دی و هەتا نوکەژی ئەو ئارێشە نەهاتیە ب شێوەیەکێ زانستی نەهاتیە شرۆڤەکرن، د هەمان دەمدا ئویلەر ئێکەم زانابوو ل چەرخێ هەژدێ شیای شرۆڤەکرنەکا زانستی بدەتە ڕۆناهی و لڤین و چەوانیا بەلاڤبوونا وێ.

دبوارێ ماتماتیکێ دا، پترِیا هاوکێشەیێن ماتیماتیکی ب ناڤێ ئویلەری هاتینە نافکرن ب تایبەت دبوارێ فیزیا و کارەبا موگناتیسی. پترِیا داهێنانێن ئویلەری دبوارێ ماتماتیکێ دا بوون کو ئەڤەژی بوارەکێ هەرە گرنگ یێ زانستی یە لێ دبیت تا ڕادەیەکی یا ب زەحمەت بیت بەحسێ ڤان داهێنان دڤێ پەرتووکێ دا بکەین ب تایبەت وان داهێنانێن پەیوەندی ب جووداکاری و تەواوکاریێ ڤە هەی.

ژلایەکێ دیڤە وی گەلەك ڤەکۆلین د بوارێن ئەندازیاری یا ئاسایی و ئەندازیاریا شیکاری دا بەلاڤکرینە و ئێکەم کەس بوو هژمارەکا مەزن یا هێمایێن زانستی د هاوکێشەیێن ئەندازەیی و ماتماتیکێ دا بکارئینایێن.

ئویلەر ل سالا 1707 ل باژێرێ "بازل" ل سویسرا ژدایکبوویە، ل سالا 1720 چوویە زانکۆیێ کو هێشتا ژیێ وی 13 سالێ بوون. لدەستپێکێ زانستی ئایزانیێ خواندیە لێ هەر زوی دەست ژڤی زانسنی بەردا و بەرەڤ خواندنا ماتماتیکێ ڤە چوو و دەمێ ژیێ وی بووینە 17 سالێ شیا پلا ئێکێ دڤی بواری دا بدەستڤەئینا و دەمێ ژیێ وی بوویە 20 سالێ هاتە داخازکرن ژلایێ شاهژنا ڕۆسیا "کاترینا ئێکێ" داکو ل ئەکادیمیا زانستان کاربکەت و دژیێ 23 سالێیێ دا بوو ماموستایێ فیزیایێ ل ڕۆسیا و دژیێ 26 سالێیێ دا شیا جهێ زانایێ ماتماتیکێ یێ ناڤدر "دانیال برتولی" بگریت.

پشتی دوو سالێن ل دووڤدا، ئویلەری بیناهیا چاڤەکێ خۆ ژدەستدا لێ ڤێ چەندێ کارتێکرن نەکرنە سەر کارێ وی ژبەرکو ئەو یێ بەردەوام بوو ل سەر ئەنجامدانا ڤەکۆلینان. ل سالا 1741 ژلایێ ئیمپراتۆر فریدریکێ مەزن شاهێ پرۆسیا هاتە داخازکرن داکو ل ئەکادیمیا زانستی ل بەرلینێ کاربکەت و بۆ ماوێ 25 سالان ل وێرێ کارکر تاکو

دووباره ل سالا 1776 ڤەگەریایە ڕۆسیاڤە و پشتی هینگێ ب دەمەکێ کێم بیناهیا چاڤێ خۆ یێ دیڕی ژدەستدا.

ئویلەری شیانێن باش و بێهنفرەهیەکا مەزن هەبوو ل سەر شرۆڤەکرنا هاوکێشەیێن ماتماتیکی یێن ئالۆز، ئەو یێ بەردەوام بوو ل سەر بەلاڤکرنا بابەتێن زانستی هەتا دژییێ 76 ل سالا 1783 وەغەرکری.

ئەم دشێن بێژین کو هەمی ئەو تیورێن ئویلەری داناین دبیت پشتی هینگێ ژی هاتبانە ئاشکەراکرنن لێ پرسیار ئەوە ئەرێ هەتا چ ڕادە ئەڤ تیورە بووینە ئەگەرێ گوهۆرینا ڕۆیێ زانستی و تا چ ڕادە زانست پێش ئێخستیە؟.

هەلبەت بەرسڤ ژی ئەوە کو پێشکەفتنا زانستێ سەردەم و بجهئینانێن ماتماتیکی بۆ ماوەیەکێ درێژ دا گیروبن تایبەت ئەگەر ئویلەری ئەڤ هژمارا مەزن یا هاوکێشەیێن ماتماتیکی نەدانابان و بۆ پشت ڕاستبوون ل سەر ڤێ چەندێ ئەم دشێن ڤەگەرینە پەرتووکێن ماتماتیکێ کو دێ بینین گەلەك هاوکێشەیێن ئالۆز ب ناڤێ وی هاتیە ناڤکرن.

سەرەڕای ڤان کارێن وی یێن مەزن دبوارێ ماتماتیکا تیوری و پراکتیکی دا، لێ مە ناڤی وی ل ڤی جهێ بلند یێ لیستا کەسێن کاریگەر دانایە، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤریت کو ئویلەر نەشیابوو هاوکێشەکا ب تنێ ژی بدانیت بەلکو ئەو هاوکێشەیێن وی داناین ب هەڤکاری دگەل هندەك کەسێن دی بوو یانژی ژ دەرئەنجامێ خواندنا ڤەکۆلین و کارێن زانایێن دی بوو لێ دگەل هندێ ژی سەرکەفتنێن وی یێن مەزن د هەروو بوارێن ماتماتیك و ئەندازیاریێ دا ب چ ڕەنگان ناهێنە ژبیرکرن.

## 78. جان جاك ڕۆسو Jean Jacques Rousseau
## (1712ز. – 1778ز.)

### جان جاك ڕۆسو

### ئەو فەیلەسوفێ بوو یێ هزروبیرێن وی بووینە ئەگەرێ پەیدابوونا شۆرەشا فرەنسی

فەیلەسوفێ فرەنسی یێ ناڤدار جان كاك ڕۆسو ل سالا 1712ل باژێرێ "جنێف" یێ سویسری ژدایكبوویە. پشتی ژدایكبوونا وی ئێكسەر دەیكا وی وەغەركریە و دەمێ ژیێ وی بویە 10 سالێ ژی بابێ وی باژێرێ جنێف بجە هێلا و ئەو ب تنێ هێلا ل وێرێ، لێ دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 16 سالییێ ویژی باژێرێ جنێف بجە هێلا.

بۆ ماوێ چەندین سالان ژیانا ڕۆسوی نەیا جێگیربوو ژبەركو بەردەوام ژ باژێرەكێ د چوو باژێرەكێ دی و ژ كارەكی بەرەڤ كارەكێ دی دچوو، ئەڤ گەریانێن وی یێن بەردەوام بوونە ئەگەر كو وی گەلەك چیرۆكێن ئەڤینیێ هەبن. چیرۆكا ژ هەمیا ناڤدارتر، ئەڤینداریا وی بوو دگەل خانم "تێریز لیفاسر" كو بۆ ماوەیەكێ درێژ دگەل ژیا و پێنج زاروكێن نەیاسایی ژێ هەبوون و هەمی ژی فرێدكرنە بنگەهێن بخۆدانكرنا ئێتیمان لێ دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 55 سالییێ ژ نوو بشێوەیەكێ فەرمی ژیانا هەڤژینییێ دگەل تێریزێ پێكئینا.

ل سالا 1750 ئانكو دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 38 سالان بەرەڤ جیهانا ناڤداریێ چوو ئەوژی پشتی زانكۆیا دیگون بەریكانەك ڕێكخستی و ڕۆسو تێدا بوویە سەركەفتیێ ئێكێ، پرسیارا بەریكانا وان ژی ئەوبوو ئەرێ كیژ بابەت گرنگترە بۆ مرۆڤایەتیێ: زاست یان ژی هونەر؟ ڕۆسوی بەشداری ب گوتارەكێ كر و تێدا دیاركربوو كو پێشكەفتنا زانست و هونەری ئێدی مفایی ناگەهینە مرۆڤایەتیێ.

ئەڤ بوچوونا وی یا جودا بۆ ئەگەر بناڤودەنگ بكەڤیت و بوو ئەگەر پشتی هینگی گەلەك ڤەكۆلینین دی ل سەر ڤی بابەتی بهێنە ئەنجامدان وەك: گوتارەك ل دور بنیاتێ زولمداریێ ل سالا 1755 و هەلویزا نوو ل سالا 1761 و ئەمیل ل سالا 1762 و گرێكا جڤاكی ل سالا 1762 و دانپێدان ل سالا 1770و ئەڤ بەرهەمە بوونە ئەگەر پتر گرنگی ژلایێ ڕەوشەنبیر و دیروكنڤێسێن وی سەردەمی و هەتا نوكە لێ بهێتە گرتن.

هەرچەندە ڕۆسو هەڤالێ نێزیك یێ دوو ژ مەزنە زانایێن تەڤگەرا ڕەوشەنگەریێ ل فرەنسا بوو کو ئەوژی ئەنیس دیدیر و جان دالمێر بوون، لێ ژبەر هزروبیرێن وی یێن هەڤدژ هەر زوی هەڤالێنیا وان بەرەڤ نەمانێ چوو.

دەمێ ڕۆسوی نەڕازیبیوونا خۆ دیارکری دژی وێ داخازیا ڤۆلتێری کری ژبۆ دانانا شانویەکێ ل باژێرێ جنێف، ئەڤ چەندە بوو ئەگەر دوژمناتیەکا دژوار دناڤبەرا واندا پەیدابیت. ئەگەرێ ڤێ نەڕازیوبونێ ئەوبوون کو ڕۆسوی هزرکر شانو قوتابخانەیەکا ڕەزیلە، ڕۆسوی پشتەڤانیا هەست و سوزان دکر لێ ڤولتێر پشتەڤانیا مێشك و لوژیکی دکر.

ل سالا 1762 کو ل وی سەردەمی پەیوەندیا ڕۆسوی دگەل بەرپرسێن وەلاتی د ئاستەکێ نەباش دا بوون، بوچوونێن وی یێن سیاسی دژی هەمی کەسان بوون لەوڕاژی گەلەك هەڤالێن وی یێن نێزیك ژێ دوورکەفتن، بڤێ چەندێ ڕۆسوی هەستپێکر ئەو کەسەکێ پشتگوهاڤێتی و نەخۆشتڤیی یە ل دەف هەمیان. هەرچەندە گەلەك کەسان ژی حەز ژ ڕۆسوی دکر لێ ئەو ب هەمی وان تشتێن گوهلێدبوو یان ب چاڤ ددیتن ب گومان دکەفت ژبەر هندێ ژی بو ماوێ 20 سالێن ل دووڤدا دکاودانێن دەروونی یێن بەرتەنگدا ژیا هەتا ل سالا 1778 ل باژێرێ "ئەرمتونفیل" ل فرەنسا وەغەرکری.

پتریا دیروکنڤێسان دگەل هندێ نە کو پەرتووکێن ڕۆسوی بووینە ئەگەرێ ژدایکبوونا سوشیالیست و علمانیەت و ڕۆمانسی و دیکتاتوری و شۆڕەشا فرەنسی، زێدەباری گەلەك مەزهەبێن دیموکراتی و دادپەروەریا جڤاکی و تیورێن پەروەردە و فێرکرنێ.

ئەو بوچوونا دبێژیت کو مرۆڤ کورێ ژینگەها خۆیە دهێتە هەژمارتن ژ کارێن هەرە سەرکەفتی یێن ڕۆسوی. ڕۆسو ئێك ژ وان کەسان بوو یێن بانگەوزایا هندێ دکری کو زانست هەمی خراپیە و پێشکەفتنا زانستی زیان گەهاندیە مرۆڤایەتیێ ژبەر هندێ وی پشتەڤانیا هندێ دکر مرۆڤ ڤەگەرنە ژیانا دەستپێکی. ڕاستە ئەو بەرپرسیاربوو ژ ڤان بوچوون و مەزهەبان و ژبەر هندێ مە ناڤێ دانایە دڤێ ڕێزبەندێ دا لێ پتریا ڤان بوچوونان نە ژ کەربوکینا ڕۆسوی بوون بەلکو هندەك ژ وان بدویف ویڤە هاتینە نان یانژی شرۆڤەکرنەکا شاش بۆ هاتیە کرن.

بۆ نموونە گوتنا دبێژیت مرۆڤێن دەستپێکی مرۆڤێن باش و خانەدان بوون، لزار دەڤێ وی نەهاتیە گوتن و ئەو خودانێ ڤێ گوتنێ نەبوویە و وی چ ڤیان و حەژێکرن یانژی

ڕێزگرتن بۆ مرۆڤێن دەستپێکی ئەوێن ل سەر دەریایێن باشوری یانژی هندوکێن سۆر نەبوو، بەلکو دەبرینا ڤێ ئاخفتنێ ل دەف هوزانڤانێ ئینگلیز "جۆن دریدن" کو بەری وی ب 100 سالان ژیابوو هاتبوو دیتن.

هەردیسان ڕۆسو ئەو کەس نەبوو یێ جڤاك ب هندێ گونەهباردکر کو جڤاکەکێ خراب و گەندەلە، بەلکو بەروڤاژی ڕۆسوی هوسا هزدکر کو جڤاك گەلەك یێ گرنگە بۆ مرۆڤان.

هەردیسان بوچوونا "گرێکا جڤاکی" نە کارێن ڕۆسوی بوو بەلکو فەیلەسوفێ ئینگلیز "جۆن لوکی" بەری ژدایکبوونا ڕۆسوی بەلاڤکربوو، دهەمان دەمدا فەیلەسوفێ ئینگلیز "تۆماس هوبز"ی ب شێوەیەکێ تێروتەسەل تیورا گرێکا جڤاکی بەری جۆن لوکی ژی گەنگەشەکربوو.

لێ دژایەتیا ڕۆسوی بۆ پێشکەفتنا زانستێ سەردەم، ئەگەرێ وێ بۆ هندێ دزڤڕی کو ئەو هەردوو چەرخێن بەری ڕۆسوی هندەك پێشکەفتنێن زانستی یێن مەترسیدار پەیدابوون، لێ دژایەتیا مرۆڤان بۆ پێشکەفتنێن زانستی ئەگەرێ وان ڕۆسو نەبوو بەلکو ئەگەر ئەو نەخۆشی بوون یێن مرۆڤان ژ شەڕ و کوشتن و پیسبوونا ژینگەهێ و ژناڤچوونا ساخلەمیا گشتی دزڤڕیت.

گوتنا دبێژیت ژینگەهێ کاریگەریەکا مەزن ل سەر مرۆڤان هەیە، ئەڤ گوتنەژی ژلایێ ڕۆسوی ڤە نەهاتیە گوتن بەلکو لبەری وی گەلەك هزرمەندێن وی ئەڤ چەندە یا گەنگەشە کری، گوتنا دبێژیت کو هەڤڕکیێن نەتەوەیی ئەگەرێن ژدایکبوونا هزروبیرێن وینە، نەبوچوونا وی بوو بەلکو نەتەوەیی و نیشتیمان پەروەری هندەك بوچوونێن کەڤن و ب هانە و ڕۆسوی چ تشتێ نوو ل سەر ڤان بوچوونان زێدەنەکریە.

ئەرێ ڕاستە کو هزرو بوچوونێن ڕۆسوی بووینە هاریکار کو شۆڕەشا فرەنسی بهێتە هەلکرن؟ گومان تێدا نینە بوچوونێن وی کاریگەریەکا مەزن ل سەر دەستپێکرنا ڤێ شۆڕەشێ هەبوون پتر ژ بوچوونێن دیدێر و دالمبیری لێ بوچوونێن ڤولتێری بوونە ئەگەرێ دەستپێکرنا هەمی تشتان لەوڕا کاریگەریا وان ژی یا مەزنتربوو.

یا ڕاست ئەگەر ئەم بێژین کو ڕۆسو دژی هەمی هەڤڕکیێن لوژیکی بوو، هەلبەت ئەو تنێ دژی ڤێ چەندێ نەبوو بەلکو گەلەك ڕێبازێن ئاینی و هونەری و شعری ژی دژی ڤێ چەندێ بوون و ئەڤە هەمی ژی لبەری ڕۆسوی هەبوون.

دڤێت ئەم وێ چەندێ ژبیرنەکەین کو ڕۆسو بوویە ئەگەرێ هەودانا هەست و سوزان، هەردیسان بوویە ئەگەر پتر گرنگی ب پەروەردەکرنا زاروکان بهێتە دان ویا پێدڤیە ئەم دگەل هەستێن وی باغڤین بەری کو دگەل مێشکێ وی باغڤین. ڕۆسو ئێکەم کەس بوو بانگەوزایا هندێ دکر کو دڤێت زاروك بۆ دەمەکێ درێژ لبەر سینگێ دەیکا خۆ و دهەمبێزا وێ دا بمینیتن هەلبەت تشتەکێ سەیرە زەلاَمەك ژ حەژێکرنا دەیکوبابان یێ بێ بەهر بیت و ژ بەختەوەری ژ زاروکینیا خۆ نەدیت بیت و داخازێ ژ خەلکی بکەت گرنگییێ ب زاروکێن خۆ بدەن، دبیت مەرەما وی ئەو بیت کو زاروك دوان نەخۆشیانڕا نەبون یێن ئەو تێرا بوری.

گەلەك بوچوونێن دی یێن ڕۆوسی هەنە جهێ مەندهوشییێ نە وەکی بوچوونێن وی ل دور یەکسانییێ، هەمی مرۆڤ ب ئازادی ژدایکبوونە لەورا دڤێت هەمی ب ئازادی بژین و لبەرامبەرێ یاساییێ د وەکهەڤ بن و ئەو مافێ وان بهێت پاڕاستن. هەردیسان ئەو خودانێ وێ گوتنێ یە یا دبێژیت "خەلك ب ئازادی ژدایك دبن لێ ل هەمی جهان ب کەلامچان دهێنە گرتن.

بوچوونێن وی ل دور خاوەنداریێ د هەڤدژبوون ژبەرکو ل جارەکێ دبێژیت ئەو هندەك تشتێن پیروزن ول جهەکێ دی دبێژیت خاوەندارێن تایبەت و مەزنکرنا وان شەڕەکێ مەزنە چ شەڕ پشتی وی نینن. بوچوونێن بڤی ڕەنگی بووینە ئەگەرێ پەیدابوونا سوشیالیست و شوعیەتێ.

دیروکنڤێس ڕەخنێ ل ڕەفتارێن وی دگرن کو کەسەکێ زێدە تۆرەبوو و تا ڕادەیکێ مەزن کەرب ژ زەلامان ڤەدبوون و پتریا بوچوونێن وی نەدپڕاکتیکی بوون لێ دگەل هندێ ژی ئەو شیایە کاریگەریەکا کویر و درێژ د تیورێن سیاسی و پەروەردەیی ل هەردوو چەرخێن بوری دا بکەت.

## 79. نیكۆلۆ ماكیاڤیللی Niccolo Machiavelli

## (1469ز - 1527ز)

### نیكولو ماكیاڤیللی

### ئەو فەیلەسوفێ پێدڤیە هەمی سەركردە پەرتووكا وی یا بناڤێ "میر" بخوینن

فەیلەسوفێ سیاسی یێ ئیتالی نیكولو ماكیاڤیللی ب هندێ یێ ناڤدارە د پەرتووكەكێ دا هندەك شیرەتێن دیار و ئاشكەرا پێشكێشی دەستهەلاتداران كرینە، دەستهەلاتدار داكو بشێن دەستهەلات و هێزا خۆ بپارێزن و زێدەبكەن و كونترۆلێ ل سەر مللەتێ خۆ بكەن پێدڤیە پەنایێ بەنە بەر خاپاندن و فەندوفێل و درەوان زێدەباری ب كارئینانا هێزەكا بێ دلوڤانی بەرامبەر خەلكی و دوژمنان.

هەرچەندە پتریا دیروكنڤێسان ماكیاڤیللی ب هندێ گونەهباردكەن كو ئەو فەیلەسوفەكێ بێ ووژدانە لێ گەلەك كەسێن دیژی وی ب كەسەكێ ڕاستخوازێ دلڕەق دبینن كو شیایە جیهانێ ب شێوێ وێ یێ ڕاستەقینە بدەتە دیاركرن. لێ دگەل هندێ ژی ئێكە ژ وان فەیلەسوفێن ناڤدار یێن پەرتووكێن وی ب شێوەیەكێ هویربین ژلایێ فەیلەسوف و سیاسەتمەدارانڤە دهێنە خواندن.

ماكیاڤیللی ل سالا 1469 ل فلورەنسا، ئیتالیا ژدایكبوویە. بابێ وی پارێزەربو و ژ بنەمالەكا ناڤداربوون لێ دگەل هندێ ژی د دەولەمەند نەبوون. ل سەر دەمێ وی ئیتالیا هاتبوو پارڤەكرن بۆ سەر هندەك شانشینێن بچووك وەك شانشێن ئێكگرتی دناڤ وەلاتەكی دا وەك فرەنسا و ئیسپانیا و ئینگلتەرا ژبەر ڤێ چەندێ ژی نەیا سەیربوو كو ئیتالیا ژلایێ لەشكەریڤە وەلاتەكێ لاواز بیتسەرەرای پێشكەفتنا وێ دبورایێن ڕەوشەنبیری و شۆرەشێن هزری و هونەری دا.

هەتا سەردەمێ ماكیاڤیللی ژی فلورەنسا لژێر دەستهەلاتا ئێك ژ كورێن خێزانا مەدیچی بوو كو ناڤێ وی "لورینزوییێ مەزن"بوو و پشتی مرنا لورینزوی ل سالا 1492 ب چەند سالەكان ئەڤ خێزانە ژ باژێری هاتە دەرێخستن و فلورەسنا بۆ كومار.

ل سالا 1498 دەمێ ژیێ وی بویە 29 سالێ کارەکێ مەزنێ خزمەتێن جڤاکێ سڤیل ل فلورەنسا بدەستخوڤە ئینا و بۆ ماوێ 14 سالأن پۆستێن دیبلوماسی وەرگرتن و بەردەوام هاتنوچوون دناڤ ئیتالیا و سەرەدان بۆ وەلاتێن دی وەك فرەنسا و ئەلمانیا دکر.

ل سالا 1512 دەمێ کومار کەفتی، دووبارە خێزانا میچی هاتنە سەر دەستهەلاتێ ل فلورەنسا و ماکیاڤیللی ژکارێ وی هاتەلادان و بۆ ماوێ چەندین سالأن هاتە زیندانکرن ژبەرکو کەسەکێ گومانلێکری بوو ب تومەتا پلاندانانێن نهێنی بۆ ژناڤبرنا خێزانا دەستهەلاتدار. هەرچەندە وان ماکیاڤیللی گەلەك ئێشاند ژی لێ چ بەلگە ل سەر وان تومەتێن بدویف ویڤە هاتینەنان بدەست نەکەفتن لەورا هاتە ئازادکرن، پشتی هینگێ ماکیاڤیللی بریاردا ب ئێکجاری ژ ژیانا سیاسی دووربکەڤیت و ل گوندێ کاشاتو لنێزیك فلورەنسا ئاکنجیبوو.

د ماوێ 14 سالێن پشتی هینگێ دا هژمارەکا پەرتووکان بەلاڤکرن کو دوو پەرتووکێن هەرە ناڤداربوون ئەوژی: پەرتووکا "میر" ل سالا 1513 و پەرتووکا "هندەك گوتار ل دور هەر دەهـ پەرتووکێن ئێکێ یێن تیتوس لفیوسی".

ژبەرهەمێن وی یێن دی پەرتووکا "هونەری شەڕی"، "مێژوویا فلورەنسا"، و "شانوگەریا ماندرادولا"، لێ ناڤدارترین بەرهەمێ وی یێ هزری پەرتووکا میر بوو کو هەتا نوکەژی ئێکە ژ پەرتووکێن هەرە بەربەلاڤ و بۆ پتریا زمانێن جیهانی هاتیە وەرگێران.

ماکیاڤیللی ژیانا هەڤژینیێ پێکئینابوو و شەش زاروك هەبوون، ل سالا 1527 دژییێ 58 سالییێ دا وەغەرکر.

ئەم دشێن بێژین کو پەرتووکا میر کومەکا شیرەتنێن پراکتیکی یە ماکیاڤیللی پێشکێشی دەستهەلاتداران دکەت، ژ گرنگترین بنەمایێن ڤێ پەرتووکێ ئەون: هەتا کو میرەك یان دەستهەلاتدارەك ببیتە کەسەکێ سەرکەفتی پێدڤیە ب شێوەیەکێ تەمام هەمی بنەمایێن ڕەوشتی فەراموش بکەت بەلکو ب تنێ پشت بەستنێ بکەتە سەر هێزێ و فێبازیان. هەردیسان دڤێت وەلأت خودان چەکەکێ زێدە بیت و لەشکەرێ خۆ هەبیت و ئەڤ لەشکەرە هەر ژ گونجێن وی وەلأتی پێکهاتبیت ژبەرکو پتر دێ بنە جهێ باوەرییێ و پشت بەستن ل سەر هێتەکرن ژبەرکو ئەو وەلأتێ پشت بەستنێ بکەتە سەر هێزین بیانی یان هێزین کێم و لاواز دێ هەمی گاڤان د مەترسییا ژناڤچوونێ دا بیت.

هەردیسان ماکیاڤیللی سەروکێ وەلاتی شیرەت دکەت پشت بەستنێ بکەتە سەر خەلکێ وەلاتێ خۆ و باوەریا وان بدەستخۆڤە بینیت ژبەرکو بڤی رەنگی دێ شێت کونترۆلێ ل سەر هەمی هەڤرك و دوژمێن خۆ کەت.

ژلایەکێ ماکیاڤیللی دیاردکەت کو هەر دەستهەلاتدارەکێ بڤێت هێزا خۆ بپارێزیت، دێ نەچاربیت هندەك کاران کەت کو ببینە جهێ تۆرەبوونا مللەتی، لڤیرێ ئەو دەستهەلاتداران شیرەت دکەت کو ڤی کاری ب هێز و بۆ جارەکێ ب تنێ ئەنجام بدەت دکو ئێدی نەچارنەبیت ڤان کاران رۆژانە ئەنجام بدەت.

هەردیسان داکو ببیتە دەستهەلاتدارەکێ سەرکەفتی دڤێت هندەك کەسێن خودان شیان و دلسوز لدەوروبەری خۆ کومبکەت و دڤێت گەلەك یێ هشیار بیت ژ کەسێن دۆرێ و درەوین یێن کو خۆ ب کەسێن دلسوز و وەفادار ل دەف وی ددەنە دیارکرن.

د بەشێ 17 دا ژ پەرتووکا میر دا، ماکیاڤیللی پرسیار دکەت ئەرێ کیژك بۆ دەستهەلاتداری گرنترە، کەسەکێ خوشتڤی بیت یان کەسەکێ بترس بیت؟

"بەرسڤا وی ئەوە کو دڤێت کەسەکێ خوشتڤی و دهەمان دەمدا یێ بترس ژی بیت، لێ ئەڤە کەسە دێ گەلەك یێ ب سلامەتر بیت ئەگەر کەسەکێ بترس بیت ژ کەسەکێ خۆشتڤی، ژبەرکو حەژێکرن مرۆڤی نەچار دکەت گەلەك تشتان پێشکێشی خەلکی بکەت"

ماکیاڤیللی خەون ب وەلاتێ ئیتالی یێ ئێکگرتیڤە دیتن ژبەر هندێ بەردەوام دووپاتی ل سەر هندێ دکر کا چەوا دێ شێت هێزێ بۆ دەستهەلاتداران پەیداکەت ب هەر رێکەکا هەبیت. ماکیاڤیللی ب خۆ کەسەکێ نیشتیمانپەروەر و نموونەیی بوو و دیروکێ هەمیێ دا دووبارە نەبوویە کو خەلك هند گوهداریا کەسەکی یان فەیلەسوفەکی بکەن هندی یا ڤی کەسی دکر.

هندەك زانا وی ب کەسەکێ خرابکار و هندەکێن وی ب ئەهریمەنی دەنە دیارکرن کو بزاڤ دکر گەندەلی و درەو وفێلبازیان دناڤ خەلکیدا بەلاڤ کەت. ماکیاڤیللی بانگەوازا هندێ نەدکر کو ئەو خۆدانێ هندەك تیورێن نوو یێن سیاسی یە بەلکو وی پشتەڤانیا هندێ دکر خەلك لدویڤ وان بنەما و رێبازێن سیاسی بچن یێن کەسێن دی لدویڤ دچوون و ئەو د ڤی کارێ خۆ دا یێ سەرکەفتی بوو .

ماكیاڤیللی هەمی گاڤان بوچوونێن خۆ بشێوەیەکێ ڕۆهن و ئاشکەرا ددانە دیارکرن و بۆ ڤێ چەندێ ژی وی پشت بەستن دکرە سەر نموونە و ڕویدانێن د دیروکا کەڤن و دیروکا ئیتالیا یا هەڤچەرخێ خۆدا ڕویداین.

موسولینی ئێك ژ وان سەرکردێن ناڤادر بوو یێن لبەر دەستێ ماکیاڤیللی ڕابووی، هەردیسان دبێژن دەمێ ناپولیون دنڤستی دانەیەك ژ پەرتووکا میر لبن بالیفکا وی بوو و هەمان گوتن بۆ هێتلەر و ستالینی ژی دهێنە گوتن. دبیت ئەو کاریگەریا ڕێنما و شیرەتێن ماکیاڤیللی ل سەر دەمێ خۆ هەی ل ڤی سەردەمی نەبیت ژبەر هندێ ژی مە ناڤی وی دانایە ڤێ ڕێزی ژ لیستا کەسێن کەریگەر د دیروکێ دا.

بنەکوکا فەلسەفا ماکیاڤیللی ئەوبوو کا چەوا خەلك دێ پرسیارێ ژ تە کەن نەکو کا چەوا پێدڤیە خەلك پرسیارێ ژتە بکەن؟ ژبەر هندێ ژی وی ڕەوشت ژ سیاسەتێ ئینا دەر و دهەمان دەمدا ئاین ژی ژ سیاسەتێ دوور کر. ئانکو ئەم دشێین بێژین ب بوچوونا ماکیاڤیللی کەسێ سیاسەتمەدار دڤێت یێ دوور بیت ژ ڕەوشت و ئاینی و دڤێت ب هەر ڕێکەکا هەبیت بگەهیتە دەستهەلاتێ. گومان تێدا نینە کو ماکیاڤیللی دهێتە هەژمارتن ئێك ژ دانەرێن هزرا سیاسی یا هەڤچەرخ.

## 80. تۆماس مالْزوس Thomas Malthus

## (1766ز. – 1834ز.)

### تۆماس مالْزوس

### ئەو ڤەشەییێ مرۆڤ ژ مەترسیا زێدەبوونێ هژمارا وان هشیارکرین

ل سالا 1798 ڤەشەیەکێ ئینگلیزی یێ نەناڤدار ب ناڤێ تۆماس مالْزوس پەرتووکەکا کورت لێ یا ناڤەرۆك زەنگین و کاریگەر ب ناڤێ "گوتارەك ل دور پرەنسیپێن زێدەبوونا ئاکنجیبوونێ و کارگەریا ل پاشەرۆژێ ل سەر جڤاکی" بەلاڤکر.

بنەمایێ سەرەکی یێ ڤەکۆلینا مالْزوسی ل سەر هندێ بوو کو زێدەبوونا هژمارا ئاکنجیان دناڤ هەر جڤاکەکی دا دێ بیتە ئەگەرێ کێمبوونا بەرهەم ئینانا خۆارنێ. دڤی ڤەکۆلینێ دا وی ئەڤ چەندە ب شێوەیەکێ هشك و بێ بەلگە دابوو دیارکر، هەردیسان وی هزردکر کو هژمارا خەلکی ب شێوەیەکێ ئەندازەیی زێدەدبیت (بۆ نموونە: وی دگوت کو هژمارا خەلکی بڤی شێوەیی زێدەدبیت: 1، 2، 4، 8، 16، ......، لێ بەرهەمێن خۆارنێ ب شێوەیەکێ ماتماتیکی زێدە بیت ئانکو بڤی شێوەیی: 1، 2، 3، 4، 5، .....).

د چاپا دوێ یا هەمان پەرتووکا خۆدا، مالْزوسی بزاڤکر ڤی پرەنسیپی ب شێوەیەکێ سادەتر شرۆڤە بکەت. وی دیارکر کو گەشەکرنا هژمارا خەلکی ب شێوەیەکێ بێ دوماهیك زێدەدبیت هەتاکو دبیتە ئەگەرێ نەمانا رێژا زێدەبوونا بەرهەمێن خۆارنێ. دڤێ تیورا خۆ دا وی پشتەڤانیا هندێ دکر کو خەلك د هەژاری و برساتییێ دا بژین ژبەرکو وی هزردکر کو زانست چەند پێشبکەڤیت ژی نەشێت مرۆڤایەتییێ ژڤێ ئاریشا مەزن پورتال بکەت.

شیانێن مرۆڤان بۆ زێدەبوونێ گەلەك مەزنترن ژ شیانێن ئاخێ ژبۆ بەرهەم ئینانا وێ برا خۆارنا پێدڤی یا مرۆڤان پێدڤی دبنێ. مادەم ئەڤ چەندە راستە ئەرێ ما ئەم نەشێن هندەك یاسایان بدانین داکو زێدەبوونا هژمارا خەلکی بهێتە کونترۆلکرن؟

هەلبەت ئەڤ چەندە دشیان دا هەیە. بۆ نموونە شەڕێن مەزن و نەخۆشیێن ڤەگر و ڕویدانێن سرۆشتی دبنە ئەگەرێ کێمبوونا هژمارا مرۆڤان، هەلبەت ئەڤ چەندە دبنە ب شێوەیەکێ بەروەخت دبنە ئەگەرێ کێمبوونا هژمارا مرۆڤان لێ بهایێ وێ یێ گرانە. ژبەر ڤێ چەندێ مالٚزوسی هندەك ڕێکێن یاسایی و ڕەوشتی پێشنیارکرن بۆ ڕێگرتنا ل ڤی زێدەبوونێ وەك گیروکرنا پێکئینانا ژیانا هەڤژینێ یان ژن نەئینان و خۆ دوورئێخستن ژ کریارێن سیکسی و کونتارۆلکرن ل سەر ئینانا زاروکان.

لێ مالٚزوسی باش دزانی کو گەلەك یا بزەحمەتە مرۆڤ بشێت بەرەبابکێن خۆ ڕێك بێخیت و وان نەچاربکەت هەر ئێك کا دێ چەند زاروکان ئینیت ژبەر هندێ ئەو گەهشتیە وی ئەنجامی کو زێدەبوونا خەلکی ل چ سنورا ناڕاوەستیت و ل دوماهیێ هەمی دێ تووشی برس و هەژاریەکا چاڤەڕێکری بن هەلبەت ئەڤەژی تیورەکا ڕەشبینە.

سەرەڕای هندێ کو مالٚزوسی ئاماژە ب چ ڕێکان نەکریە بۆ ڕێگرتنێ ل کریارا دووگیانبوونێ کو ئەڤ ڕێکە ئەنجامەکێ سرۆشتی بوون ژبۆ ڕاوەستاندنا زێدەبوونا هژمارا خەلکی پشتی هینگێ، زانایێ برِیتانی فرانسیس بلیس (1771ز- 1854ز) ئێکەم کەس بوو هندەك ڕێك ب کارئینان بۆ ڕێگرتنێ ل کریارا دووگیانبوونا ئافرەتان ئەوژی ژ پێخەمەت دانانا سنورەکی بۆ زێدەبوونا هژمارا خەلکی.

ئەگەرێ ڤێ داهێنانا بلیسی بۆ هندێ دزڤڕیت کو وی ڤەکۆلینا مالٚزوسی خواند و تا ڕادەیەکێ مەزن پێ داخباربوو لەوڕا ژی ل سالا 1832 پەرتووکەك بەلاڤکر و تێدا بانگەوازیا هندێ دکر کو وی هندەك ڕێکێن جوداجودا ئاشکەراکرینە ژبۆ ڕێگرتنێ ل کریارا دووگیانبوونێ و دهەمان دەمدا بشێوەیەکێ بەرفەرهـ وی هشیاری و شیرەت دناڤ کرێکاراندا بەلاڤدکر داکو بزانڤێ بکەن کێم زاروك هەبن.

هەردیسان نوژدارێ ئەمریکی "چارلز ڤولتون" ژی ل سالا 1832 پەرتووکەك بەلاڤکر و تێدا بەحسێ وان ڕێکان دکر یێن دبنە ئەگەرێ ڕێگرتنێ ل دووگیانبوونێ. ل سالا 1860 ئێکەم کونگرە ب ناڤێ مالٚزوسی هاتە گرێدان ژبۆ ڤێ مەرەمێ و تێدا بانگەوازا هندێ دکر کو پێکئینانا خێزانێ دڤێت بهێتە ڕێکخستن، لێ ڕێگرتن ل کریارا دووگیانبوونێ ب تەمامی ژلایێ مالٚزوسی ڤە هاتە ڕەتکرن ژبەر ئەگەرێن پەیوەندی ب ڕەوشتی ڤە هەی،

لەورا ئەو کەسێن پشتەڤانیا بکارئینانا رێکێن رێگریێ ل دووگیانبوونێ دکر ناڤەکێ نوو بۆ خۆ دانا ئەوژی بناڤێ ڤوتابخانەیا مالزوسی یا نوو.

تیورا مالزوسی کاریگەریەکا مەزن ل سەر زانایێن ئابوری هەبوو، وان هزرکر ئەڤ زێدەبوونا خەلکی ب ڤان تێکراییێن مەزن دێ بیتە رێگر کو خودان کرێیان خانی یێن خۆ هەر گران بکەن و کرێیا وان نەئینە خارێ. زانایێ ئابوری یێ ئینگلیزی یێ ناڤدار "داڤید ریکادو" کو دهەمان دەمدا هەڤالێ مالزوسی ژی بوو، ئەڤ یاسایە پێشنیارکر: کرێیا سرۆشتی یا کاری ئەو بهایێ پێدڤیە کو تێرا کرێکاران بکەت ژیانا خۆ پێ بقەتینن و ئەڤ چەندە دێ بیتە ئەگەرێ بەردەوامبوونا رەگەزێ مرۆڤان بیێ کێم یان زێدەبن، ئەڤ یاسایە هاتە نافکرن ب یاسایا دەستنیشانکرنا کرێیان. ڤێ یاسایێ گرنگیا خۆ ل دەف کارل مارکسی هەبوو کرە بنیاتێ دەمێ نرخا زێدەکی دانایی.

هەردیسان ڤێ تیورا مالزوسی کارتێکرن ل سەر زانستێ بایۆلوژی کر، زانایێ ناڤدار "چارلز داروینی" دیارکر کو وی ڤەکۆلینا مالزوسی یا خواندی و گەلەك یێ پێ داخباربووی ب تایبەت دەمێ وی ڤەکۆلین ل سەر وەرارکرنا زیندەوران و هەلبژارتنا سرۆشتی دناڤبەرا واندا دکری.

مالزوس ل سالا 1766 ل ئینگلتەرا ژدایکبوویە و پاشی بەرەڤ کولیژا یەسوع ل زانکۆیا کامبریدج چوویە و ڤوتابیەکێ زیرەك بوو، ل سالا 1788 دەرچوو و پاشی دهەمان سالێدا بوو قەشە.

دەمێ وی دەستپێکی ئەڤ ڤەکۆلینا خۆ بەلاڤکری کەسێ گرنگی پێنەدا لێ پشتی هینگێ بۆ ئەگەرێ ناڤداربوونا وی لەورا ژی دووبارە پەرتووکا خۆ چاپکرەڤە و چەندین گوهۆرین تێداکرن و ئەو چاپا ئەڤرو لبەردەست ل سالا 1826 دەرکەفت بوو.

مالزوسی ل سالا 1804 دەمێ ژیێ وی 38 سالێ ژیانا هەڤژینیێ پێکئینا و سێ زاروك هەبوون، ل سالا 1805 وەك ماموستایێ دیروك و ئابوریا سیاسی ل زانکۆیا هند یا رۆژهەلاتی ل هالیبری هاتە دامەزراندن و هەتا وەغەرکری ژی دڤی پۆستی دا مابوو.

دژیانا خۆ دا مالزوسی گەلەك پەرتووك بەلاڤکرن لێ پەرتووکا ژهەمیان گرنگتر بناڤێ " پرەنسیپێن ئابوریا سیاسی" بوو ل سالا 1820 بەلاڤکر و هژمارەکا مەزن یا

زانایان ب ڤێ پەرتووکا وی داخباربوون ب تایبەت زانایێ ناڤدار "جۆن مانیارد کینز" کو ل چەرخێ بیستێ ژیایە.

هەردیسان مالزوسی گەلەك خەلاتێن ڕێزگرتنێ یێن مەزن دژیانا خۆدا وەرگرتینە. ل سالا 1834 دژیێ 68 سالیێ دا ل نێزیکی باژێرێ "باس" ل ئینگلتەرا وەغەرکر. پشتی مرنا وی دوو کورێن وی مابوونە ساخ لێ چ نەڤی نەبوون.

دهێت گوتن کو مالزوس نەکەسەکێ کاریگەربوو، چونکی ڕێکێن ڕێگریێ ل کریارا دووگیانیێ دگرن گەلەك گیرو هاتنە هاتنە دروستکرن، دبیت ئەڤ بوچوونە نەهندا دروست بیت ژبەرکو بوچوونێن مالزوسی کارتێکرن ل دوو زانایێن مەزن کربوو ئەوژی چارلز داروین و کارل مارکس بوون کو دوو هزرمەندێن هەرە مەزن یێن چەرخێ نوزدێ بوون.

هەروەسا قوتابیێن مالزوسی بزاڤ دکر تیورا وی بەلاڤ بکەن و باوەریێ بۆ خەلکی چێکەن. ژبەر ڤێ چەندێ هوسا چوو د مێشکێ خەلکی دا کو ئەو ل هندەك ڕێکان بگەرن ژبۆ ڕێگرتنێ ل زێدەبوونا بێ وێنە یا هژمارا خەلکی، هەلبەت ئەو بزاڤێن ئەڤرو دهێنە کرن ژبۆ ڕێکسختنا بەرەبابکان وسنوردارکرنا زێدەبوونا هژمارا ئاکنجیان ئێکە ژ بەرهەمێن تیورا مالزوسی.

مالزوس ب خۆ نەخودانێ بوچوونا دەستنیشانکرنا بەرەبکان بوو، ژبەرکو لبەری وی گەلەك فەیلەسوفێن دیژی ئاماژە پێکربوو، ئەو ب خۆ دانپێدانێ ب هندێ دکەت کو بەری وی ئەڤ بابەتە ژلایێ ئەفلاتۆن و ئەڕستۆی ڤە هاتیە گەنگەشەکرن و ئەو ب خۆ ڤێ پەیڤا ئەڕستۆی بومە ڤەدگوهێزیت "ئەگەر ئەم ئازادیێ ب دەینە هەر مرۆڤەکی کا وی چەند زاروك بڤێن هەبن، هەژاری دێ بیتە ئەنجامەکێ بێ گومان"

لێ مالزوس شیا ب تێروتەسەلی بەحسێ ڤی بابەتی بکەت و گەلەك ل سەر بنڤێسیت و ئەو شیا باوەریێ بۆ خەلکی چێکەت کو ئەگەر ئەڤ ئاڕیشە نەهێتە چارەسەکرن دێ ل دوماهیێ خەلك هەمی تووشی هەژاری و برساتیێ بن.

# 81. جۆن کەنەدی John F. Kennedy

## (1917ز. - 1963ز.)

### جۆن کەنەدی

### ئەو کەسێ بوویە ئەگەر مرۆڤ پێ خۆ بدانە سەر بانێ هەیڤێ

جۆن فیتزگێرالد کەنەدی ل سالا 1917 ل باژێرێ برۆکلن ل ویلایەتا ماساشوستس ژدایکبوویە. ل ڕۆژا 20 کانونا دووێ ل سالا 1961 بوویە سەروکێ ویلایەتێن ئێکگرتی یێن ئەمریکا هەتا ڕۆژا 22 چریا دوێ یا سالا 1963 ل باژێرێ دالاس ل ویلایەتا تکساس هاتیە تیرورکرن.

دڤێ پەرتووکێ دا مە ب درێژاهی بەحسێ ژیانا وی نەکریە چونکی پتریا بویەرێن ژیانا ددیارن، هەروەسا پتریا ئەو چالاکیێن وی دژیانا خۆ یا سیاسی دا کرین چ پەیوەندیێن ڕاستەخۆ ب هندێ ڤە نینن کا بوچی مە ناڤێ وی دانایە دڤێ لیستێ دا.

دبیت هەتا بورینا هزار سالێن دی کەس بیرا خۆ ل "هەڤپەیمانیا پێشکەفتنێ" و شەڕێن "کەنداڤێ بەڕازان" دناڤبەرا ئەمریکا و کوبا دا نەکەت، هەردیسان ڕەنگە بیرا کەسێ ل وان بریار و یاسایان نەهێت یێن پەیوەندی ب باج و مافێن مرۆڤی ڤە هەی کو کەنەدی ل سەر دەمێ خۆ دابوون.

لێ مە ناڤێ جۆن کەنەدی کرە دلیستا کەسێن کاریگەر ا ئەوژی ژبەر ئێك ئەگەر ب تنێ، ئەوژی ژبەر هندێ بوو کو کەنەدی کەسێ ئێکانە بوو یێ بەرپرسیار ژ گەشتێن ئەبولو ئەوێن هاتینە فرێکرن بۆ ئەسمانی. هەلبەت دیروك هەمی گاڤا دێ هزرا خو ل ئێکەم گەشتێن مرۆڤی بۆ سەر هەیڤێ و ئەختەرێن دی ئینیت.

ئەگەر پرسیار بکەین کا کەنەدی ژ هەژی ڤێ ڕێزگرتنێ یە یانژی دوو گەرۆکێن دی یێن ئەسمانی ب ناڤێن "نیل ئارمسترۆنگ" و " ئیدوین ئەلدریم" کو ئێکەم کەس بوون پێ خو دانایە سەر بانێ هەیڤێ؟

ئەم دشێن بێژین کو ڤان هەردوو گەرۆکان چ بهایێ خۆ نەدبوو ئەگەر ب ڕێکێڤە پاپۆرا ئەبولو 11 ژکارکەفتبا و ئەو هەردوو مریبان ژبەرکو پشتی هینگێ دا دوو کەسێن دی ل شوینا وان هێنە هنارتن و دبیت پشتی بورینا چەند سالەکان کەسێ هزرا خۆ دڤان هەردوو گەرۆکان دا نەکربا. لێ د دیروک چ جاران وی کەسی ژبیرناکەت یێ کو ڕۆلێ ئێکانە هەبووی د پشتەڤانیکرنا بجهئینانا پرۆژێ ئەبولو بۆ هنارتنا پاپۆرەکا ئەسمانی بۆ سەر بانێ هەیڤێ.

هەردیسان ئەگەر ئەم پرسیار بکەین کا دێ شێن ڤێ ڕێزگرتنێ دەینە زانایێ ئەڵمانی "فێرنەرڤون براون" کو گەلەگ پرۆژە داهێنان یێن هاریکاریا مرۆڤان کری بشێن پێ خۆ بدانە سەر هەیڤێ؟

هەلبەت دڤێت ئەم ڕۆلێ ڤی زانای و دوو زانایێن دیژی ژبیرنەکەین کو کارێن وان گرنگیەکا مەزن هەبوون ژبۆ سەرکەفتنا ڤی پرۆژەی ئەوژی زانایێ ڕۆسی "کونستناتین تسیولکوفسکی" و زانایێ ئەڵمانی "هەرمان ئوبەرت". لێ دڤێت ژبیرنەکەین ب تنێ بریارێن سیاسی دبنە ئەگەر هزر و خەونێن زانا و ئەندازیار و داهێنەران ببنە ڕاستی. لەورا ئەو بریارا جۆن کەنەدی دای ل دور مەزاختنا 24 ملیون دولاران ژبۆ بجهئینانا ڤی پرۆژەی کو ل وی سەردەمی گەلەك دژایەتیا وی هاتەکرن بۆ ئەگەر ئەم ناڤێ وی بدانینە دگەل لیستا کەسێن کاریگەر د دیروکێ دا.

ئەم دشێن بێژین کو هەر سەروکەکێ دی یێ ئەمریکا هاتبا دبیت ئەڤ بریارە دابا ژبەرکو ڕایا گشتی یا خەلکێ ئەمریکا ئەوبوو کو وەلاتێ وان کارەکێ هوسا مەزن ل ئەسمانی ئەنجامبدەت کو ژ هەژی ناڤێ ئەمریکا بیت، لێ خەلك ب چ ڕەنگان یێ ڕازی نەبوو بهایەکێ هوسا یێ مەزن بهێتە مەزاختن بۆ پرۆژەکێ ژڤی جوری.

هەرچەندە بوچوونا گشتی یا خەلکی پشتی سەرکەفتنا ڤی پرۆژەی ژی هەروەکی خۆ ما و وان هوسا هزرکر ئەڤ پارەیە بێ مفا هاتە مەزاختن لێ کەسایەتیا بهێز یا کەنەدی بەرپرسیارا ئێکێ و دوماهیێ یا دانا ڤێ بریارێ بوو و ئەو شیا کونگرێسێ ئەمریکا ڕازی بکەت پشتەڤانیا ڤی پرۆژێ مەزن و ب مفا بکەن.

پشتی دانا ڤێ بریارێ، ئێدی هێدی هێدی ئەو بودجەیا بۆ دەستەکا ئەسمانی یا ئەمریکا دهاتە تەرخانکرن هاتە کێمکرن و دهەمان دەمدا کەسێ ل ئەمریکا ئەو هەستە

نەبوو ل ڕۆژا 20 تیرمەها 1969 کو بۆ ئێکەم جاربوو مرۆڤی پێ خو دانا سەر بانێ هەیڤێ هەلکەفتنا بکەن و شانازیێ بڤێ ڕۆژێ ببەن.

ئەڤ چەندە دگەل کریستوفەر کۆلومبوسی ژی ل چەرخێ شازدێ ژی ڕویدابوو کو کەسێ ب هەلکەفتا ئاشکەراکرنا کێشوەرێ ئەمریکا ژلایێ ویڤە چ هەلکەفتن ئەنجامنەدان لێ ل سەردەمێ ئەڤروکە جیهان هەمی بیرا خۆ ل کولومبوسی دئینەڤە ژبەرکو ئاشکەراکرنا ئەمریکا ژلایێ ویڤە وەکی ڕۆژهەلاتنەکێ بوو ژبۆ چەرخێ نوو.

ئەگەر د سەرەمێ ئەڤروکەدا کەس بیرەوەریا ئێکەم ڕۆژا مرۆڤ چوینە سەر بانێ هەیڤێ نەکەت ژی، لێ ئەڤ سەرکەفتنە هەر دێ مینیت سەرکەفتنەکا مرۆڤایەتی یا هەرە مەزن و ژ پێنەڤێت بەرەبابکێن داهاتی دێ هەست ب هندێ کەن کو گەشتا ئەبولو 11 بۆ سەر هەیڤێ و گەشتا کۆلومبوسی برێکا زەریا ئەتلەسی بۆ ئەمریکا دوو ڕویدانێن هەرە مەزن بوون د دیروکێ دا و قوناغەکا نوو ل هەمبەر دیروکا مرۆڤایەتیێ ڤەکرن.

# 82. گریگۆر پێنکوس Gregory Pincus

## (1903ز - 1967ز)

### گریگۆر پینکوس

### ئەو زانایێ حەبکێن دژی دووگیانبوونێ داهێنانین

زانایێ بایۆلوژی یێ ئەمریکی گریگۆر پێنکوس شیا بۆ ئێکەم جار ب شێوەیەکێ سەرکەفتیانە جورەکێ حەبکان ب رێکا خۆارنا بدەڤی ب داهێنیت کو رێکێ ل کریارا دووگیانبوونێ دگرن، هەرچەندە دژیانا خۆدا و پشتی وەغەرکری ژی نەکەسەکێ ناڤدار بوو لێ ئەو داهێنانا وی ل پشت خۆ هێلای کاریگەریەکا مەزن هەبوو و ژ کاریگەریا گەلەك کەسێن دی یێن ناڤدار پتر بوو.

ڤی داهێنانێ دوو کاریگەرییێن مەزن ل سەر جیهانێ هەبوون. کاریگەریا وێ یا ئێکێ ل سەر جیهانێ هەمیێ بوو کو رۆژ بۆ رۆژێ هژمارا ئاکنجییێن وێ بەرەڤ زێدەبوونێ دچوو و ڤێ چەندێ مەترسیەکا مەزن پەیداکربوو، لێ ئەڤ حەبکە شیا ب شێوەیەکێ بەرچاڤ کونترۆلێ ل سەر ڤێ مەترسیێ بکەت. کاریگەریا وێ یا دووێ ژی ئەوبوو شیا ببیتە ئەگەرێ گوهۆرینا دابونەریتێن سیکسی و ئازادیێ ل دەف خەلکی.

یا زانایە کو پشتی داهێنانا ڤێ حەبکێ، شۆرەشەکا مەزن د هەلویستێ گەلێ ئەمریکا دا پەیدابوو بەرامبەر کریارێن سیکسی. هەلبەت گەلەك فاکتەرێن دی یێن سیاسی و ئابوری و جڤاکی هەبوون کو کاریگەری ل سەر ڤێ شۆرەشێ هەبوون، لێ کاریگەریا فاکتەرێ ژهەمیان رۆهنتر داهێنانا ڤی جورێ حەبکێ بوو.

بەری هینگێ ژنێن ئەمریکی ترسەکا مەزن ژ پەیوەندییێن دلداری و سیکسی یێن بەری هەڤژینیێ هەبوو ژبەرکو ئەڤ چەندە دبوو ئەگەرێ دووگیانبوونا وان لێ ژنیشکەکێڤە و پشتی داهێنانا ڤی دەرمانی ئێدی ئەو ترسە ل دەف وان نەما. هەدریسان داهێنانا ڤی دەرمانی بۆ ئەگەرێ گوهۆرینا هەلویست و دابونەریتێن وان دپەیوەندییێن دناڤبەرا هەردوو رەگەزاندا.

جهێ ئاماژەپێکرنێ یە کو بەری داهێنانا ڤێ حەبکێ، نوژداران ئافرەت شیرەتدکرن هندەك جورێن رێگر یان ناڤبڕان[1] بکاربینن، هەرچەندە ژلایێ سەلامەتیێ ڤە ڤان رێگران چ مەرتسیا خۆ نەبوو لێ ژلایێ پراکتیکی ڤە هەتا نوکەژی هژمارەکا مەزن یا ئافرەتان د دوولن و نەوێرن بکاربینن. لێ دەمێ ئەڤ حەبکە هاتینە دروستکرن ئافرەتان بێ دوولی و ترس بکارئینان.

جهێ ئاماژە پێکرنێ یە کو ڤان حەبکێن دگوتنێ ئینوڤید مەترسی ل سەر ژیانا مرۆڤی هەبوون و کاریگەریا وان هند یا مەزن نەبوو لێ دگەل هندێ ب ملیونەها ئافرەتان بەرێ خۆ دایێ و بکارئینان لەورا زانا نەچاربوون پتر گرنگیێ بدەنێ و رۆژ بۆ رۆژێ گوهۆرینان تێدا بکەن هەتا ب شێوەیەکێ باشتر و سەلامەتر بگەهنە بکەڤنە بازاری لەورا ژی دڤێت دیروك دیدەڤان بیت ل سەر هندێ کو ئەڤ حەبکێن پێنکوسی ل سالا 1950 داهێناین دهێنە هەژمارتن ئێکەم بزاڤا راستەڤینە بۆ رێکخستنا ئینانا زاروکان.

گەلەك زانایان دەست دگەل داهێنانا ڤان حەبکان هەبوو لێ کەسێ ژ وان پێزانین ل سەر پێکهاتنا وان یا کیمیایی نەبوون، ب تنێ ئەو هزرە هەر ژ کەڤندا یا بەربەلاڤ بوو کو ئەڤ حەبکە دڤێت برێکا دەڤی بهێنە بکارئینان.

بەری هینگێ ل سالا 1937 جورەکێ شرینقێن هورمۆنێ پرۆجیستڕۆن دهاتە بکاردئینان کو هورمونەکێ تایبەتە و پەیوەندی ب رەگەزێ مێ ڤە هەیە و دبیتە ئەگەرێ رێگرتنێ ل کریارا دووگیانبوونێ ئەوژی ب رێکا فێلەکێ کو ئەڤ هورمونە ناهێلیت هێکا ئافرەتێ ژلایێ تۆڤێ زەلامیڤە بهێتە پیتاندن، لێ ژبەرکو بهایێ ڤی هورمۆنی گەلەك یێ گران بوو و رێکا ب دانانا وی ژی یا سانەهی نەبوو لەورا ڤێ پێنگاڤێ سەرکەفتنەکا مەزن تومارنەکر. ئەڤێ چەندێ پێنکوس پالڎا ل رێکەکا دی یا ب سانەهی بگەریت بۆ رێگرتنێ ل کریارا دووگیانیێ.

ئەگەر پرسیار بکەین کا هەکە ژنکەك هورمونێ پرۆجیستڕون وەکی حەبکێن ئەنوڤید ب رێکا دەڤی بخوت دێ هەمان کارتێکرن هەبیت، پشتی هینگێ هاتە ئاشکەراکرن کو ئەگەر ئەڤ هورمۆنە ب دەڤی ژی بهێتە خۆارن دی ٚهەمان ئەنجام هەبن ئەگەر برێکا شرینقێ بهێتە دانان.

---

[1] ئەو رێگر وەکی وان کوندومێن لاستیکی بوون بوون یێن لسەردەمێ ئەڤروکە دهێنە بکارئینان.

ئێك ژ زانایێن کیمیایی لژێر سەرپەرشتیا پێنکوسی ڕابوون ب ئامادەکرنا ڤی هورمۆنی ل تاقیگەهی کو دشیاندابیت ب ڕێکا دەڤی بهێتە خۆارن و دئەنجامدا دیاربوو دیاربوو کو دشێت ببیتە ئەگەرێ نەهێلانا پیتاندنا هێکێ و هەروەسا دیارکر کو ئەڤ هەرمۆنە ب ڕێکا دشێت هەتا ڕێژا 85٪ ببیتە ئەگەرێ نەپیتاندنا هێکا ئافرەتێ، لێ ئاریشەکا دی پەیدابوو ئەوژی دڤێت ئافرەت برەکا مەزن یا ڤی هورمۆنی بخوت هەتا ئەنجامان بدەستخوڤە بینیت و ڕەنگە کارتێکرنەکا نەرێنی پەیدابیت.

پێنکوس یێ بەردەوام بوو ل سەر چارەسەرکرنا ڤێ ئاریشێ هەتا شیایی کەرەستەکێ دی بداهێنیت کو دشیانێن ویدایە هەمی کاران بکەت ئەوژی کەرەستێ "نورزینودرێل" بوو. ئەگەر ڤی کەرەستەی دگەل کەرەستەکێ دی یێ کیمیایی بناڤێ "مێستڕانول" تێکەل بکەت، تێکەلکرنا ڤان هەردوو کەرەستەیان ل سالا 1955 بۆ ئەگەرێ داهێنانا حەبکێن ئەنوڤین ل سالا 1955 و لدەستپێکێ ل سەر گیانەوەران هاتنە تاقیکرن و پشتی هینگێ ل سەر مرۆڤان ژی هاتنە تاقیکرن و سەرکەفتن هاتە توماکرن لەوڕا ئێدی ل سالا 1960 بازار پڕبوون ژڤی جورێ حەبکێ.

ئەم دشێن بێژین هژمارەکا مەزن یا زانا و نوژداران دەستەکێ مەزن هەبوو ل سەر ئامادەکرنا ڤان کەرەستەیێن کیمیایی و تاقیکرنا وان و چاڤێدریکرنا وان ل سەر گیانەوەر و مرۆڤان، لێ پێنکوس زانایێ ئێکانەبوو یێ پتریا دەمێ خۆ تەرخانکری بۆ ئامادەکرنا ڤی دەرمانی و بەردەوام گوهۆرین تێدادکرن هەتا شیایی ل دوماهیێ ب شێوەیەکێ سەرکەفتی بگەهیتە ئەنجامان و سەرکەفتنەکا دیروکی توماربکەت ژبەر هندێ ژی ئەم ژ هەژی دبینن ڤێ ڕێزگرتنا مەزن پێشکێشی وی ب تنێ بکەین.

گریگور پێنکوس ل سالا 1903 ل ویلایەتا نیوجرسی ژدایکبوویە، دەیکوبابێن وی دوو جوهی یێن ڕۆسی بوون. وەك ماموستا ل گەلەك زانکۆیێن ئەمریکی دەوام کریە و سەرپەرشتی ل سەر گەلەك کارگەهێن تایبەت ب دروستکرنا دەرمان و هورمۆناندا کریە.

د ژیانا خۆدا گەلەك بروانامە و خەلاتێن ڕێزگرتنێ وەرگرتینە لێ ب مخانیڤە نە وی و نەهەڤالێن دگەل ویدا نەشیان خەلاتێ نۆبل بدەستخوڤە بینن. دەمێ ل سالا 1967 ژی وەغەرکری کەسێ ئاگەهـ ژ مرنا وی نەبوو هەتا زانایێن هەڤالێ و سەردەمێ ویژی، لێ

**سەرِەرای ڤێ چەندێ ژی دێ هەرمینیت ئێك ژ وان زانایێن مەزن یێن كاریگەریەكا مەزن دديروكا مرۆڤايەتيێ دا هەی.**

## 83. مانی Mani

## (216ز - 176ز)

### مانی

### دانەرێ ئاینێ مانیشیزمێ عیراقێ

ل چەرخێ سیێ زاینێ، ڕابەرێ ئاینێ مانیشیزمی ب ناڤێ "مانی" دەست ب بەلاڤکرن ئاینێ خۆ کر. هەرچەندە ل سەر دەمێ ئەڤروکە ئەڤ ئاینە یێ بەرەڤ نەمانێ چووی و کەس لدویڤ ناچیت لێ ل سەردەمێ خۆدا هژمارەکا مەزن یا خەلکی باوەری پێ ئینابوو و لدویڤ ڕێبازا وی دچوون، ئەڤ ئاینە لدەستپێکێ ل ڕۆژهەلاتا ناڤین پەدابوو لێ هێدی هێدی بەربەلاڤ بوو هەتا گەهشتیە ڕۆژئاڤایی و زەریا ئەتلەسی، هەردیسان بەرەڤ ڕۆژهەلاتی بەلاڤبوو هەتا گەهشتیە زەریا هێمن و ئەڤ ئاینە بۆ پتر ژ هزار سالان مابوو زیندی.

هەرچەندە ڕێنما و بنەماییێن ڤی ئاینی پێکهاتبون ژ بنەماییێن هندەك ئاییێن بەری خۆ وەك زەرادەشتی و بودی و مەسیحیەتێ لێ ڕابەرێ وێ بانگەوزایا هندێ دکر کو سرۆش ب شێوەیەکێ تایبەت بۆ وی هاتیە خارێ لێ ژبۆ پێغەمبەرێن بەری وی نەهاتیە خوارێ!

ژلایەکێ دیڤە سەرەڕای کو ڤی ئاینی گەلەك بنەماییێن هەردوو ئاینێن بۆدی و مەسیحی تێدا هەنە لێ ئاینێ زەرادەشتی ب شێوەیەکێ مەزن کاریگەری ل سەر کریە و ل سەر زالبوویە ژبەرکو مانی ژی وەکی زەرادەشتی باوەری ب هندێ هەبوو کو خۆدایەکێ ب تنێ نینە بەلکو جیهان دوو خودان ل جیهانێ هەنە و هێزا هەردووکا هندی ئێکە و ئەڤ هەردوو خودایە بەردەوام د هەڤڕیەکێ دانە هەتا ڕۆژا دوماهیێ، ئێك ژ وان خودایێ هێزا شەڕی یە و ژ تارِیاتیێ دروستبوویە و پێکهاتنا وی یا کەرەستەیی یە، لێ خودایێ دی هێزا باشیێ یە و ژ ڕۆناهیێ دروستبوویە و پێکهانا وی یا ڕۆحی یە.

ئەڤ بوچوونە نێزیکی ڕامانا باشی و خراپیێ یە د بیروباوەرێن مەسیحیەتێ دا، لێ مانی هوسا هزدکر دکر کو هێزا شەڕی قەت ژ هێزا باشیێ کێمتر نینە و شیانێن هەردووکان

هندی ئێکن. مادەم هێزا شەڕی و خڕابیێ دڤی ئاینی دا هندی ئێکن ئێدی ئەو تووشی وێ ئاریشێ نەبوویە یا د ئاینێ مەسیحی و جوهیان دا هەی ئەوژی چەوا چێدبیت خودێ بەس باشی ل دەف هەبیت و دهەمان دەمدا خڕابیێ د دئافڕینیت یانژی دهێلیت خڕابی ل سەر عەردی بهێتە کرن!

ئاینێ مانیشیزمی دیاردکەت کو باشی و خڕابی پێکڤە یێن پەیدابووین و هندی دونیا هەی دێ د هەڤڕکیێ دا بن هەتا ل دوماهیێ ئێك ژ وان بسەر دکەڤیت.

و ژبەرکو باشی و خڕابی هەردوو د گیانێ لەشێ مرۆڤی دا هەنە، ڕامانا وێ ئەوە پەیوەندی ب ڕۆح و لەشیڤە هەیە، ژبەر ڤێ چەندێ پێدڤیە ل سەر مرۆڤان زێدەنەبن چونکی ئەڤ زێدەبوونە دێ بیتە ئەگەرێ پەیدابوونا هندەك لەشێن دی یێن خڕاب و هەر ژبەر ڤێ بیروباوەرێ ئەڤ ئاینە هەمی پەیوەندییێن سیکسی دناڤبەرا ژن و مێراندا حەڕام کرینە، دهەمان دەمدا خۆارنا گوشتی و ڤەخۆارنا مەیێ ژی حەرام کرینە.

ژبەر ڤان مەرجێن گران، یا ب زەحمەتبوو بۆ پتریا خەلکی بشێن باوەریێ بڤی ئاینی بینن بەلکو ب تنێ کومەکا خەلکێ ژێگرتی باوەری پێ هەبوو، لێ ئەو کەسێن دی یێن گوهداریێ ڤی ئاینی دکری لێ پابەند نەبوون ب ڕێنماییێن وی دهاتنە هەژمارتن باوەردارێن ئاسایی و ئەو دشیان پەیوەندییێن سیکسی هەبن گوشتی بخۆن و مەیێ ڤەخۆن.

د ڤی ئاینی ژی ڤەشە هەبوون کو ب چ ڕەنگان چێنەدبوو ژیانا هەڤژینیێ پێکبینن و گوشتی و مەیێ بکارینن. هەر ژبەرڤێ چەندێ بەهەشت ب تنێ بۆ ڤان کەسێن پابەندە، لێ باوەردارێن ئاسیایی ژی دبیت بچنە بەهەشتێ ئەوژی د هندەك جورێن سزاییێن دەروونی و زەحمەتکێشان و گونەهژێبرنێ ڕا دبورن.

مانی ل سالا 216 ل وەلاتێ عیراقێ ژدایکبوویە کو لوی سەردەمی بەشەك بوو ژ ئیمپراتۆیەتا فارسی، مانی فێرسەکێ چەلەنگ و ژ بنەماڵەکا دەستهەلاتدار بوو و ناڤدارترین فێرسێ وی سەردەمی بوو یێ باوەری ب زەرادەشتی هەی لێ ئەو ب خۆ دناڤ خێزانەکا مەسیحی دا مەزن بوویە.

هێشتا دەمێ ژیێ مانی 12 سالێ بوون وی بانگەوزایا هندێ دکر کو هندەك خەونێن ئاینی دیتینە و مزگینیا هاتنا ئاینەکێ نوو بەلاڤ دکر، کەسێ ل وەلاتی وی باوەر ژێ نەکر لەوڕا نەچاربوو بەرەڤ وەلاتێ هندێ چوو و ل وێرێ دەست ب بەلاڤکرنا

بیروباوەرێن خۆ کر هەتا شیایی باوەریێ بۆ دەستهەلاّتدارەکی چێکەت کو پشتی هینگێ هاریکاریا وی کر ب ئازادی ئاینێ خۆ بەلاڤ بکەت.

ل سالا 242 دووبارە بەرەڤ وەلاّتێ فارسانڤە هات و شاهێ وی سەردەمی ب ناڤێ "شابورێ ئێکێ" گوهێ خۆ دا بیّوباوەرێن وێن هەرچەندە ڤی شاهی باوەری ب ئاینێ وی نەئینا لێ گەلەك پێ داخباربوو لەورا دەرفەت دایێ دناڤ وەلاّتێ فارساندا کو لوی سەردەمێ دگوتنێ وەلاّتێ ساسانیان بانگەوازیا ئاینێ خۆ پێ نوو بکەت.

مانی شیا بۆ ماوێ پتر ژ 30 سالاّن بانگەوازیا ئاینێ خۆ ل سەر دەمێ شاهـ شابورێ ئێکێ و هورمزێ ئێکێ بەلاّڤ بکەت و گەلەك کەس ب دویفکەفتن. مانی نامە بۆ شاهێن گەلەك وەلاّتان ژی فرێکرن و هەتا هندەك کاهنێن زەرادەشتی ژی پێ داخباربووین کو زەرادەشتی لوی سەردەمی ئاینێ فەرمی یێ ئیمپراتۆریا فارسیان بوو.

مانی پەرتووکا خۆیا یا ئاینێ ب زمانێ فارسی و پاشی ب زمانێ سریانی نڤێسایە لێ پشتی ئەڤ ئاینە بەرەڤ نەمانێ چووی پەرتووکێن وی ژی دیارنەماینە، هندەك دیروکنڤێسان چەندین دەستخەتێن کەڤن دیتینە کو هێمایێ دکەنە سەر هندەك وێنەیێن پەرتووکا مانی.

لدەستپێکێ ئەڤ ئاینە شیا سەرکەفتنێ بینیت و بەرەڤ ڕۆژئاڤایی بچیت هەتا گەهشتیە وەلاّتێ ئیسپانیا و ل لایێ ڕۆژهەلاتی ژی گەهشتە وەلاّتێ هندێ، هەتا ل چاخێ چوارێ زاینی گەهشتە گوپیتکا گەشەکرنا خۆ لێ پشتی هینگێ ئاینێ مەسیحیەتێ هەڤڕکیا وی کر. ڤەشە "ئوگشتین" ب خۆ بۆ ماوێ نەهـ سالاّن باوەری ب ڤی ئاینی ئینابوو لێ پشتی مەسیحیەت بوویە ئاینێ فەرمی یێ ئیمپراتۆریا ڕۆمانی گەلەك دربێن مەزن ب ئاینێ مانی کەفتن و هەر کەسێ باوەری ب ڤی ئاینی هەی هاتە ئەشکەندان و کوشتن هەتا کو سالا 600 ب ئێکجاری ئەڤ ئاینە ل ئەورۆپا بەرزەبوو.

لێ ئەڤ ئاینە ل وەلاّتێ عیراق و ئیرانێ هەر یێ ب هێز بوو هەتا گەهشتیە ئاسیا ناڤەڕاست و تورکیا و ڕۆژئاڤایێ چینێ، ل چەرخێ هەشتێ زاینی ئەڤ ئاینە بوو ئاینێ فەرمی یێ مەنگولیا و ڕۆژئاڤایێ چینێ  و ل دووڤدا ئەڤ ئاینە ژ چینێ هاتە ڤەگۆهاستن بۆ گزیرتا تایوانێ.

ل سەردەمێ عباسیان ژی، ئەڤ ئاینە ل عیراق و ئیرانێ هاتە حەڕامکرن هەتا کو ب ئێکجاری نەهێلای. ئەڤ ئاینە ل دەستپێکا چەرخێ نەهێ ل وەلاتێ چینێ بەرەڤ نەمانێ چوو هەتا چەرخێ 13 زاینی هێرشێن مەنگولان ب ئێکجاری دوماهی بڤی ئاینی ئینا. گەرۆکێ ئیتالی یێ ناڤدار "مارکو پولو" د سەرەدانا خۆدا بەحسێ هندێ دکەت کو وی دڕێکا خۆدا هندەك کەس دیتبوون باوەری ب ئاینێ مانی دئینا.

سەرەڕای نەما ڤی ئاینی ل ئەورۆپا لێ هەتا دەمەکێ درێژ لژێر چەندین ناڤێن جوداجودا یێ ڤەشارتی هەتا کو "بابا ئەلبێرتێ سیێ" هەوەکا شەڕێ خاچپەرێسان دەستپێکری بۆ نەهێلانا ڕهوریشالێن ڤی ئاینی ل سالا 1209 و هەتا سالا 1244 شیا ب تەمامی چ شینوارێن وی نەهێلیت هەتا وی ڕادەی خو ئێك دویکەفتیێ ڤی ئاینی نەمای لێ دگەل هندێ ژی هەر هندەك کەسێن ڤەشارتی ل ئیتالیا مابوون.

مانی شیا کاریگەریەکا مەزن ل سەر دویکەفتییێن خۆ بهێلیت و ئەڤ کەسە ل سەرانسەری جیهانێ بەلاڤبوون ژبەر هندێ ئەم دشێن مانی ئێك ژ وان کەسێن نەمر بدانین یێن کاریگەریەکا مەزن ل سەر جیهانێ کری. ڕاستە ل سەردەمێ ئەڤروکە چ شینوارێن ویژی نەماینە لێ ل دەمێ بەلاڤبوونا وی گەلەك خەلکی باوەری پێ ئینا و کاریگەری ل سەر کربوو.

دبیت د دیروکێ دا ئەو چەندە پەیدانەبوو کو کەسەك ب تنێ شیابیت ئاینەکی دروست بکەت و ڕێنما و بیروباوەرێن وی بدانیت و ڕێزێن باوەردارێن وی ب ڕێکبێخیت و بەرەڤانییێ ژێ بکەت. ڕاستە ژی کو بیروباوەرێن خۆ ژ ئاینێن بەری خۆ وەرگرتینە لێ دگەل هندێ شیا ب شێوەیەکێ سەرکەفتی ڤان بیروباوەران پێکڤە گرێدەت و دووبارە ب دارێژیت و ئاینەکێ تەمام ژێ دروست بکەت. ژبەر ڤێ چەندێ ئەم دشێن بێژین ئەو کاریگەریا مانی ل پشت خۆ هێلای ژ کاریگەریا گەلەك زانایێن ناڤدار و داهێنەران مەزنتربوویە.

## 84. لینین Lenin

## (1870ز.– 1924ز.)

### لینین

### ئەو سەرکردێ ب دارێ زۆلم و زۆرداریێ فەرمانڕەوایی ل ڕۆسیا کری

لینین دهێتە نیاسین ب بەرپرسیارێ ئێکی ژ سەرهلدانا ڕێبازا شیوعیێ ل وەلاتێ ڕۆسیا، هەرچەندە ئەو ب خۆ قوتابیێ فەیلەسوفێ ب ناڤودەنگ کارل مارکسی بوو و ژبەر دەستێ وی ڕابوویە و فێری گەلەك ڕێنما و بنەماییێن فەلسەفی بوویە، لێ ژبەر وێ کاریگەریا فەلسەفی یا مەزن یا وی کو هەر زوی ل گەلەك وەلاتان بەلاڤبوویە، دهێتە هەژمارتن ئێك ژ مەزنترین و مەترسیدارترین زەلام د دیروکێ دا.

لینین کو ناڤێ وێ یێ دروست فلادیمێر ئیلیش ئولیانوڤە ل سالا 1870 زاینی ل باژێرێ "سەمەرسیسك" کو نوکە دهێتە نیاسین ب باژێرێ "ئولیانوڤیسك" ل وەلاتێ ڕۆسیا ژدایکبوویە. بابێ وی فەرمانبەرێ دەولەتێ بوو لێ برایێ وی یێ مەزن بناڤێ ئەلیکساندەر ژلایێ دەستهەلاتداریا وی سەردەمیڤە هاتبوو سێدارەدان ژبەرکو پشکداری د بزاڤەکا کوشتنا قەیسەرێ وی سەردەمێ ڕۆسیادا کربوو لێ بزاڤا وان هاتە ئاشکەراکرن و ژناڤبرن.

دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 23 سالێێ، لینین بۆ کەسەکێ مارکسی یێ چالاك لێ ل سالا 1895 ژبەر چالاکیێن وی د شۆڕەشێ دا هاتە دەستەسەرکرن و ژبۆ ماوێ 14 هەیڤان ما دزیندانێ ڤە و پشتی هینگێ هاتبوو دوورئێخستن ژبۆ وەلاتێ سیبیریا، د ماوێ وان سالێن ل سیبیریا مای ژیانا خێزانی دگەل هەڤالەکا خۆ یا شۆڕەشێ پێکئینا و پاشی دەست ب نڤێسینا پەرتووکەکێ کر ب ناڤێ "پێشکەفتنا سەرمایەداریێ ل ڕۆسیا".

پشتی ماوێ خۆ یێ زیندانێ ل سالا 1911 ب دوماهی ئینایی و ئازاد بووی، بەرەڤ وەلاتێن ئەوروپا چوو. پشتی پارتا ئیشتیراکی یا دیموکراتی بوویە دوو بەش، لینین چوو دگەل پشکا هەرە پتر یا "بۆلشفیك"ی.

ل دووڤدا كاودان هاتنه گوهۆرين و لينين وەك كەسايەتيەكێ بهێز و دژوار دناڤ شۆڕەشێ دا دياربوو، شيا ژ وەلاتەكى خۆ بگەهينيته وەلاتەكێ دى هەتا گەهشتيه وەلاتێ سوڤيەتا بەرێ، دەمێ لينين ل سالا 1924 وەغەركرى، كەلەخێ وى ل موزەخانا مەيدانا "سۆر" ل موسكو هاتە هەلگرتن كو ڕۆژانه ب هزارەها خەلك دهاتن و سەرەدانا كەلەخێ وى دكر.

لينين ئەو كەس بوو يێ شيايى هزروبير و بوچوونێن ماركسى بكەتە تشتەكێ ڕاستى و ڕياليستيكى ب شێوەيەكێ بهێز و دژوار و ڕەق، لينين ئەو كەس بوو يێ هزر دكرى كو مرۆڤ نەشێت چ ئارێشەيان چارەسەر بكەت هەكە توندوتيژى و هێزێ ب كارنەئينيت.

هەرچەندە بەرى هينگێ ماركسى ژى ئاماژە ب بوچوونەكا ب ڕەنگى دابوو، لێ لينين هات و شيا توندوتيژى و زۆردارييێ بكەتە فەلسەفە د دەستهەلاتدارييێ دا.

لينين كەسەكێ زيندى و چالاك و پڕى بەرهەم بوو، د ژيانا خۆدا نێزيكى 55 پەرتووكان بەلاڤ كربوون، ئەگەر لينين نەهتبا و ڕێبازا شيوعى ل ڕۆسيا بەلاڤ نەكربا، پێدڤى بوو وەلاتێ ڕۆسيا ژبۆ ماوێ دەهان سالێن دى چاڤەرێ هندێ كربا ژبۆ وێ دەليڤە پەيدابيا بشێت ب دارێ هێزێ و توندوتيژى و تيرۆرێ گەلەك وەلاتێن دى داگيربكەت و فەرمانڕەواييێ لێ بكەت.

هەرچەندە لينين ئێك ژ وان كەسان بوو يێن بانگەوازى ژبۆ هندێ دكر كو ئەو دژى نەخۆشى و زۆردارى و گرتنا دەستهەلاتێ يە ژلايێ كومەكا دەستنيشانكرى يا خەلكى، لێ ئەم دشێن بێژين د ديروكا شيوعاتيێ دا چ كەس نەبوون ب دارێ زۆلم و زۆردارى و نەخۆشى و ترساندن و تيرۆرێ دەستهەلاتكر بيت و ب مليونەهان ژ خەلكى دەربەردەر كربن هندى وێ يا لينينى ل وەلاتێن ئێكەتيا سوڤيەتا بەرى كربيت بێى كو خۆ ميەكى ژى خۆ شاش بكەت بەلكو هەردەم وى ئەڤ كارێ خۆ ب قارەمانى ل قەلەم ددا ژبەركو مەرەما وى ب تنێ ئەوبوو پارتا وى بشێت ب دارێ زۆردارييێ كونترۆلێ ل سەر خەلكى بكەت.

لينينى ئەو كەس بوو يێ بەردەم د گوتى "ئاسن ب تنێ ب ئاگرى دهێتە چەماندن" و مەرەما وى ژ ڤێ گوتنێ ئەبوو كو مرۆڤ گەلەك ژ ئاسنى ڕەقترە لەوڕا دڤێت ب دەستهەلاتەكا دژوار و ڕەق و نەخۆش وەكى ئاگرى حوكم لێ بهێتە كرن. ژبەركو مرۆڤ ژ

ئاسنی ڕەڤترن ئەو پێدڤی ب ئاگرەکێ بێ دویکێل، فشار و نەخۆشی و زورداریێ نە ب هەمی شێوەیان داکو بێدەنگ بن.

ئەگەر کارل مارکس نەهاتبا، ڕەنگە کەسەکێ وەکی لینینی ژی دیار نەببا، لێ بەروڤاژی هوسا نینە ژبەرکو دبیت کەسەکێ دی هاتبا و ڕێبازا مارکسی ل وەلاتێ ڕۆسیا ب کارئینابا و ئەو کار کربان یێن لینینی ئەنجامداین، لێ کەسایەتیا لینینی یا بێ وێنە بوو ئەگەرێ هندێ  ئەڤ ڕێبازە زویکا بهێتە زیندیکرن.

تشتێ سەیر ئەوە پتریا ئەو کەسێن لدویڤ ڕێبازا شیوعیێ دچن ب چاڤەکێ مەزن تەماشەی لینینی دکەت و وەك خوداوەند ل قەلەم ددەن، هەرچەندە وان باوەری ب خودێ نینە و چ ژ پیروزی و ڕێنماییێن ئاینی نزانن!

## 85. سوی ئون تی Sui Wen Ti

## (541ز-604ز)

### سوی ئوین تی

### ئەو ئیمپراتۆرێ شیایی چینێ ژ هەرێمێن دابەشبووی بکەتە وەلاتەکێ ئێکگرتی

ئیمپراتۆرێ چینی یێ ناڤدار سوی ئان تی ناڤێ وی د دیروکێ دا هەردەم دێ مینیت یێ گەش ژبەرکو ئەو شیا وەلاتێ چینی بکەتە وەلاتەکێ ئیگرتی یێ بهێز پشتی کو بۆ ماوێ چەندین چەرخان تووشی هەڤرکیێن نافخۆیی و پارچە پارچە بوونێ بووی. ئەڤ ئێکگرتنە بۆ ئەگەر وەلاتێ چینێ بۆ سەدەها سالێن ل دووڤدا هەر ئێکگرتی و بهێز بمینیت و ژ ئەنجامێ ڤێ چەندێ ژی خەلکێ وەلاتێ چینێ کو نێزیکی پێنچێکا خەلکێ جیهانێ پێکدئینن تووشی ژێکڤەبوون و دابەشبوونێ نەبن، ئانکو نە وەکی خەلکێ ئەورۆپا و ڕۆژهەلاتا ناڤین کو ل سەر چەندین وەلات و هەرێمێن ژێکجوودا دابەشبووینە.

سوی ئون تی ل سالا 451 زاینی ژ خێزانەکا دەولەمەند ژدایکبوویە و دەمێ ژیێ وی ب تنێ 14 سالێ بوویە سەرکێشی لەشکری، ژبەر خۆدان کەسایەتیەکا بهێز و شیانێن مەزن بوو لەورا بەردەوام پلا وی دناڤ بواری لەشکەری دا دهاتە بلندکرن.

ل سالا 573 خویشکا شوی ب کورێ ئیمپراتۆرێ وی سەردەمی یێ چینێ کر و پشتی بورینا پێنج سالان ئیمپراتۆری وەغەکر لەورا کورێ وی بۆ جهگرێ وی، لێ ژبەرکو کورێ نەکەسەکێ ساخلەم و تەمام بوو ژلایێ مێشکیڤە لەورا گەلەك هەڤرکی و ناکوکی دناڤبەرا سەرکردەیێن سیاسی وەلاتی ل سەر وەرگرتنا دەستهەلاتێ پەیدابوون و ل دوماهیێ سوی ئون شیا مفایی ڤان هەڤرکیان وەربگریت و ببیتە ئیمپراتۆرێ نوو یێ وەلاتی کو لوی سەردەمی ژیێ وی نێزیکی 40 سالان بوو.

ڤی ئمپراتۆرێ نوو هەست ببەختەوەری و خۆشیێ نەدکر ژبەرکو وی ب تنێ دەستهەلات ل سەر باکورێ چینێ هەبوو و ڤێ چەندێ وەل وی دکر هەست ب کێماتیێ

بکەت لەوڕا هێزێن خۆ یێن لەشکەری هەمی کومکرن بەرەڤ پارچەیێن دی یێن وەلاتی چوو داکو داگیربکەت و بکەتە لبن دەستهەلاتداریا خۆڤە.

ئەو هەر زویکا شیا بگەهیتە مەرەما خۆ و ل سالا 588 شیا هەمی پارچەیێن چینێ داگیربکەت وبکەتە وەلاتەکێ ئیکگرتی و پایتەختەکی بۆ بدانیت و دەستهەلاتدریێ لێ بکەت. ل دویڤدا بریاردا کەنالەکێ مەزن بهێتە ئاڤاکرن کو ڕویبارین چینێ پێکڤە گرێدەت لێ ئەو نەشیا ڤێ چەندێ تەمام بکەت بەلکو ل سەر دەمێ کورێ وی کو پشتی هینگێ ببوو ئیمپراتۆر ئەڤ کارە هاتە تەمامکرن.

ژ گرنگترین کارێن ڤی ئیمپراتۆری ئەنجامداین ئەوبوو کو وی فەرمانبەرێن وحکومەتێ لب ڕێکا تاقیکرنەکێ د هەلبژارتن لەوڕا ئەڤ چەندە بوو ئەگەر باشترین کەس ل جهێن ژ هەژی بهێنەدانان و ڕێك ل کەسێن لاواز و نەخودان شیان هاتەگرتن ببنە فەرمانبەرێن حکومەتێ.

هەروەسا وی یاسایەکا دی دەرێخست کو نابیت فەرمانڕەوایێ هەر دەڤەرەکێ یان هەرێمەکێ ژ خەلکی وێ دەڤەرێ بیت، مەرەما وی ژ ڤێ چەندێ ژی ئەوبوو داکو کەسوکارێن وی ل دور وی خڕڤەنەبن و نەبیتە ئەگەر ئەو بزاڤێ بکەن دژی حکومەتا ناڤەندی شەڕی بکەن و خۆ ژێ ڤەکەن.

ئەڤ ئیمپراتۆرە گەلەك یێ هشیاربوو و نەدهێلا کێماسی ل چ جهان پەیدابن، د هەمان دەمدا بریاردا کرێ و باج ل سەر خەلکی بهێتە کێمکرن داکو حەژێکرنا وان بدەستخۆڤە بینیت، هەروەسا سیاسەتا وی یا ژدەرڤە ژی تا ڕادەیەکێ باش یا سەرکەفتی بوو.

سەرەڕای هندێ کو ئەو ئیمپراتۆرەکێ بهێز بوو، لێ ئەو ژ خەلکی دترسا و هزرێن شاش ژی دکرن و زوی ب زوی باوەری ب کەسێ نەدئینا. خێزانا ویژی ڕۆلەکێ مەزن هەبوو و پشتەڤانەکا باش بوو ژبۆ وی، هەورەسا خانمەکا خۆدان دەستهەلات بوو دناڤ حکومەتێ دا.

سوی ئون تی د ژیێ 63 سالیێ دا وەغەرکر و کورێ وی جهێ وی گرت، ژێدەرێن دیروکی ددەنە دیارکرن کو ئەڤ کورە ژی لدویف شێن پێن بابێ خۆ چوو لێ پتر یێ خوشتڤی بوو ل دەف خەلکی ژ بابێ خۆ .

لێ پرسیار ل ڤێرێ ئەڤەیە ئەرێ گرنگیا ڤی ئیمپراتۆری و کاریگەریا وی ل سەر مرۆڤان چ بوویە؟ هەلبەت ئەڤ گرنگە دێ ب باشی بۆمە خۆیابیت ئەگەر ئەم هەڤبەرکرنەکێ دناڤبەرا وی و دناڤبەرا ئیمپراتۆرێ ئەوروپی یێ مەزن "چارلیمان"ی دا بکەین.

گەلەك وەکهەڤی دناڤبەرا ڤان هەردوو ئیمپراتۆران دا هەبوون. پشتی سێ چەرخان ژ کەفتنا ڕۆما، چارلیمان شیا وەلاتێن ئەوروپا ڕۆژئاڤا بکەتە ئێك، هەروەسا سوی ئون ژی شیا ئیمپراتۆریا چچینێ بکەتە ئێك پشتی ئیمپراتۆریا هانی. جوداهی ئەوە چارلیمان کەسەکێ ناڤداربوو ل ئەوروپا ب تنێ لێ سوی ئون ژوی بهێزتربوو و کاریگەریا وی ل سەرهژمارەکا پتر یا مرۆڤان و بۆ ماوەیەکێ درێژتربوو.

سوی ئون شیا هەرێمێن چینێ هەمیان بکەتە ئێك، لێ چارلیمان نەشیا ئەوروپا ڕۆژئاڤا و ئینگلتەرا و ئیسپانیا و ئیتالیا بکەتە ئێك. هەروەسا ئێکەتیا چینێ بۆ ماوەیەکێ درێژ ڤەکێشا لێ پشتی مرنا چارلیمانی ئێکەتیا ئەوروپا ڕۆژئاڤا گەلەك نەڤەکێشا.

هەردیسا شۆڕەشا ڕەوشەنبیری ل چینێ بۆ ماوەیەکێ درێژ ما زیندی لێ بەروڤاژی ئەڤ شۆڕەشە ل ئەوروپا پشتی مرنا چارلیمان بەرەڤ نەمانێ چوو. ژبەر ڤێ چەندێ ئەم دشێن بێژین کاریگەریا سوی ئون تی ژلایێ لەشکەری و شارستانی و جڤاکیڤە ل سەر مللەتێ چینی بۆ سەدەها سالان ڤەکێشا.

## 86. فاسكو دا گاما Vasco Da Gama

## (1460ز. - 1524ز.)

### فاسكو دا گاما

### ئەو دەریاڤانێ ڕێكەكا ب سەلامەت ژ پرتۆگال بۆ هندێ ئاشكەراكرى

فاسكو دا گاما ئەو گەرۆكێ پرتۆگالی بوو یی كو شیایی ڕێكەكا دەریایی یا ڕاستەخۆ ژ كێشوەرێ ئەوروٚپا هەتا وەلاٚتێ هندێ ئاشكەرا بكەت ئەوژی پشتی كو شیایی ب سەركەفتیانە ل دور كێشوەرێ ئەفریقیا بزڤڕیت. ئەڤ ڕێكە گەلەك یا گرنگ بوو و هەر ژ سەردەمێ میر "هێنری یێ دەریاڤان " بەردەوام گەرۆكێن دەریایی ل ڕێكەكا ئارام دگەریان داكو ب سانەهی بگەهنە وەلاٚتێ هندێ ژبەركو نەدشیان د ڕێكا هشكاتی دا ب سلامەتی بگەهنە ڤی وەلاٚتی.

ل سالاٚ 1488 هەوەك ب سەركێشیا "بارتولومیو دیاس" شیا بگەهنە دەڤەرا "سەرێ هیڤیا باش"[1] ل نێزیك لێڤا خارێ یا كێشوەرێ ئەفریقیا، پشتی هینگێ ڤەگەریا وەلاٚتێ پرتۆگال و بۆ شاهێ وەلاٚتی دیاركر كو ئێدی ڕێكا چوونا وەلاٚتێ هندێ نە تشتەكێ مەحالە لێ هەتا هینگێ ژی وان ئەو ڕێكە ئاشكەرا نەكربوو هەتا پشتی هینگێ ب ماوەیەكێ كێم شاهی فاسكو دا گاما ڕاسپارد سەركێشیا گەشتەكا نوو بكەت ژ پێخەمەت ڤەدیتنا ڕێكەكا ب سەلامەت بۆ وەلاٚتێ هندێ.

دا گاما ل سالاٚ 1460 ل باژێرێ "سینس" یێ پرتۆگالی ژدایكبوویە، وی ژیانا هەڤژینیێ پێكئینابوو و حەفت زاروك هەبوون. ل ڕۆژا 8 تیرمەها 1497 گەشتەك كو یا پێكهاتی بوو ژ چوار پاپۆران و 170 دەریاڤان دەستپێكر كو هندەك وەرگێڕ دناڤدا هەبوون و زمانێ عەرەبی باش دزانی. لدەستپێكێ گەشتا خۆ ژ گزیرتا "سەرێ كەسك"[1]

---

[1] سەرێ هیڤیا باش ئەو دەڤەرە یا دكەڤیتە سەرێ ڤارا ئەفریقیا ژلایێ خوارێ ڤە ل نێزیكی دەڤەرا "كیب تاون" و وشێوێ وێ وەكی سەرەكێ تیژە و دكەڤندا ئەو پاپۆرێن ژ ئەوروٚپا دهاتن د وێ ڕێكێ ڕا دچوونە كێشوەرێ ئاسیا.

[1] گزیرتا سەرێ كەسك دكەڤیتە وەلاتێ سینیگال ل كێشوەرێ ئەفریقیا و درێژاهیا وێ نێزیكی 150 كیلومەترانە.

دەستپێکر و دگەل کنارێن ڕۆژئاڤایی یێن کێشوەرێ ئەفریقیا دچوو هەروەکی کا چەوا گەرۆکڤان دیاس بەری هینگێ د وێ ڕێکێ ڕا چووی. پاشی بەرەڤ ڕۆژهەلاتی چوو هەتا گەهشتیە سەرێ هیڤیا باش کو بەرێ هینگێ هاتبوو ئاشکەراکرن.

ل دووڤدا دا گاما بەرەڤ کنارێ ڕۆژهەلاتی ئەفریقیاڤە چوو و پاشی ل هندەك باژێران ڕاوەستیا کو ئاکنجیێن وان موسلمان بوون وەك باژێرێن "مومباسا" و "مالندی" و دسەردەمێ ئەڤروکە دا ئەڤ هەردوو دەڤەرە دکەڤنە وەلاتێ کینیا.

ل باژێرێ مالندی وی کەسەکێ هندی دگەل خۆ سیارکر داکو ڕێکا چوونا وەلاتێ هندێ نیشا وان بدەت و پشتی بۆماوێ 23 ڕۆژێن دیژی د دەریایا عەرەبی دا بەردوامی دایە گەشتا خۆ، ل ڕۆژا 20 خزیرانا 1498 ئانکو پشتی 10 هەیڤان ژ دەستپێکرنا گەشتا خۆ شیا ب سلامەتی بگەهنە باژێرێ "کەلەکتا" ل وەلاتێ هندێ کو هەر زوی گەلەك بازرگانێن عەرەب و هندی لێ خڕڤەبوون و دەمێ زڤڕین ب تەنان بهارات دگەل خۆ ئینانە پرتۆگالێ و پێشکێشی شاهی کرن. هەروەسا وی هندەك کەسێن هندی ژی دگەل خۆ ئینابوون وەك بەلگە ل سەر هندێ کو ئەو گەهشتیە وەلاتێ هندێ.

دەمێ ئەو د ڕێکا خۆدا زڤڕین تووشی گەلەك ئاستەنگ و نەخۆشیان بوون، ب تنێ دەمێ ددەریایا عەرەبی دا دەربازبووین بو ماوێ پتر ژ سێ هەیڤان گیروبوون و گەلەك ژ هەڤالێن وی ژبەر نەخۆشیا کێمبوونا ڤیتامین C و دژواریا تیشکا هەتاڤێ گیانێ خۆ ژدەستدان. هەروەسا دوو پاپۆرێن وان پویچ بوون و ب تنێ دوو پاپۆر ب سلامەت گەهشتن.

پاپۆرا ئێکێ ل ڕۆژا 10 تیرمەها 1499 گەهشتە پرتۆگال، لێ ئەو پاپۆرا دا گاما تێدا پشتی هینگێ ب دوو هەیڤان گەهشت و ل دوماهیێ ژ سەرجەمێ 170 دەریاڤانان ب تنێ 55 کەس مابونە ساخ. دەمێ ل ڕۆژا 9 چریا دوێ یا سالا 1499 دا گاما گەهشتیە باژێرێ "لیشبونە" شاهی پێشوازیەکا مەزن لێکر و پەسنا هندێ کر کو گەشتا وان یا دوو سالی بوویە ئەگەرێ سەرکەفتنەکا دەریایی یا مەزن.

پشتی بورینا شەش هەیڤان، شاهی شاندەکێ دی ب سەرکێشیا کابتن "کابرال"ی فرێکرە هندێ و دەمێ ئەوژی زڤڕیە پرتۆگالێ برەکا مەزن یا بهارات دگەل خۆ بۆ شاهی ئینان لێ هژمارەکا هەڤالێن وی ل باژێرێ کەلەکتا هاتنە کوشتن، ژبەر هندێ دا گامای ل

سالا 1502گەشتەکا دی ب هەڤالێنیا 20 پاپۆران بەرەڤ هندێ ئەنجامدا داکو تۆلا دەریاڤانێن خۆ ژ هندیان ڤەکەت.

ئەڤ گەشتا وان یا خویناوی بوو ژبەرکو هەر هێشتا ل دەریایی عەرەبی وان پاپۆرەکا تژی بهارات دەستەسەکر و سووت و خەلکێ وێ ژ زەلام و ژن و زاروکان هەمی کوشتن و بهارات بۆ خۆ برن. دەمێ گەهشتیە باژێرێ کەلەکتا ژی داخاز ژ هندیێن سەر لێڤا بەندەرێ دەریایی چەکێن خۆ بدانن لێ هندیان ئەڤ داخازا وی رەتکر لەورا وی 80 دەریاڤانێن هندی سووتن و کوشتن و پاشی بۆمب هاڤێتنە بەندەری و سووت.

دەمێ زڤڕیە پرتۆگالێ ڤە، د ڕێکێ دا هندەك میتانگەهێن پرتۆگالی ل باکورێ ئەفریقیا دانان، ژبەر هندێ شاهی گەلەك خەلات و دیاری و پارچەییێن عەردی و کوچك پێشکێشی وی کرن. پشتی هینگێ وی چ گەشتێن ئەنجامنەدان هەتا شاهەکێ دی هاتیە سەر حوکمی و دی گاما کرە جێگرێ خۆ ل وەلاتێ هندێ، لێ پشتی بورینا چەند هەیڤان ب گەهشتنا وی بۆ هندێ نەساخ بوو و ل سالا 1524 گیانێ خۆ ژدەستدا و پاشی ل باژێرێ لیشبونە هاتە ڤەشارتن.

گرنگیا گەشتێن دی گامای بوونە ئەگەر ڕێکەکا نوو و ب سەلامەت و ڕاستەخۆ بەرەڤ هندێ بهێتە ئاشکەراکرن و ڤێ چەندێ گرنگیەکا مەزن د دیروکێ دا هەبوو، ژبەرکو لوی سەردەمی خەلافەتا عوسمانی دەستهەلاتداری ل ئاسیا بچووك دکر و نەدهێلا بازرگانێن مەسیحی د ڕێکا هشکاتی را بچنە هندێ لەورا ژی دەریاڤانێن ئەوروپی بەردەوام ل ڕێکەکێ دگەریان بگەهنە ڕۆژهەلاتی.

هەردیسان ئاشکەراکرنا ڤێ ڕێکێ بوو ئەگەر پرتۆگال ژ وەلاتەکێ هەژار بێ ببیتە ئێك ژ وەلاتێن هەرە زەنگین و ب هێز ل جیهانێ و هەر زوی دەست ب چێکرنا هژمارەکا مەزن یا میتانگەهێن پرتۆگالی کر ل سەر کنارێن زەریا هندی.

# 87. کۆرشێ مەزن Cyrus the Graet

## (590 ب.ز - 529 ب.ز)

### کۆرشێ مەزن

### دانەرێ ئیمپراتۆریا فارسی یا مەزن

کۆرشێ مەزن دهێته نیاسین ب دانەرێ ئیمپراتۆریا فارسی یا مەزن، ل دەستپێکێ دەستهەلاتدارێ دەڤەرەکا بچووك یێ ئیرانێ بوو، لێ پشتی هینگێ بریاردا دەستهەلاتداریا خۆ بەرفرەهـ بکەت و چەندین شەڕێن مەزن دەستپێکرن و شیا سێ مەزنترین ئیمپراتۆریێن وی سەردەمی بێخیت ئەوژی ئیمپراتۆرییێن میدی و لیدی و بابلی بوون. کۆرش شیا پتریا وەلاتێن جیهانا کەڤن داگیربکەت و وەلاتەکێ ئێککرتی دروست بکەت کو هەر ژ هندێ هەتا دەریا ناڤەڕاست درێژ دبوو.

کۆرش ل سالا 590 بەری زاینی ل هەرێما "فرسیس" کو دکەڤیتە باشورێ ئیرانێ و وی دەمی بەشەك بۆ ژ ئیمپراتۆریا میدی ژدایکبوویە. ئەو ب خۆ کورێ بنەمالەکا دەستهەلاتداربوو.

دەربارەی ژیانا وی یا زاروکینیێ هندەك چیرۆك و چیڤانوك دهێنە گوتن هەروەکی زاروکینیا شاهێ گریکی یێ مەزن "ئودیب"ی. چیڤانوك دبێژن باپیری وی خەونەك دیت کو نەڤیێ وی دێ وی کوژیت و جهێ وی گریت. دەمێ کۆرش ژدایکبووی باپیری وی بریاردا بکوژیت لەوڕا زاروك داف زێرەڤانەکێ خۆ داکو بکوژیت لێ زێرەڤانی ژی دلنەدا بکوژیت لەوڕا داف جوتیارەکی داکو ئەو بکوژیت، جوتیاری ژی دلنەدا زاروکی بکوژیت بەلکو ب دزیکیڤە بخۆدان کر و دەمێ ئەڤ زاروکە مەزن بووی و بویە شاهـ باپیرێ خۆ کوشت.

ئەڤ چیرۆکە ژلایێ دیروکنڤیسێ گریکی "هیرودوت"ی ژی هاتیە نڤیسین لێ ئەم نەشێن پشت بەستنێ بکەینە سەر ژبەرکو چ بەلگە نینن ڕاستیا ڤێ چەندێ دیاربکەت لەوڕا دبیت ژ فانتازیا کەسەکی هاتبیتە وەرگرتن. دیروك چ پێزانینان دەربارەی زاروکینیا

کۆرشی بومە ناڤەگوهێزیت بەلکو ب تنێ ئەو چەندە یا دیارە کو کۆرش پشتی مرنا بابێ خۆ "قەمبیزێ ئێکێ" شاهێ فارسان هاتیە سەر کوسیکا دەستهەلاتێ.

کۆرشی شەڕێن خۆ دەستپێکر و وەلاتێن دی خۆ لبەر هێرشێن وی نەدگرت لەوڕا و ئێك ئێکە شاهێن وان دکەفتن. ل دووڤدا کۆرش بەرەڤ ئیمپراتۆریا لیدیا (تورکیا سەردەمێ ئەڤروکە) ڤە چوو و شاهێ وێ ئێخسیرکر و زێر و مالێیەتێ وی بۆ خۆ ڕاکر.

ل دووڤدا بەرەڤ ئیمپراتۆریا بابلی ڤە چوو لێ شاهێ بابلێ نەشیا بەرەڤانیێ ژ وەلاتێ خۆ بکەت لەوڕا کۆرش بێی شەڕ چوو دناڤ وەلاتێ وی دا کو سوریا و فلەستین ژی بخۆڤە دگرتن. ل دووڤدا بەرەڤ دەڤەرێن ڕۆژهەلاتا دەریا قەزوین ڤە چوو لێ ڤان دەڤەران بەرەڤانی ژخۆ کر. کۆرش نەشیا ڤان دەڤەران داگیربکەت بەلکو هاتە شکاندن. لوی سەردەمی کو کۆرش مەزنترین ئیمپراتۆرێ جیهانێ بوو هاتە ئێخسیرکرن و سەرژێکرن.

پشتی هینگێ کورێ وی قەمبیزێ دووێ شیا هوزێن دەوروب\بەری دەریا قەزوین بشکێنیت و گورێ بابێ خۆ ژ وێرێ بینیت و ل باژێرێ "باسار جادی" ڤەشێریت. ل دووڤدا هێزین وی بەرەڤ وەلاتێ مسرێ چوون و داگیرکر و بڤی ڕەنگی ڕۆژهەلاتا ناڤین هەمی بۆ بەشەك ژ ئیمپراتۆریا فارسی.

کۆرش سەرکردەکێ لەشکەری یێ چەلەنگ بوو، لێ چەلەنگیا وی یا لەشکەری ب تنێ بەشەك بۆ ژ مەزناهیا وی بەلکو مەزناهیا وی یا ب دروستاهی د لێبورینا وی یا ئاینی دا بوو ژبەرکو ئەو ب خۆ نەکەسەکێ توندڕەو بوو بەلکو کەسەکێ میانرەو و دلوڤان بوو. بابیلان کو بەری هینگێ ب هزارەها جوهی ژ وەلاتی کربوونە دەرێ، پشتی کۆرش هاتی بریاردا جوهی ب ڤەگەرنە فەلەستینێ و مافێن وان دانێ و ب ئازادی شیان پەرستگەهێن خۆ ئاڤاکەن، ئەم دشێ، بێژین هەکە کۆرش نەبا دبیت جوهی ب ئێکجاری ل چەرخێ پێنچێ زاینی بەرەڤ نەمانێ چووبان.

هەردیسان ژ ئێك ژ کاریگەریێن ڤی شاهی ئەوبوو کو ئیمپراتۆریا وی شیا بۆ ماوێ پتر ژ 200 سالێن پشتی هینگێ د ئارامی و بەختەوەریێ دا بژیت هەتا ئەسکەندەرێ مەقدونی هاتی و ئیمپراتۆریا فارسان داگیرکری و پویچ کری.

مەزناهیا کۆرشی بۆ وان شەڕێن مەزن نازڤڕیت یێن وی دژیانا خۆدا ئەنجامدایین، هەردیسان بۆ هندێ ژی نازڤڕیت کو ئەو شیابوو گەلەك وەلاتان داگیربکەت وبکەتە ئێك،

بەلكو گرنگیا وی بۆ هندێ دزڤڕیت کو سەرکەفتنێن وی بوونە خالێن وەرچەرخانێ د دیروکا سیاسی  یا جیهانا کەڤندا.

هەرچەندە کاریگەریا ئیمپراتۆریا فارسی هند یا مەزن نەبوو وەکی وێ کاریگەریا ئیمپراتۆرییێن ڕۆمانی و بڕیتانی و چینی ل پاش خۆ هێلاین. لێ ئەم دشێن بێژین ئەو کاریگەریا کۆرشی ب تنێ ل پاش خۆ هێلای گەلەك یا مەزن بوو ژبەر هندێ ئەو دهێتە هژمارتن ئێك ژ وان سەرکردەیێن ئاڕاستەیێ دیروکا مرۆڤایەتیێ گوهارتی.

## 88. پیتەرێ مەزن Peter The Great

## (1672ز. - 1725ز.)

### پیتەرێ مەزن

### ئەو قەیسەرێ ڕۆسیا ژ وەلاتەکێ پاشکەفتی کریە ئێك ژ پێشکەفتیترین وەلاتێن جیهانی

پیتەرێ مەزن دهێتە هەژمارتن مەزنترین قەیسەرێ ڕۆسی ژبەرکو ئەو شیا ب سەکەفتیانە سیاسەتا "ڕۆژئاڤایکرنێ" ئانکو گوهۆینا ڕۆسیا بۆ وەلاتەکێ ڕۆژئاڤایی ئەنجامبدەت و ئەڤ چەندەژی مەزنترین پێنگاڤ بوو کو دەستهەلاتدارەك بشێت بۆ ڕۆسیا بدەستڤە بینیت.

پیتەر ل سالا 1672 زاینی ل باژێرێ موسکو ل وەلاتێ ڕۆسیا ژدایکبوویە و کورێ ئێکانەیێ قەیسەر "کەسیس" ژ هەڤژینا وی یا دوێ ب ناڤێ "ناتالیا ناریکینا"بوو. دەمێ ژیێ وی بوویە چوار سالێ بابێ وی وەغەرکر.

بابێ وی 13 کور ژ هەڤژینا خۆ یا ئێکێ هەبوون لەوڕا تشتەکێ سەیر نەبوو ئەگەر هەڤڕکیێن مەزن ل سەر دەستهەلاتێ دناڤبەرا واندا پەیدابن هەتا وی ڕادەی ڤان هەڤڕکیان مەترسی ل سەر ژیانا پیتەرێ زاروك ژی پەیداکر لەوڕا دەیکا وی نەچاربوو ژبۆ پاراستنا ژیانا وی دگەل کورێ خۆ بەرەڤ جهەکێ دی بچن. خویشکا وی یا نەدەیبابی "سۆفیا" بۆ دەسهەلاتدارا ڕۆسیا هەتا سالا 1689 پیتەری بهێزکەفتی و شیا خویشکا خۆ ل سەر دەستهەلاتێ لادەت.

ل سالا 1689 ب هەڤبەرکرن دگەل وەلاتێن ڕۆژئاڤایی، ڕۆسیا وەلاتەکێ گەلەك پاشکەفتی بوو و باژێرێن وێ دکێم بوون و ڕوبەرێ وان ژی یێ بچووك بوو. هەروەسا سیستەمێ کارێ ب زۆری لوێرێ دهاتە پەیرەکرن و هژمارا زەلامێن دەرەبەگ ڕۆژ بۆ ڕۆژێ دزێدەبوونێ دا بوون و جوتیار و کرێکاران ژی چ ماف نەبوون. چ بزاڤێن وەکی بزاڤا شۆڕەشێ و چاکسازیا گشتی ل ئەوروپا ل وەلاتێ ڕۆسیا پەیدانەبوون و زەلامێن ئاینی ژی خەلك پشت گوهـ هاڤێتبوو.

هەردیسا ل ڕۆسیا چ بەرهەمێن ئەدەبی و هونەری نەبوون و زانست و ماتماتیك هاتبوونە ژبیرکرن. لێ بەروڤاژی ل ئەورۆپا ئەڤ بوارە د گوپیتکا پێشکەفتنێ دا بوون. لوی سەردەمی نیوتن ناڤداربببوو و پەرتووکا وی "بنەما" ژ نوو دەرکەفتبوو. هەروەسا بوارێن ئەدەبی و فەلسەفی ژی د گوپیتکا پێشڤەچوونێ دابوون.

دناڤبەرا سالێن 1697 و 1698 دا پیتەرێ مەزن د گەشتەکێ دا بەرەڤ وەلاتێن ئەورۆپی ڤە چوو. ئەڤ گەشتە بوو خالا وەرچەرخانێ دژیانا وی و ژیانا خەلکێ ڕۆسیا هەمیێ دا، د ڤێ گەشتێ دا وی 250 کەس دگەل خۆ بربوون داکو ڕاپۆرتان ل سەر پێشکەفتنا ئەورۆپا بنڤیسن و پشتی هینگێ ئەڤ بشێن مفای بۆخۆ ژێ وەربگرن.

پیتەری ناڤەکێ خوازراو بۆ خۆ دانا داکو بشێت ب ئازادی دناڤ خەلکی دا بگەریت و هەمی تشتان ب چاڤێ خۆ بینیت ژبەرکو ئەگەر خەلکی زانیبا ئەو شاهە نەدشیان هەمی تشتان نیشا وی بدەن و دگەل خۆ بدەنە بکەن.

ل وەلاتێ بڕۆسیا وی وەك دارتاش و کرێکارێ دروستکرنا جادەیان کارکر و بەردەوام سەرەدانا موزەخانە و قوتابخانە و زانکۆ و کارگەهێن دروستکرنا چەکی دکر. هەروەسا شیا د کومبونەکا پەرلەمانێ بریتانی ژی دا ئامادەبیت و شیا گەلەك پێزانینان ل دور زانست و پیشەسازی و هونەرێ ب ڕێڤەبرنا وەلاتی و سیاسەتێ فێرببیت.

دەمێ پیتەری زڤڕیە وەلاتێ خۆ ئێکەم تشت بریاردا ڕۆسیا بکەتە وەلاتەکێ ڕۆژئاڤایی. گرنگی دا پێشئێخستنا زانستێ نوو و هونەرێ سەردەم و هژمارەکا بسپورێن ڕۆژئاڤایی د هەمی بواراندا داخازکرنە وەلاتێ خۆ، دهەمان دەمدا پشتەڤانیا گەنجان کر بچنە وەلاتێن ئەورۆپی بخوینن و فێرێ زانینا وان بن و بۆ ڤێ چەندێ پارەیەکێ باشی و پۆستێن بلند دانێ.

ل سەردەمێ وی ئێدی هێدی هێدی باژێر مەزن بوون و پێشکەفتن، هەر ل سەر وەختی وی ئێکەم بەندەرێ ئاڤی هاتەدانان و بریاردا لەشکەری جلکەکێ وەکهەڤ و چەکەکێ باش هەبیت و ژلایێ بسپورێن ڕۆژئاڤایی ڤە ڕاهێنان پێ دهاتنە کرن. هەروەسا وی گەلەك سیستەمێن نوو یێن کارگێری ئینانە دناڤ وەلاتی دا و باژێر پێکڤە گرێدان.

ل دووڤدا وی بریاردا هەمی زەلام رهێن خۆ بتراشن لێ پشتی هینگێ هندەك گوهۆرین دڤێ بریارا خۆدا کرن. پاشی بریاردا زەلامێن کوچکا شاهی جلکێن ئەوروپی بکەنە بەر خۆ و پشتەڤانیا وان ل سەر کێشانا جگارەیان و ڤەخوارنا مەیێ کر.

هەرچەندە گەلەك خەلکێ وەلاتی وی دژی ڤێ پرۆسێسا رۆژئاڤایکرنێ راوەستیان لێ ل دوماهیێ هەمی نەچاربوون فەرمانێن قەیسەری بجه بینن لەورا ئێدی تەخەکا ئۆرستکراتی پەیدابوون کو شێوازێ ژیانا وان وەکی یێ ئەوروپیان بوو.

پیتەری هوسا دیت کو دێرا ئارسوزکسی ژێدەرێ ئاینێ یە لەورا شیا کونترۆلێ ل سەر بکەت و پێشبێخیت، ل دووڤدا وی هندەك قوتابخانەیێن باژێری ڤەکرن ئانکو زەلامێن دێرێ چ کونترۆل ل سەر ڤان قوتابخانەیان نەبوو و ماف نەبوو مایێ خۆ تێ بکەن. هەردیسان زمانێ رۆسی پێشئێخست و سالنامەیا رۆژئاڤایی بکارئینا و ل هەر ل سەر دەمێ وی هژمارەکا رۆژنامەیان دەرکەفتن.

ل سەردەمێ پیتەری مەزن رۆسیا تووشی هژمارەکا شەران بوو، ل باشوری شەر دگەل وەلاتێ تورکیا هەبوو هەتا کنارێن دەریا رەش و ل باکوری ژی تووشی چەندین شەران بوو دگەل وەلاتێ سوید و تووشی شکەستنێ بوو لێ پیتەری گەلەك پشتەڤانیا لەشکەرێ رۆسی کر هەتا ل دوماهیێ شیای لەشکەرێ سویدی ل دەڤەرا "بۆلتا" ل سالا 1709 بشکێنیت و ب ڤی رەنگی رۆسیا شیا رۆبەبەرەکێ مەزن یێ عەردی بدەستخۆڤە بینیت کو پێکدهات ژ "ئەستونیا" و "لاتفیا" و بەشەکێ مەزن ژ عەردێ "فێنلەندا".

هەرچەندە بدەستڤەئینانا ڤی عەردێ مەزن چ سەرکەفتنێن گرنگ نەبوون لێ گرنگیا وان بۆ هندێ دزڤری کو ئێدی وەلاتێ رۆسیا ل سەر کنارێن "بەلتیك" درێژبوو و سنورێن ئاڤی پەیداکرن.

ل سەر رویبارێ "نیفا"، پیتەری مەزنترین باژێر ئاڤاکر و ب باژێرێ "پیتەرسپورگ" ناڤکر لێ ل سەردەمێ ئەڤروکە ناڤێ وی هاتیە گوهۆرین بۆ باژێرێ "لنینگراد". ل سالا 1712 ئەڤ باژێرە ل شوینا باژێرێ "موسکو" کرە پایتەخت و بزاڤا پێشخستن و ئاڤاکرنێ ل ڤی باژێری بارێ وی گەلەك گران کر لەورا نەچاربوو باجەکا زێدەتر ل سەر زەنگین و بەرپرسان بسەپینیت.

سەرەڕای هەبوونا جووداهیا بیروڕایان دناڤبەرا دیروکڤانێن هەمی قوتابخانەیێن سیاسی، لێ هەمی ل سەرهندێ ڕێکەفتیە کو پیتەر مەزنترین قەیسەرێ ڕۆسی بوو.

پیتەرێ مەزن یێ بەژن بلند و بهێز بوو و گەلەك حەز ژ خۆشیێ و نوكتەیان دكر. گەلەك پارە ل خۆشی و ڤەخارنێ دمەزختن، هەردیسان كەسەكێ خۆدان شیان و دەستنرەنگین بوو د گەلەك كارێن دەستی دا لەوڕا ژی دهێتە هەژمارتن شاهەكێ ئێكانە یێ کو شیایی ب هاریکاریا دەستێن خۆ هەڤڕكیێ دگەل كەسێن دی بكەت یێن پیشەیێ وان كارێ دەستی و ناڤمالێ.

پیتەری دوو جاران ژیانا هەڤژینییێ ئێكئێنابوو، جارا ئێكێ دەمێ ژییێ وی 17 سالێ و ب تنێ بۆ ماوێ حەفتیەكێ مانە دگەل ئێك، جارا دوێ ژیانا هەڤژینییێ دگەل "كاترینا"یێ پێكئینا. پیتەری كورەك ب ناڤێ "ئەلكس" ژ هەڤژینا خۆ یا ئێكێ هەبوو و بەردەوام هەڤڕكی دناڤبەرا واندا هەبوو هەتا ل سالا 1718 كورێ خۆ زیندان كرو ئەشكەنجەدا هەتا د زیندانێڤە وەغەركری.

لێ پیتەر ل سالا 1725 وەغەركر و هەڤژینا وی كاترینا پشتی وی هاتە سەر تەختێ دەستهەلاتێ.

یا پێدڤیی بوو ناڤێ پیتەری ژی دگەل لیستا كەسێن كاریگەر د دیروكێ دا هاتی ژبەركو ئەو ئێكەم شاهـ هەست ب هندێ كری خەلكێ خۆژی پێشبێخیت داكو بگەهنە ئاستێ شارستانیا ڕۆژئاڤایی، لێ گەلەك شاهێن دیژی هەست ب ڤێ گرنگیێ كربوو و خەبات ژی ژبۆ ڤێ چەندێ كربوو لێ مە ناڤێ وان نەكریە دگەل ڤێ لیستێ!

ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤڕیت کو ڕاستە ئەڤ گرنگیدانە بۆ ڤی سەردەمی یا باشە لێ مەزناهیا پیتەری بۆ هندێ دزڤڕیت کو ئەوی بەری چەرخێ مە هەست بڤێ گرنگیێ كر و كاربۆكر لەوڕاژی ل سەردەمی وی ڕۆسیا پێشكەفت، لێ وەلاتەكی دی یێ وەكی توركیا ئەڤ چەندە نەكر هەتا "ئەتاتورك" هاتی و ب دارێ زۆرداری و تەعدایێ وەلاتێ خۆ پێشئێخست و دبیت ئەگەر ل سەردەمێ پیتەری ژی كەسەك ل توركیا پەیدابیا و چاڤ ل پێشكەفتنا ڕۆژئاڤایی كربا دبیت ئەڤروكە ئەو ل شوینا ڕۆسیا ببا وەلاتەكێ بهێز ب تایبەت ل ئاسیا ناڤەڕاست کو نوكە ڕۆسیا دەستهەلاتێ لێ دكەل ب ملیونەها موسلمان لێ دژین.

هندەك دیروکنڤێس هەڤبەرکرنێ دناڤبەرا پیتەرێ مەزن و شاهژن ئەلیزابیزا ئێکێ دا دکەن، لێ ئەم نابینین ئەڤ چەندە یا دروست بیت، بۆ نموونە ئەلیزابیزا ل ڕۆژئاڤاییی یا ناڤدار و ئەو تشت بۆ خەلکێ خۆ کر یێ دشیانێن وێدا و یێ خەلکێ داخازکری، لی پیتەری ئەو تشت ل سەر خەلکێ خۆ نەچارکر یێ وان نەدڤیاییی و ژ ڕۆژئاڤاییی بۆ ئیناى و ب ڤێ چەندێ بۆ ئێك ژ وان کەسێن ئاڕاستێ دیروکێ گوهارتی.

# 89. ماو تسی تۆنگ Mao Zedong

## (1893ز. ــ 1976ز.)

### ماو تسی تۆنگ

### ئەو سەرکردێ چین کریە ئێك ژ پێشکەفتیترین وەلاتێن جیهانێ

ماوتسی تونگ ئەو سەرکردێ پارتا شیوعی یا چینی بوو یێ شیایی بۆ ماوێ 27 سالان فەرمانڕەوایێ ل وەلاتێ چینێ بکەت و دڤی ماوەی دا شیا هندەك گوهۆرینێن هزری یێن مەترسیدار کو هەڤشێوەیێن وان د دیروکێ دا ڕۆینەداینە بکەت.

تۆنگ ل سالا 1893 ل ل گوندەکێ ویلایەتا "هونان" ژدایکبوویە. بابێ وی جوتیارەکێ دەولەمەند بوو، دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 18 سالیێ، شۆڕەشەك دژی سیستەمێ پاشایەتیێ هاتەکرن ئەوا کو هەر ژ چەرخێ 17 زاینی دەستهەلات گرتبوو دەست.

پشتی چەند هەیڤەکا ژ دەستپێکرنا ڤێ شۆڕەشێ دەستهەلاتا پاشایەتی ل چینێ بدوماهی هات و سیستەمێ کوماری جهێ وێ گرت، لێ شۆڕەشگێر نەشیان حکومەتەکا ئێکگرتی یا جێگیر پێکبینن لەوڕا ئەڤ شۆڕەشە بۆ ئەگەرێ هەلکرنا شەڕێن ناڤخۆیی و د ئەنجامدا ترس و برس و بارەکێ نەجێگیر ل چینێ پەیدابوو و چین ما د ڤان کاودانان دا هەتا سالا 1949.

ل وی سەردەمی، تۆنگ د دەستپێکا ژیێ خۆ یێ گەنجینیێ بوو و هێدێ هێدی خۆ نێزیکی سیاسەتێ دکر، ل سالا 1920 هوسا دیاربوو کو ئەو کەسەکێ مارکسی یێ ڕەگەزپەرست بوو. ل سالا 1921 زاینی بوو ئێك ژ دانەرێن هەردوازدە دامەزرێنەرێن پارتا شیوعی. پێکەفتنا وی دناڤ پارتێ دا یێ لاواز بوو هەتا ل سالا 1937 ژ نوو بوویە سەروکێ ڤێ پارتێ.

هەر لوی سەردەمی، پارتا شیوعی گەلەك زەحمەت و نەخۆشی دیتن هەتا شیایی بگەهیتە کورسیکا فەرمانڕەوایێ ل چینێ، هەرچەندە ل سالێن 1927 و 1934 ئەڤ پارتە تووشی هندەك شکەستنێن مەزن بوو لێ هێدی هێدی شیا دووبارە خۆ ل سەر پێن خۆ

بگریت و بهێزتر لێ بهێت هەتا ل سالا 1947 گەهشتە وی ئاستی کو دشێت شەڕەکێ بەرفرەهـ دژی حکومەتا نیشتیمانی یا وی سەردەمی ب سەروکاتیا "شیانج کای شا" ی بکەت.

ل سالا 1949 زاینی هێزێن شیوعی شیان سەرکەفتنەکا مەزن تومار بکەن و ب تەمامی فەرمانڕەوایی کەفتە دەستێ وان ب تنێ.

وەلاتێ چینێ ئەڤێ بۆ ماوێ 3 سالان ژ ئەگەرێن شەڕێن ناڤخۆیی تووشی شکەستن و هەژاری و پاشفەچوونەکا مەزن بووی کەفتە ژێر دەستهەلاتا تۆنگی، لوی دەمی یێ وی 56 سالێ بوون، لێ پشتی ڤی تەمەنی شیا مەزنترین سەرکەفتنێن خۆ یێن سیاسی تومار بکەت ژبەرکو ل سەردەمێ وی مەزنترین کارێن سیاسی هاتنە ئەنجامدان، دەمێ ل سالا 1976 زاینی وەغەکری شیابوو هندەك گوهۆرینێن هەرە مەزن پەیدابکەت.

ئێك ژ ڤان گوهۆرینێن هەرە مەزن، سەردەمکرنا جڤاکێ چینی بوو، ئانکو بزاڤکر چینێ بکەتە وەلاتەکێ پێشکەفتی و سەردەم، لەورا گرنگیەکا مەزن ب کەرتێ پیشەسازی و خواندن و فێرکرن و گەشەکرن و ساخلەمی و پەروەردەیا نیشتیمانی دا. هەرچەندە ئەڤ گوهۆرینێن مەزن یێن پەیدابووین ڕاستە بۆ جڤاکێ چینێ د نوو بوون لێ بەری هینگێ ئەڤ پێشکەفتن و گوهۆرینە ل گەلەك وەلاتێن دی یێن پێشکەفتی هەبوون لێ ئەڤ چەندە ئەگەرێ هندێ نەبوویە ئەم ناڤێ تۆنگی ل ڤێ ڕێزێ بدانین.

هەردیسان تۆنگ شیا سیستەمێ ئابوری ل وەلاتێ چینێ ژ سیستەمێ سەرمایەداری بکەتە ئیشتیراکی، ل ڤی سەردەمی چینێ سیستەمەکێ سیاسی یێ تاکرەوانە وەرگرت ئانکو کەسەکی ب تنێ کونترۆل ل سەر پارتا خو وەلاتی دکر، تۆنگی هەمی ئامڕازین وەلاتی بۆ بەرژەوەندیا خۆ ب کارئینان. لێ دگەل هندێ ئەو شیا سیستەمێ ئابوری و سیاسی یێ وەلاتی جێگیربکەت و د هەمان دەمدا شۆڕەشەکا جڤاکی ژی پەیداکر.

تۆنگ شیا هەستا نیشتیمانپەروەری دناڤ دلێ خەلکێ چینێ دا ب چینیت و ئەڤ گوهۆرینا مەزن بوو ئەگەر وەلاتێ چینی بۆ ماوێ هزارەها سالان بژیت کو ڕێزێ ل بنەمایێن خێزانێ و ڕەوشت و تیتالێن باب وباپیران بگریت، هەردیسان ڕابوو ب نەهێلانا هەمی ڕێنما و ئاینێ کونفۆشیوسی و ب ئێکجاری ژناڤبر.

تۆنگ یێ ب تنێ نەبوو کو شیایی دەستکاری و کونترولێ ل سەر پاشەڕۆژێ وەلاتێ چینێ دا بکەت بەلکو گەلەك کەسێن دیژی ئەڤ چەندەکر، لێ ئەم دشێن بێژین ڕۆلێ وی ژ یێ هەمیان مەترسیداتر و مەزنتر و بەرچاڤتربوو، ژ وان پرۆژەیێن کو بووینە بەلگە ل سەر مەزناهیا کاریگەریا وی ئەوبوو دەمێ لدەستپێکا سالێن پێنچیان پرۆژێ "بەرەڤ پێشڤە" دانای ئەوژی ڕابوو ب دانانا کارگەهان لناڤ باخچە و بیستانێن وەلاتێ چینێ.

هەردیسان ل سالێن شێستان پروژەیەکێ دی یێ مەزن دانا ئەوژی پرۆژێ ڕەوشەنبیریکرنا خەلکی بوو، هەلبەت ئەڤ چەندە شۆڕەشەکا ب مەترسی بوو چونکی دەلیڤە بۆ تۆنگی پەیدابوو ئەو ناکوکی و هەڤڕکیێن خۆ دگەل بیروکراتیا  پارتا شیوعی دا چارەسەربکەت.

تشتێ سەیر ئەوبوو کو ژیێ تۆنگی د سالێن شێستاندابوو دەمێ پرۆژێ بەرەڤ پێشڤە دانایی، هەردیسان نێزیکی 70 سالێ بوو دەمێ پرۆژێ ڕەشەنبیریکرنا جڤاکی دانای، ئەم دشێن بێژن د سالێن هەشتێان ژ ژیێ وی شیا وەلاتێ چینێ هند پێشبێخیت هەتا گەهشتە ئاستێ پێشکەفتنا ویلایەتێن ئێکگرتی یێن ئەمریکا و چ جوداهی یێن مەزن دناڤبەرا واندا نەماین.

تۆنگی باوەری ب هندێ هەبوو کو ئەڤ چەندەژی دگەل بوچوونێن مارکسی د گونجیا، لێ ل سالا 1925 بوچوونا خۆ گوهارت چونکی کاودانێن چینی گەلەك د جودانە لەوڕا وی بریاردا پارتا وی پشت بەستنێ بکەتە سەر جوتیاران و کەرتێ کشتۆکالیێ و ڤێ چەندێ ژی هاریکاریا وی کر چونکی دەمێ وی شۆڕەش دژی حکومەتا نیشتیمانی یا وی سەردەمی دەستپێکری، جوتیارێن گوندو باژێران هاریکاری و پشتەڤانیا وی دکر، ئەڤێ فەلسەفێ ب درێژاهیا ماوێ وی یێ حوکمڕانییێ کارتێکرنا خۆ ل سەر وەلاتێ چینێ هەبوو.

بۆ ڤێ چەندێ ئەو بەرۆڤاژی ستالینی بوو، چونکی ستالینی ل ڕۆسیا پشت بەستن کرە سەر پێشئێخستنا کەرتێ پیشەسازی، لێ تۆنگی گرنگی دا پێشئێخستنا کەرتێ کشتۆکالی لێ د گەل ڤێ چەندێ ژی کەرتێ پیشەسازی ل سەردەمێ وی هەر پێشکەفت.

## 90. فرانسێس بەیکۆن Francis Bacon

## (1561ز-1626ز)

### فرانسێس بەیکۆن

### ئێکەم فەیلەسوفێ پشتەڤانیا زانست و تەکنولوژیایێ کری

فرانسیس بەیکۆن ئێك ژ هزرمەند و سیاسەتمەدارێن ناڤدارە و پتریا ژیان و شیانێن خۆ بۆ کاروبارێن سیاسی تەرخان کربوو لێ دگەل هندێ ژی دانانا وی دگەل ناڤێ کەسێن کاریگەر ددیروکێ دا چ پەیوەندی ب کارێن وی یێن سیاسی ڤە نینە، بەلکو ژبەر بوچوونێن وی یێن فەلسەفی مە ئەو وەك کەسەك مەزن و کاریگەر هەلبژارت.

بەیکۆن ئێکەم فەیلەسوفێ مەزن مزگینی دایە خەلکی ل سەر گرنگیا زانست و تەکنولوژیایێ و شیانێن وێ ل سەر گوهۆرین و پێشئێختنا ژیانا مرۆڤایەتیێ.

بەیکۆن ل سالا 1651 زاینی ژدایکبوویە، ژبەرکو هەر چ بچووکاتی بابێ وی وەغەرکربوو و چ مالێیەت بۆ لدویف خۆ نەهێلابوو لەورا نەشیا خواندنا خۆ یا کولیژێ بدوماهی بینیت، ل دووڤدا ل کونسلخانا بریتانیا ل پاریسێ کارکر و شیا دووبارە بزڤیتە زانکۆیێ و دەمێ ژیێ وی بووینە 23 سالێ بۆ پارێزەر و پاشی هاتە هەلبژارتن ئێك ژ ئەندامێن "ئەنجومەنێ گشتی".

هەرچەندە وی هەڤالێنی دگەل کەلەك کەسێن ناڤدار هەبوون  و پەیوەندیا وی دگەل سیاسەتمەدار و بەرپرسان ژی د باشبوون لێ شاهژن "ئەلیزابیسێ" نەدهێلا ئەو چ پۆستان وەربگریت ژبەرکو ئەو بەرهنگارەکێ دژوار بوو دناڤ ئەنجومەنێ گشتی دا دژی وێ یاسایا پشتەڤانیا شاهژنێ دکر.

بەیکۆن ب خۆ کەسەکێ دەستبەردای بوو و حەز ژ خۆشیێ دکر لەورا گەلەك دەیندار بوو و ژبەر هندێ هاتە زیندانکرن، ئەو نەدشیا ب شێوەیەکێ باش ژیانا خۆ ب داهاتیێ خۆ یێ کێم و سنوردار ببورینیت.

پشتی هینگێ بەیکۆن بۆ هەڤال و شیرەتکارێ "ئیرل ئێسکس"ی کو ئەوژی بەرهەنگارەکێ بهێز بوو دژی شاهژنێ و بزاڤ دکر کودەتایەکێ ل سەر بکەت. هەرچەندە بەیکۆنی شیرەت لێدکر ئەو بێهنا خۆ فرەهـ بکەت و لدەستپێکێ حەزژێکرنا خۆ بۆ شاهژنێ دیاربکەت لێ وی گوهێ خۆ نەدا شیرەتێن وی و کودەتایا وی سەرکەفتن نەئینا.

لێ تشتێ سەیر ئەوبوو پشتی ئێسکس هاتیە گرتن، بەیکۆن ل دژی وی ڕاوەستیا و کارەکێ هوسا کر هەتا بوویە ئەگەرێ سێدارەدانا وی لەوڕا ئەڤ هەڵویستی وی بۆ جهێ گەنگەشەیێن هەرە مەزن دەربارەی ڕەوشتێن وی.

شاهژن ئەلیزابێسێ ل سالا 1603 وەغەرکر، پشتی وێ "جێمسێ ئێکێ" هاتە سەر دەستهەلاتێ و بەیکۆن بۆ شیرەتکارێ وی، هەرچەندە شاهی گەلەك گوهداریا شیرەتێن وی نەدکر لێ ڕێزەکا مەزن لێ دگرت و پلەیا وی د وەلاتی دا بلندکر هەتا بویە دادوەرێ دادگەهێ و پشتی وەرگرتنا ڤی پۆستی ئێدی هێدی هێدی ئاریشتە و کارەساتان د ژیانا ویدا دەستپێکرن.

بەیکۆن کەسەك بوو حەز ژ وەرگرتنا دیاری و بەرتیلان دکر و ئەڤ چەندە ل دەف وی تشتەکێ ئاسایی بوو لەوڕا دوژمنێن وی ئەو خالا وی یا لاواز ب دەلیقە دیت وی ژ پۆستێ وی بێخن و بەیکۆنی ژی دانپێدان ب ڤێ چەندێ کر و هاتە زیندان کرن د زیندانا بورج لەندەنڤە، لێ هەر زی شاهی پشتەڤانیا وی کر و ژ زیندانێ دەرێخست.

هەرچەندە ژیانا وی یا پڕی ڕویدان و ئاریشە بوو لێ دگەل هندێ ژی وی دەم هەمی هزروبیرێن خۆ بنڤێسیت و هندەك تیورێن کویر د هەمی بابەتاندا هەبو. گرنگترین بەرهەمێ وی یێ نڤێسینی پەرتووکا "گوتار" بوو کو ب شێوازەکێ جوان و کویر نڤێسابوو. بۆ نموونە دگوت: گەنج پتر دشێن داهێنانێ بکەن ژ ڕەخنەگرتنێ و پتر دشێن کاران ئەنجامبدەن ژ هزرکرنێ و پتر دشێن پرۆژەیێن نوو ئەنجامبدەن ژ کاروبارێن سادە. زەلامێن دانعەمر گەلەك خو نەرازی دکەن و بۆ دەمێن درێژ هزردکەن لێ چ تشتان بجهـ نائینن. ئەو کەسێن خێزان و زاروك هەین ئەو کەسەکێ ب بەختە. وی ب خۆ ژیانا هەڤژینیێ پێکئینابوو لێ وی زاروك نەبوون.

ژ گرنگترین کارێگەریێن وی ل پشت خۆ هێلای، پەرتووکا وی ل سەر فەلسەفەیا زانستی بوو ب ناڤێ "نویکرنا مەزن" کو ژ شەش بەشان پێکدهێت. د پشکا ئێکێ دا بەحسێ

زانستێ سەرجەم دکەت، دبەشێ دووێ بەحسێ ڕێبازەکا نوو بۆ ڤەکۆلینین زانستی دکەت، بەشێ سییێ ژی هژمارەکا پێزانینێن زانستی بخۆڤە دگریت، د بەشێ چوارێ ژی بەحسێ هندەك شێوازان دکەت ژبۆ نویکرنێ د زانستی دا، بەشێ پێنجێ ژی تەرخانکربوو بۆ شرۆڤەکرنا ئەنجامان و د بەشێ شەشێ دا ژی ئەنجامێن ڤان ڕێبازان د نویکرنا زانستی دا دیاردکەت.

بەیکۆن نەشیا ڤێ ڤەکۆلینا خۆیا مەزن و پڕی هیڤی و ئومێد تەمام بکەت. وی هندەك پەرتووکێن دیژی هەبوون کو ئەم دشێن بێژین تەمامکەرێن ڤی کارێ وی بوون. فەلسەفەیا بەیکۆنی بانگەوازا هندێ دکەت مرۆڤ چاڤێن خۆ بۆ دنیایێ ڤەکەت و چاڤدێری و تیبینیا هەمی تشتێن ل دەوروبەری خۆ بکەت ژبەرکو ب تیبینیکرنا ڤان پێزانینێن هویر و بەردەوام دێ مرۆڤ شێت گەهیتە دەستپێکا ڕاستی یا زانستان.

دوماهیك پەرتووکا بەیکۆنی ژی ب ناڤێ "کێشوەرێ ئەتلەنتی یێ نوو" بوو کو د ڤێ پەرتووکێ دا بەحسێ جیهانەکا نموونەیی ل سەر گزیرتەکێ دکەت. ئەڤ پەرتووکە بیرا مە ل پەرتووکا فەیلەسوف "تۆماس مور"ی دئینیت کو لبەری وی نڤێسابوو.

بیکوس د پەرتووکا خۆ دا پشت بەستنێ دکەتە سەر زانستێ نوو بۆ بجهئینانا خەونێن مرۆڤان ژ ژیانەکا پڕی کەیفوخۆشیێ، ژبەرکو ب دیتنا وی گرنگیدان ب زانستی دێ بیتە ئەگەرێ بەختەوەریا خەلکێ ئەوروۆپا هەروەکی وێ بەختەوەریا خەلکێ وێ گزیرتا ئەنتەلنی یا ئەفسانەیی یا تێدا دژین.

سەرەڕای هندێ هندێ کو بیکوس ئێك ژ وان کەسان بوون یێن گەلەك بانگەوازی و پشتەڤان ل زانستی دکری لێ وی باوەری ب هژمارەکا مەزن یا تیورێن زانستی یێن نوو و بەربەلاڤ یێن سەردەمێ خۆ نەبوو. لوی دەمی گەلەك کەسان سەربورێن خۆ ژ ئاینی دەستپێدکرن و پاشی دهاتنە دناڤ جیهانا زانستی دا لێ بەیکۆنی هەر لدەستپێکێ سەربورێن خۆ دگەل تاقیکرنێن زانستی دەستپێکر. هەرچەندە ئەو وی باوەری ب خودێ هەبوو لێ کەسەکێ ویندار نەبوو.

ئەم دشێن بێژین کو بەیکۆن ژ پتری هەمی کەسێن دی هەژی ڕێزگرتن و بیرئینانێ یە ژبەرکو وی پتر ژ هەمی کەسێن دی یێن سەردەمێ پشتەڤانیا هزرا سەردەم دکر بەرەڤ تاقیکرنانڤە بچن و پشتبەستنەکا تەمام بکەنە سەر مێشکێ خۆ و ب شێوەیەکێ

**زانستیانە هزربکەن. ژبەر ڤێ چەندێ ئەم دشێن وی هەڤبەر بکەین ب فەیلەسوفێ فرەنسی دیکارتی کو ئەو ب چاخەکی بەری دیکارتی یێ ژیایی.**

## 91. هێنری فۆرد Henry Ford

## (1863ز-1947ز)

### هێنری فۆرد

### ئەو کەسێ بوویە ئەگەر پتریا خەلکێ جیهانێ ببنە خۆدان ترۆمبێل

پیشەسازێ ئەمریکی یێ ناڤدار هێنری فۆرد، پتر ژ هەر کەسەکێ دی ئەگەرێ سەرەکی یێ پێشخستنا تەکنیکێن بەرهەم ئینانێ ب شێوەیەکێ بەرفرەهـ بۆ ناڤ پیشەسازیا سەردەم بوو. بڤی رەنگی ئەو شیا ستاندەرێن ژیانێ ل دەف گەلێ ئەمریکا و هەمی گەلێن دی یێن جیهانێ بلند بکەت.

فۆرد ل سالا 1863 زاینی ل دەڤەرا دێربۆرن ل ویلایەتا مشیگان هاتیە سەر دونیایێ، ئەو نەشیا بچیتە کولیژێ بەلکو ب تنێ قوتابخانەیا ناڤنجی بدوماهی ئینا و پاشی وەك شاگردەکێ میکانیکی ل کارگەهەکێ کارکر و پاشی وەك چاککەرێ ئامیران و ل دوماهیێ بوو ئەندازیارێ ترۆمبێلان.

ل سالا 1885، هێشتا ئەو یێ گەنج بوو دەمێ هەردوو زانایان "کارل بێنز و گوتلیب داملەر"ی ترۆمبێل داهێناین و دەست ب فرۆتنا وان کری ل بازاری. فۆرد هەر زوی بڤان ئامیرێن وەکی هەسپێن بێ گیان داخباربوو، لەورا ل سالا 1896 بریاردا ئەو ب خۆ دیزاینەکا تایبەت بۆ ترۆمبێلەکێ بدانیت. سەرەڕای شیانێن وی یێن بێ وێنە لێ هەردوو بزاڤێن وی یێن دەستپێکێ سەرنەگرتن.

لێ فۆردی ب سانەهی دەست نەداهێلان، ل سالا 1903 وی بزاڤەکا دی کر و ڤێ جارێ بزاڤا وی سەرگرت و کومپاینەك ب ناڤێ "کومپانیا ترۆمبێلێن فۆرد" دامەزراند و ئەڤ چەندە بۆ ئەگەرێ ناڤداربوون و زەنگیبوونا وی. ئەڤ کومپانیە هەر زوی گەلەك ناڤداربوو ژبەرکو شیا د ماوەیەکێ کێم دا هژمارەکا مەزن یا ترۆمبێلان فرێکەتە بازاری.

هەرچەندە دیزاینا ترۆمبێلا وی یا دەستپێکێ نەهند یا باش و سەرکەفتی بوو، لێ پشتی هینگێ ل سالا 1908 ترۆمبێلەکا دی ب دیزاینەکا نوو چێکر و ناڤێ کرە "مودێلا تی" و ئێخستە بازاری، ئەڤ ترۆمبێلە گەلەك یا جوان و باش بوو کو هەتا وی سەردەمی ئەو باشترین ترۆمبێل بوو هاتیەچێکرن لەورا نێزیکی 15 ملیون دانەیان ژێ هاتنە فرۆتن.

هەرزوی فۆردی ئەو چەندە زانی کو ئەگەر وی بڤێت ترۆمبێلان ب بهایەکێ ئەرزانتر بفرۆشیت، پێدڤیە ئەو کەرەستەیێن دەستپێکی ب بهایەکێ ئەرزانتر بدەستخۆڤە بینیت. ژبۆ بدەستڤەئینانا ڤێ ئارمانجێ، وی هژمارەکا تەکنیکێن بەرهەم ئینانێ یێن ژێهاتی ئینانە دناڤ کارگەها خۆدا، ئەوژی ئەڤەبوون: ئینانا وان پارچەیێن ب شێوەیەکێ تەمام ئالۆگوری پێ دهێتە کرن و ل شوینا ئێك دهێنە بکارئینان، دابەشکرنا کاری ل سەر کرێکاران، بجهئینانا سیستەمێ هێلێن خرڤەکرنێ[1]. وی ئەڤ چەندە ئەنجامدا ژپێخەمەت زێدەکرنا شیانێن تاکەکەسی یێن کرێکاران.

فۆردی هەست ب هندێ کر کو نابیت وەختێ کرێکاران ب هەروە و کارێن بچووکڤە بچیت ب تایبەت دەمێ هەر کرێکارەك ئەو ب خۆ وان تشتان بینتە بەر دەستێ خۆ یێ ئەو پێدڤی دبیتی ژبەرکو ئەڤ چەندە دێ وی مژویل کەت و وەختێ وی بەت، لەورا وی بریاردا کرێکار ل جهێ خۆ بمینن و هندەك قائیشێن ڤەگوهێزەر و ترێلێن ڤەگۆهاستنێ یێن بچووك کەرەستەیان بەتە بەر دەستێ کرێکان. ئەو چەندە بوو ئەگەر کرێکار زویتر کارێ خۆ ئەنجامبدەن.

داکو رێکێن بەرهەم ئینانێ ب شێوەیەکێ باشتر بهێنە شرۆڤەکرن، پێدڤیە کارێن ئالۆز و ب زەحمەت بهێنە پارڤەکرن و ب سانەهیکرن. ژبۆ ئەنجامدانا ڤان کارێن ب سانەهی ژی فردی بریاردا هندەك کرێکارێن سادە کو نە مەرج بوو ئاستێ وان یێ خواندنێ و زیرەکیێ یێ بلند بیت یانژی راهێنانێن کاری کر بن ئینان و ئەڤ کارە پێ ددانە ئەنجامدان.

هەلبەت خۆ ئێك ژ ڤان بیرۆکەیان نەیێن فۆردی ب خۆ بوون، بەری هینگێ گەلەك زانا و کەسێن دی ئاماژێ پێکربوو، بۆ نموونە بەری هینگێ ب چەرخەکی "ئیلی وایتنی"

---

[1] مەرەم ژ ڤی سیستەمی ئەوە کومکرنا پەیکەرێ ترۆمبێلێ پێنگاڤ پێنگاڤ بهێتە ئەنجامدان ب رەنگەکی کو هەر کرێکارەك ب درێژاهیا ماوێ خۆ یێ کارکرنێ بمیتە ل جهێ خۆ و کارێ خۆ ب تنێ ئەنجام بدەت و ب ڤی رەنگی کار زویتر و باشتر دهاتە ئەنجامدان.

ئاماژە ب هندێ کربوو کو پارچەیێن لێکگوهۆرینێ دشێن بەرهەمەکێ باشتر پێشکێش بکەن. هەروەسا "فریدریك تایلوری" ژی د نڤیسینێن خۆ دا ئاماژی ب هێلێن خرڤەکرنێ و ڤان بیرۆکەیان کربوو، لێ فۆرد ئێکەم کەس بوو د بوارێ پراکتیکی دا ئەڤ بیرۆکە بجھ ئینایین.

ئەنجامێن ڤان بیرۆکەیان گەلەك د سەرنجراکێش بوون. ل سالا 1908 ئەرزانترین ترۆمبێلا ژ مودێلا تی ب تنێ ب 825 دولاران دهاتە فرۆتن، ل سالا 1913 بهایی وێ هاتە خوارێ و بوونە 500 دولار. ل سالا 1916 دووبارە هاتنە خوارێ ب 360 دولاران و ل سالا 1926 ژی بهایێ وان گەهشتە 290 دولاران ب تنێ. ئەڤ ئەرزانیە بوو ئەگەر پتریا هاولاتیێن ئەمریکی ببنە خۆدان ترۆمبێل و فۆرد ژی ببیتە ئێك ژ زەنگینترین کەسان ل جیهانێ.

ژبەرکو کومپانیا فۆردی پتر ترۆمبێل بەرهەم ئینان و داهاتێ ویژی بوو گەلەك لەورا بریاردا کریا کرێکارێن خۆژی بلند بکەت، ل سالا 1914 وی بهایێ کارکرنێ ل کارگەها خۆ بوو 5 دولاران بلند کر کو ئەڤ پارەیەژی ژبۆ وی سەردەمی گەلەك بوو. هەروەسا وی بریاردا کرێکاران ژ بازێرێن هەژار ژی بینیت داکو خەلکێ وان ژی مفداربن.

داهێنانێن فۆردی د بێ سنور بوون. بەروڤاژی کەسێن دی، وی نهێنین تەکنیکێن بەرهەم ئینانێ ل کومپانیا خۆ نەدڤەشارتن بەلکو هەتا ل دەف وی ئاسایی بوو ڤان نهێنیان بەلاڤ کەتن لەورا کومپانیێن دی ئەڤ تەکنیکە کوپیکرن و د ئەنجامدا گەلەك کومپانیێن ترۆمبێلان هاتنە ڤەکرن و ئەڤ چەندە بۆ جهێ دلخۆشیا فۆردی ژبەرکو ئێدی هێدی هێدی نەبەس خەلکێ ئەمریکا بەلکو خەلکێ وەلاتێن دی یێن جیهانێ ژی ترۆمبێل بکارئینان.

سەرکەفتنێن دارایی یێن فۆردی بوونە ئەگەر دبوارێ سیاسی ژی بریارێن وی سەنگا خۆ هەبیت و بەشداری د چەندین چالاکیێن سیاسی دا کر، لێ ئەنجامێ ڤان چالاکییان تا رادەیەکی ئەو بێ هیڤی کر. ب تایبەت لدەستپێکا شەرێ جیهان یێ ئێکێ.

ل سالا 1930 ژی ئەو دژی سەندیکا کرێکاران راوەستیا و ئەڤ چەندە بوو ئەگەر کرێکارێن وی دەست ب مانگرتنێ بکەن و کومپانیا وی تووشی زیانێ بوو لەورا ل دوماهیێ دەست ژ ڤێ چەندێ ژی بەردا.

**هەرچەندە ئەڤ کارێن وی یێن دوماهییێ بوونە ئەگەر ڕێز و بهایێ وی دناڤ خەلکی دا کێم بیت لێ ڤێ چەندێ چ کاریگەری ل سەر جیهانێ نەکر، هەروەسا ڤێ چەندێ چ کاریگەری ل سەر گرنگیا ڕۆلێ وی د پێشخستنا شۆڕەشا پیشەسازی دا نەکر.**

## 92. مەنشیوس Mencius

## (371ب.ز - 289ب.ز)

### مەنشیوس

### ئەو فەیلەسوفێ پتر ژ 20 چەرخان کاریگەری ل سەر گەلێ چینێ کری

مەنشیوس دهێتە هەژمارتن ناڤدارترین فەیلەسوفێ چینی پشتی کونفۆشیوسی. ئەگەرێ ڤێ مەزناهیا ویژی بۆ پەرتووکا وی یا ناڤدار "ڕێنمایێن مەنشیوسی" دزڤڕیت کو بۆ ماوێ سەدەها سالاْن ناڤدارترین پەرتووکا چینی بو و خەلکی ڕێزەکا مەزن لێ دگرت و بچاڤەکێ پیرۆز تەماشە دکر. گەلی چینی یێ وی سەردەمی دگوتنێ حکیم "پەندیارێ دووێ" و دگوتنە کونفۆشیوسی"پەندیارێ ئێکێ".

مەنشیوس سالاْ 371 بەری زاینی ل گوندەکێ بچووك ب ناڤێ "تزو" ل دەڤەرەکێ کو ل سەردەمێ ئەڤروکە دبێژنێ "شانتونگ" ژدایکبوویە. لوی سەردەمی وەلاتێ وی تووشی گەلەك شەڕێن نافخۆیی ببوو و پەیوەندی دناڤبەرا هەرێمێن وی تا ڕادەیەکی تێکچوبوو. لێ فەلسەفەیا مەنشیوسی بانگەوزایا خەلکی دکر دوماهیێ ب هەڤڕکیێن خۆ بینن و داخازا دووبارە ئێککگرتنێ دناڤبەرا هەمی هەرێماندا دکر.

مەنشیوسی پتریا ژیێ خۆ ب گەشتانڤە بوراند و ژ هەرێمەکێ دچوو هەرێمەکا دی و شیرەت ل دەستهەلاْتداران دکرن وان ژی گوهێ خۆ ددا شیرەتێن وی و ڕێزەکا مەزن لێ دگرت. ل سالاْ 312 بەری زاینی دژیێ 59 سالیێ دا زڤڕی بازێرێ خۆ ڤە و ل وێرێ ما هەتا وەغەرا دوماهیێ کری.

د ژیانا خۆدا وی چ پۆستێن سڤیل یانژی سیاسی نەوەرگرتبوون. بەلکو ب تنێ سەرەدان و هاتنوچوون دکر و خەلك شیرەت دکر و ناما خۆ یا مرۆڤایەتی بەلاْڤدکر. لەوڕا پشتی مرنا خۆژی چەندین شاگرد و قوتابیی ل هەمی جهان ل پاش خۆ هێلان و بەردەوامی ددا ڕێبازا وی.

گرنگترین کارێ وی دژیانا خۆ دا کری، پەرتووکا وی یا ڕێنمایان بوو. د فەلسەفەیا وی دا گەشبینی و نموونەیی یا ل سەر زالبوو و بۆ ڤێ چەندێ هەڤبەرکرنەکا نێزیك دگەل فەلسەفەیا کونفۆشیوس هەبوو. مەنشیوس باوەری ب هندێ هەبوو کو باشیا مرۆڤی ب ڕەوشت و سەرەدەریا مرۆڤیڤە یا گرێدایە. هەردیسان ئەو حەز ژ باشیێ دکەن لێ ب تنێ ئەو پێدڤی پشتەڤانیێ نە داکو بشێن ڤێ چەندێ ئەنجامبدەن.

هەردیسان وی گوتنەکا ناڤدار هەبوو کو دبێژیت: ئەسمان ژی مە دبینیت هەروەکی کا چەوا ئەم ئەسمانی دبینین، ئەسمانی گوهـ ل مە هەیە کا چەوا مەژی گوهـ لێ هەیە. هندەك دیروکنڤێس پەسنا وی ب هندێ دکەن کو ئەو فەیلەسوفەکێ خۆشتڤی بوو دناڤ گەلێ خۆ دا ژبەرکو وی باوەری ب هندێ دئینا کو گەل بنیاتێ هەر وەلاتەکی یە نەك دەستهەلاتدارێن وێ.

مەنشیوس د ڕێنماییێن خۆدا بانگەوازا هندێ دکر کو دڤێت دەستهەلاتدار کەسەکێ هەرە باش بیت بۆ گەلێ خۆ، هەردیسان دڤێت نموونەیەك بیت بۆ ڕەوشتی و دلوڤانیێ و خەلك چاڤ ل وی بکەن، هەمان دەمدا دڤێت ب حەز ژێکرن دەستهەلاتێ ل خەلکی بکەت نەك ب ترسێ. ژبەر ڤێ چەندێ مەنشیوس داخازا کێمکرنا باجان ل سەر خەلکی و ڤەکرنا دەرگەهێن بازرگانیێ دکر.

مەنشیوسی هزردکر کو دەستهەلاتدار دەستهەلاتا خۆ ژ ئەسمانی وەردگریت، دیسان وی دگوت کو مافێ خەلکی یە دژی دەستهەلاتدرێن زالم و خراب ب ڕاوەستن و شۆڕەشان ل سەر بکەن و ئەڤ چەندە بۆ ئەگەر پشتی هینگێ چینی ب سەدەها سالاں وەکی شێوازەکێ پراکتیکی بکاربینن.

ژبەر ڤان بوچوونێن وی، تشتەکێ نۆرماله ئەگەر دەستهەلاتدار حەژێ نەکەن چونکی ئەوی پشتەڤانیا خەلکێ هەژار دژی دەستهەلاتدارێن زۆردار دگرت، هەر ئەڤ چەندەبوو بویە ئەگەر هزرو بوچوونێن وی ب شێوەیەکێ بەرفرەهـ دناڤ گەلێ چینی دا بەلاڤ بن.

ئەم دشێن بێژین کو د دیروکا فەلسەفێ دا ئەو چەندە ڕۆینەدابیت کو فەیلەسوفەك بشێت ب هزرێن خۆ کارتێکرنێ بۆ ماوێ پتر ژ بیست چەرخان ل سەر

نێزیکی 20٪ ژ خەلکێ جیهانێ بکەت هەروەکی کا چەوا مەنشیوس شیایی ڤێ چەندێ بکەت لەوڕا مە ژ هەژی دیت ئەم ویژی وەك ئێك ژ کەسێن کاریگەر ددیروکێ دا بهەلبژێرین.

## 93. زەرادەشت Zoroaster

## (628ب.ز - 551ب.ز)

### زەرادەشت

### دانەرێ ئاینێ زەرادەشتی ئەو ئاینێ هەتا نوکەژی مایە ساخ

زەرادەشت دهێتە نیاسین ئێك ژ زەلاَمێن ئولی و دانەرێ ئاینێ زەرادەشتی ئەو ئاینێ بۆ پتر ژ 25 چەرخان مایە ساخ و هەتا سەردەمێ ئەڤروکەژی پشتەڤانێن وی ل چەندین وەلاَتان هەنە ب تایبەت ل کوردستانێ و ئیرانێ. زەرادەشت دانەرێ پەرتووکا "گازاس"ە کو کەڤنترین پارچا پەرتووکا "ئاڤێستا"یێ یە کو دهێتە نیاسین ب پەرتووکا پیرۆزا زەرادەشتیان.

دیروکێ گەلەك کێم پێزانین ل سەر زەرادەشتی بۆمە پاراستینە، لێ ژێدەر دیاردکەن ل سالاَ 628 بەری زاینی ل دەڤەرەکێ کو نوکە دبێژنێ "باکورێ ئیرانێ" ژدایکبوویە. هەردیسان پێزانین ل دور زاروکینیا ویژی نەهاتینە تومارکرن.

دەمێ هێشتا یێ گەنج دەست ب بەلاَڤکرنا ئاینێ خۆ کریە و دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 40 سالێیێ گەلەك کەس دژی وی راوەستیان لێ ئەو شیا باوەریێ شاهێ باکورێ ئیرانێ ب ناڤێ "ڤیشتاسپا"ی پەیدابکەت تا ل دوماهیێ بوویە ئێك ژ پشتەڤانێن وی یێن هەرە بهێز و هەڤالێ وی یێ نێزیك. لدویڤ پەرتووکێن دیروکی، زەرادەشت ل سالاَ 551 بەری زاینی د ژیێ 77 سالێیێ دا وەغەرکریە.

بنەمایێ ئاینێ زەرادەشتی ل سەر ئێکانەیی یا خۆدایێ مەزن و فرەخۆداوەندان هاتیە دانان. لدویڤ بوچوونێن وی ب تنێ خۆدایەك هەیە ب ناڤێ "ئاهورا مازدا" و ب زمانێ فارسی یێ ئەڤروکە دبێژنێ "ئورموزدا" کو ب رامانا خودایێ دلوڤان و کاربنەجه دهێت.

زەڕادەشتی باوەری ب هندێ هەبوو کو گیانەکێ خڕاب ژی یێ هەی و ناڤی وی کریە "ئانگرا مانیو" و د زمانێ فارسی یێ نوکەدا دبێژنێ "ئەهریمەن" و ئەڤ گیانە ڕادبیت ب ئەنجامدانا کارێن خڕاب و درەو وخاپاندنێ دناڤ مرۆڤاندا.

هەردیسان هەڤڕکیەکا دژوار دناڤبەرا هێزا باشیێ و هێزا خڕابیێ دا یا هەی و هەڤڕکیا ڤان هەردوو هێزان هەتا هەتایێ ل سەر مرۆڤی دێ مینیت لێ ل دوماهیێ هیزا باشی و دادپەروەریێ دێ ب سەرکەڤیت ئانکو پشتی مرۆڤ گیانێ خۆ ژدەست ددەت.

ئاینێ زەڕادەشتی ب پێدڤی دبینیت کو باشی هەردەم هەبیت و هندەك کەس هەبن پشتەڤانی و دویفکەفتنا ڤێ باشیێ بکەن، لێ دهەمان دەمدا زەڕادەشتی ئەو چەندە ڕەتکریە کو مرۆڤەك خۆ ژ هەمی خۆشیێن دونیایێ بکەت و ب تنێ بمینتە ب دویف ئاینی ڤە، یان ژیانا هەڤژینیێ پێکنەئینیت.

زەڕادەشتیان هندەك ڕێوڕەسمێن تایبەت هەنە وەك پیرۆز ڕاگرتنا ئاگری، دورزڤڕین و نڤێژکرن لبەرامبەری ئاگری و دڤێت ئەڤ ئاگرە بەردەوام د پەرستگەهانڤە یێ هەلکری بیت و نەهێتە ڤەمراندن.

ژ گرنگترین دابونەریتێن زەڕادەشتیان ئەوە کا چەوا دێ کەلەخێ مرۆڤی پشتی مرنێ ڤەشێرن ژبەرکو ئەو کەلەخێن مریان لبن ئاخێ ناڤەشێرن و ب ئاگری ناسوژن بەلکو دێ دانە سەر جهەکێ بلند وەك چیاییێن بلند داکو باڵندە گوشتێ وی بخۆن و د ماوێ چەندین دەمژمێراندا پشتی باڵندە گوشتێ وی هەمیێ دخۆن ژ نوو دێ هەستیکێن وی خڕڤەکەن.

هەرچەندە د ئاینێ زەڕادەشتی دا گەلەك بنەماییێن ئاینێن فارسی یێن کەڤن هەنە لێ جوداهی ئەوە کو ئاینی زەڕادەشتی ئێکەم جار دناڤ ئیمپراتۆریا فارساندا بەلاڤبوو و گەلەك شاهێن وێ باوەری پێ ئینا و هێز و پشتەڤانیا وێ مەزنتر لێ هات. ئانکو نە وەکی ئاینێن بەری هینگی کو لدەستپێکێ ل وەلاتێن دی بەلاڤبوون وپاشی دهاتنە دناڤ وەلاتێ فارساندا.

لێ پشتی ئەسکەندەرێ مەکدونی ل نیڤا دوێ یا چەرخێ چوارێ بەری زاینی ئیمپراتۆریا فارسی شکاندی، گەلەك گوهۆرینێن مەزن د ئاینێ زەڕادەشتی دا پەیدابوون و

ئێدی هێدی هێدی ئەڤ ئاینە بەرەڤ کێمبوونێ چوو، لێ پشتی هینگێ مەترسیا گریکان ل سەر ڤی ئاینی نەما لەورا دووبارە بەرەڤ بهێزبونێ چوو و بەرەڤ هەمی لایەنان بەلاڤبوو.

ل سەردەمێ ساسانیان دناڤبەرا سالێن (226ز-561ز) ئاینێ زەرادەشتی بوو ئاینێ فەرمی یێ وەلاتی. پشتی شەرێن عەرەبان ل چەرخێ حەفتێ زاینی ئێدی گەلەك ژ دویکەفتێن ڤی ئاینی هاتنە دناڤ ئیسلامێ دا و د چەرخێ دەهێ زاینی دا ئێدی ئەو کەسێ، باوەری ب ئاینێ زەرادەشتی ئیناى ڕەڤینە وەلاتێ ئیرانێ و پاشی بەرەڤ گزیرتا "هورمز" ل کەنداڤی و ل دووڤدا بەرڤ هندێ چوون و میتانگەهەکا بچووك بۆ خو دانا.

ئەم دشێن بێژین کو ئاینێ زەرادەشتی ل چ سەردەما ل وەلاتێ ئیرانێ بەرزەنەبوویە. نوکە ل وەلاتێ هندێ دبێژنە دویکەفتیێن ڤی ئاینی "یارسی" ئانکو "فارسی" و هژمارا وان ل باژێرێ "بومبای" ب تنێ نێزیکی 100 هزار کەسانە و ل ئیرانێ ژی هژمارا وان دگەهیتە 20 هزاران.

ژبەرکو زەرادەشتی گەلەك پشتەڤان و دویکەفتی هەبوون و بەردەوام ڕێبازا وی بەلاڤدکر لەورا هەتا سەردەمێ ئەڤروکە ژی ئەڤ ئاینە مایە ساخ و پشتەڤان یێن هەین. هەردیسان ڤی ئاینی کاریگەری ل سەر هندەك ئاینێن دیژی هەبوو ب تایبەت مەسیحی و جوهیان لەورا ژی ئەم دشێن بێژین کو زەرادەشت ژی ئێکە ژ کەسێن کاریگەریەکا دومدرێژ ل سەر دیروکا مرۆڤایەتیێ کری.

سەرەرای هندێ کو ئاینێ زەرادەشتی ئاینەکێ کەڤنە لێ نەشیا ببیتە ئاینەکێ جیهانی وبەلکو هەر وەك ئاینەکێ نافخۆیی مایە لەورا ئەم نەشێن ب چ ڕەنگان وێ دگەل ئاینێن دی یێن وەکی ئیسلام و مەسیحیەتێ هەڤبەر بکەین.

# 94. شاهژن ئەلیزابێتا ئێکێ Queen Elizabeth I

## (1533ز- 1603ز)

### شاهژن ئەلیزابێتا ئێکێ

### ئەو شاهژنا شیایی مەزنترین هێزا دەریایی یا ئینگلیزی ب دامەزرینیت

شاهژن ئەلیزابێتا ئێکێ ب هندێ یا ناڤداره کو مەزنترین و زیرەکترین کەس بوو ل سەر کورسکیا دەستهەلاتێ ل ئینگلتەرا ڕینشتیه خوارێ و شیا ب سەرکەفتیانه بۆ ماوێ 45 سالان دەستهەلاتێ بکەت، دڤان سالاندا گشت بوارێن ئابوری و ئەدەبی ل ئینگلتەرا پێشکەفتنەکا بێ وێنه بخۆڤەدیتن و ئینگلتەرا بۆ خۆدانا مەزنترین هێزا دەریایی لجیهانی.

دەمێ ئەلیزابێتا ئێکێ هاتیه سەر دەستهەلاتێ چ شاهێن زیرەك و چەلەنگ نەبوون بەلکو هەمی وەکی دێوان بوون لێ دگەل هندێ ژی ئەو شیا ببیته خۆدانا مەزنترین بەخت ل سەردەمێ زێرین یێ ئینگلتەرا.

ئەلیزابێت ل سالا 1533 ل گوندێ "گرینج" ل وەلاتێ ئینگلتەرا ژدایکبوویه، بابێ وێ شاه "هێنری یێ هەشتێ"بوو کو سەرکێشیا بزاڤا چاکسازیێ ل ئینگلتەرا دکر و دەیکا وێ "ئان بولین" ژنا دووێ یا شاهی بوو و ل سالا 1536 هاته کوشتن. پشتی هینگێ ب چەند هەیڤەکان پەرلەمانی بریاردا کو ئەلیزابێت کچا نەشەرعی یا شاهی یە[1] کو ل وی سەردەمی ب تنێ ژیێ وێ سێ سالێ بوون. سەرەڕای ڤێ بریارا پەرلەمانی، لێ ئەلیزابێت هەر ما ل کوچکا شاهی و وەکی شاهژنان ژیا.

ل سالا 1547 هێنری یێ هەشتێ مری، لوی سەردەمی ژیێ ئەلیزابێتێ 13 سالێ بوون. د ماوێ دەهـ سالێن پشتی هینگێ ئەو کەسێن هاتینه سەر کورسیکا دەستهەلاتێ

---

[1] ئەڤ بریاره بوچوونا کاسولیکیان بوو لوی سەردەمی ژبەرکو ب دیتنا وان بەردانا ژنا ئێکێ تشتەکێ حەڕامە، ژبەرهندێ ژی هەڤژینیا شاهی دگەل دەیکا ئەلیزابێتێ تشتەکێ حەڕامە و ئەو زاروکێن ژێ پەیدادبن د نەشەرعینە و مافێ گرتنا دەستهەلاتێ نینە.

سەرنەکەفتن، برایێ وێ "ئیدوەردێ شەشێ" دناڤبەرا سالێن 1547 هەتا 1553 دەستهەلاتکر، ل سەردەمێ وی حکومەتێ هەلویستەکێ ڕێکەفتی دگەل پرۆتستانتان کر.

خویشکا وێ "ماری"یێ ژی بۆ ماوێ پێنج سالان دەستهەلات ل ئینگلتەرا کر، لێ ئەوێ پشتەڤانیا "بابا کاسولیك"ی کر و دووبارە ڕێبازا کاسولیکی کرە ئاینێ فەرمی یێ وەلاتی و نێزیکی 300 پشتەڤانێن ڕێبازا پرۆتستانتی کوشتن، ژبەر ڤێ چەندێ ب ناسناڤێ "ماریا خویناوی" هاتە نیاسین. لێ پشتی هینگێ ئەلیزابێت هاتە سەر تەختێ دەستهەلاتێ و خۆیشکا خۆ ل بورجێ لەندەنێ ڤە زیندان کر، هەرچەندە پشتی هینگێ خویشکا خۆ ئازاد کر لێ هەر ژیانا وێ مابوو د مەترسیێ دا.

پشتی ل سالا 1588 شاهژن ماری مری، ئەلیزابێتا ئێکێ بوو دەسهەلاتدارا فەرمی یا ئینگلتەرا، کەیفا خەلکی گەلەك ب ڤێ دوماهیکا ڕەش و دەستپێکا بەختەوەر هات. لدەستپێکێ یا ل سەر ئەلیزابێتێ پێدڤیبوو هندەك ئاریشەیان چارەسەر بکەت ئەوژی شەرێ دگەل فرەنسا، گرژی و ئالۆزیێن دناڤبەرا ئینگلتەرا و ئوسکوتلەندا دا و گرژیێن ڕێبازێن ئاینی ل ئینگلتەرا.

لدەستپێکێ ئەلیزابێتێ بزاڤکرن گرژیێن دناڤبەرا ڕێبازێن ئاینی دا نەهێلیت و ئاریشەیا وان چارەسەربکەت و بکەتە ئێك و ئاینێ فەرمی یێ وەلاتی کرە مەسیحیا ئینجیلی، ئەڤ چەندە بۆ ئەگەرێ ڕازیکرنا هەردوو ڕێبازان. هەرچەندە هندەك ڕێبازێن دی خۆ ژڤێ چاکسازیێ نەڕازیکرن لێ هەر زوی ئەلیزابێت شیا هەڤسەنگیەکێ دناڤبەرا واندا پەیدابکەت و هەتا سالا 1559 دوماهی بڤێ ئاریشێ هات.

بەری هینگێ ڕێبازا ئاینی ببوو بابەتەکێ ئالۆز بتایبەت ئەو تشتێ پەیوەندی ب شاهژن ماری یا ئوسکوتلەندیڤە هەی، پشتی ئەو ژ ئوسکوتلەندا هاتیە دەرێخستن بەرەڤ ئینگلتەرا هات و بوو ئێك ژ ئەندامێن خێزانا ئەلیزابێتا ئێکێ و مافێ دەستهەلاتداریێ ژی هەوبوو. ئانکو ئەگەر شۆڕەشەك هاتەکرن یان شاهژن ئەلیزابێت هاتە کوشتن لوی دەمی دێ شاهژن ماریا کاسولیکی ماف هەبیت بچیتە جهێ وێ.

پشتی بەلگە ل سەر ماریێ ئاشکەڕابوون کو وێ دەست دگەل پیلانێن کوشتنا ئەلیزابێتێ دا یێن هەین لەوڕا ل سالا 1587 هاتە سێدارەدان و ئەلیزابێتێ ب خۆ بریارا سێدارەدانا وێ و وەزیرێن وێ پەسەند کر. خەلکێ وەلاتی ژی هەمی ژی ئەو بۆ ماوەیەکێ

درێژ بوو ل هیڤیا بجهئینانا ڤێ بریارێ بوون داکو ئارپشەیێن وان یێن ئاینێ بدوماهی بهێن ژبەرکو ل سالا 1570 "بابا بیوسێ پێنچێ" نەفرەت ل ئەلیزابێتێ کرن و ژ دێرێ دەرێخست و پاشی "بابا گریگورێ سێزدێ" خوینا وێ حەلالکر و گوت هەر کەسێ وێ بکوژیت چ گونەھ ل سەر ناچن.

ژبەر ڤێ چەندێ پشتەڤانێن ڕێبازا پرۆتستانتی دترسیان پاپایێ کاسولیکی شۆڕەشەکێ بەرپابکەت لێ ئەلیزابێتێ خەلك پشتڕاست کر ئەو دێ ڕێبازا پرۆتستانتی هەر ب سەرئێخیت و ئەڤ بریارا وێ پێشوزایەکا مەزن ل ئینگلتەرا لێ هاتەکرن.

ل دووڤدا ئەلیزابێتێ دەست ب چارەسەکرنا ئاریەشیێن سیاسی یێن دەرەکی کر. ل سالا 1560 بریاردا شەڕی دگەل وەلاتێ فرەنسا بدوماهی بینیت و ئەڤ چەندە بوو ئەگەر پەیوەندیێن هەردوو وەلاتان پێشڤە بچن، لێ هەر زوی پەیوەندیێن ئینگلتەرا و ئیسپانیا تێکچوون تا کار گەهشتیە وی ڕادەی پێدڤی ب مایتێکرنا لەشکەری بیت.

هەرچەندە ئەلیزابێتێ بزاڤ دکرن شەڕی بدوماهی بینیت لێ لوی سەردەمی گەلەك یا بزەحمەت بوو شەڕێ دناڤبەرا ئیسپانیا ل سەر ڕێبازا کاسولیکی یا توندڕەو دگەل ئینگلتەرا پرۆتستانتی یا میانرەو و ئازاد بدوماهی بهێت.

لێ پشتی وەلاتێ هولەندی یێ پرۆتستانتی ژی دژی ئیسپانیا ڕاوەستیای کاودان بەرەڤ باشترچوون. هەرچەندە ئەلیزابێتێ ب خۆ نەدڤیا چ شەڕ پەیدابن لێ وەزیر و پەرلەمان د ڕژدبوون شەڕی دگەل ئیسپانیا بکەن و ل سالا 1580 شەڕێ دناڤبەرا ئینگلتەرا و ئیسپانیادا هاتە ڕاگەهاندن. دڤی شەڕی دا، ئەلیزابێتێ پشتبەستن کرە سەر بنکەیەکێ بەرفرەھ یێ وەزیر و پەرلەمان و گەلێ خۆ. هەردیسان شیا هێزا دەریایی یا بەریتانی بدامەزرینیت، لێ شاھ فیلیب شیا بەری وێ هێزا دەریایی یا ئیسپانیا ب ناڤێ "ئارمادا" دروست بکەت و خۆ بەرهەڤکربوو بۆ شەڕی دگەل ئینگلتەرا.

هژمارا پاپۆڕێن هێزا دەریایی یا ئارمادا هندی هژمارا پاپۆڕێن ئینگلیزی بوو لێ هژمارا دەریاڤانێن وێ و سەرورێن وان کێمتربوو لێ بەروڤاژی دەریاڤانێن زیرەك و خۆدان ئەزمون دناڤ هێزا دەریایی یا ئینگلیزی دا کاردکر. ل سالا 1588 شەڕ گەهشتە گوپیتکێ هەتا ل دوماهیێ هێزێن دەریایی یێن ئینگلیزی ب سەرکەفتین و ب ڤێ چەندێ ئینگلتەرا

بۆ خۆدانا مەزنترین هێزا دەریایی ل جیهانێ و هەتا چەرخێ بیستێ ژی د ڤی ئاستی دا مابوو.

شاهژن ئەلیزابێتێ گەلەك گرنگی ددا لایەنێ دارایی، لێ دگەل هندێ ژی وان پارەیەکێ مەزن دشەڕێ دژی ئیسپانیادا مەزاخت بوو.

دیروکنڤێس ل سەر هندێ ڕێکەفتینە کو ئەو چاخێ ئەلیزابێتێ دەستهەلاتداری کری دهێتە هەژمارتن چاخێ زێرین یێ ئینگلتەرا. د وی سەردەمی دا هوزانڤانێ ناڤدار "ویلیەم شکسپیر" دژیا، سەرەڕای ڕەخنەیێن دژوار لێ وێ پشتەڤانیا بزاڤا ئەدەبی و شانویا شکسپیری دکر تا وی ڕادەی کو و بوارێن دی یێن هونەری وەك موزیك و شێوەکاری نەگەهتشبوونە ئاستێ پێشکەفتی یێ بوارێ ئەدەبی.

هەردیسان سەردەمێ ئەلیزابێتێ ب سەردەمێ گەرۆکێن ئینگلیز دهێتە نیاسین ژبەرکو گەرۆکێن ئینگلیز هندەگ گەشت بەرەڤ ڕۆسیا برن داکو ب ڕێکا باکوری بگەهنە ڕۆژهەلاتا ناڤین، هەردیسان گەرۆکڤان "فرانسیس دریك" شیا د گەریانەکێ دا ل دور دونیایێ بزڤریت. هەروەسا هندەك بزاڤێن نەسەرکەفتی هاتنە ئەنجامدان ژلایێ "والتەر ڕالی"ڤە کو ل میتانگەهێن نوو ل ئەمریکا باکوری دگەریا.

مەزنترین ئاریشەیا تووشی ئەلیزابێتێ بووی و نەشیا چارەسەربکەت ئەوژی نەشیا کەسەکێ ژ هەژی بکەتە جهگرێ خۆ، ژبەرکو وێ شوینەکربوو و چ کەس ژی دەستنیشان نەکربوو ل پشتی مرنا وێ بهێتە سەر تەختێ دەستهەلاتێ ژبەرکو ئەو دترسیا ئەگەر ئەو ڤی کاری بکەت مەترسی ل سەر ژیانا وێ پەیدابیت.

دەمێ گەهشتیە ژیێ حەفتێ سالێ و ل سەر تەختێ مرنێ بریاردا شاهـ "جێمسێ شەشێ" بکەتە جهگرێ خۆ کو شاهێ ئوسکوتلەندابوو و کورێ شاهژن ماریێ بوو ئەوا بەری هینگێ وێ سێدارەدای. دبیت مەرەما وێ ژ هەلبژارتنا ڤی کەسی بۆ هندێ بیت داکو پشتی مرنا وێ ئێگرتنەکێ دناڤبەرا ئوسکوتلەندا و ئینگلتەرا دا دروست بکەت، لێ ژبەرکو شاهـ جێمس و کورێ وی شاهـ چارلز ژ شاهێن زۆرداربوون لەورا خەلك دژی وان ڕاوەستیان و شەڕێن نافخۆیی پەیدابوون.

شاهژن ئەلیزابێتا ئێکێ کەسەکا گەلەك تێگەهشتی و بیرتیژبوو د سیاسەتێ دا و دهەما دەمدا گەلەك یا ل خۆ هشیاربوو و حەز ژ شەڕان و ڕێژتنا خوینێ نەدکر. بۆ وێ

گەلەك یا ب سانەهی بوو د هندەك هەلویستاندا یا دلڕەق بیت لێ دگەل هندێ ژی ب زەحمەت ئەڤ چەندە دکر.

ئەلیزابێت ژی وەکی بابێ خۆ شیا پتر پشتەڤانیا پەرلەمانی بدەستخۆڤە بینیت بێی کو بچیت شەڕی دژی وان ئەنجامبدەت. هەردیسان وێ حەز ژ دیوانا زەلاّمان دکر و وەختێن درێژ دگەل دبوراندن، د هەمان دەمدا ب شێوەیەکێ باش وەزیر و هاریکارێن خۆ د هەلبژارتن.

ئەم دشێن مەزنترین سەرکەفتنێن وێ ب ڤی ڕەنگی کورت بکەین: ئەو شیا سەرکێشیا بزاڤا چاکسازیێ ل ئینگلتەرا بکەت بێی کو خوین بهێتە ڕێژتن، ئانکو بەروڤاژی وێ چەندێ یا ل ئەلّمانیا هاتیە ڕویدان کو د شەڕێ سیه سالاّندا ژ 1618 هەتا 1648 پتر ژ چارێکەکا خەلکێ ئەلّمانیا هاتنە کوشتن. ب هاتنا ئەلیزابێتێ بۆ سەر تەختێ دەستهەلاّتێ ئێدی گرژیێن ئاینی دناڤبەرا کاسولیك و پرۆتستانتاندا کێمبوون و برینێن وان هاتنە دەرمانکرن.

لێ ژلایەکێ دیڤە ڕاستە ئەلیزابێتا ئێکێ سەرکەفتنێن مەزن تومارکرن لێ ئەڤ سەرکەفتنە هەمی دناڤخۆیی بوون و چ کاریگەری یێن دەرەکی نەبوون بەلکو ئەو سەرکەفتنێن جیهانی یێن ئینگلتەرا تومارکرین د سەردەمێن پشتی هینگێ دا هاتبوونە تومارکرن و چ پەیوەندی ب وێڤە نەبوون.

هەتا شەڕێ وێ دگەل ئیسپانیا ژی چ سەرکەفتنێن مەزن نەبوون ژبەرکو وێ خۆ پاپۆرەکا خوژی ژدەست نەدابوو و ئیسپانیا ژی وەلاّتەکێ مەزن و بهێز نەبوو کو بشێت خۆ لبەر هێزا وەلاّتێ وێ بگریت لەوڕاژی مە ناڤێ وێ دڤێ ڕێزبەندا دوماهیێ دا دانایە.

## .95 ميكائيل گۆرباشيڤ Mikhail Gorbachev

## (1931ز. – 0000)

### ميكائيل گۆرباشيڤ

### ئەو سەركردێ بوويە ئەگەرێ كەفتنا ئێكەتيا سوڤيەتا بەرێ

ئێك ژ گرنگترين ڕويدانێن سياسى د دوماهيا چەرخێ بيستێ دا ڕويدان، ژێكڤەبوونا ئێكەتيا سوڤيەتا بەرێ و هەرفتنا شيوعيێ بوو. ئەڤ بزاڤا بۆ ماوێ چەندين سالاَن بزاڤ دكرى جيهانێ هەميێ بێختە بن دەستێ خۆ هەر زوى ژناڤ چوو نوكە ب تنێ ناڤێ وێ مايە دديروكێ دا .

ئەم دشێن بێژين كەسەك ئەگەرێ سەرەكى يێ ڤێ هەرفتن و كەفتنێ بوو ئەوژى ميكائيل گۆرباشيڤ بوو ئەوێ بۆ ماوێ شەش سالاَن سەركێشيا ڤى وەلاَتى دكرى دكر هەر ژ سالاَ 1985 هەتا 1991.

گۆرباشيڤ ل سالاَ 1931 ل گوندێ "پريڤۆلنيو" ل دەڤەرا سنتڤرۆپۆل ل باشورێ ڕۆسيا ژدايكبوويە. زاروكينيا وى يا هەڤدەم بوو دگەل دەستهەلاَتا دڕندەيى يا دكتاتور جوزێف ستالينى كو دهێتە هەژمارتن ئێك ژ خويناويترين زۆرداران د ديروكێ دا. باپيرێ وى "ئاندرێ" نێزيكى نەهـ سالاَن دزيندانێڤە بوراند هەتا سالاَ 1941 هاتيە بەردان كو پشتى هينگێ ب چەند هەيڤەكان ڕۆسيا هاتيە داگيركرن ژلايێ ئەلَمانياڤە.

گۆرباشيڤ ب خۆ گەلەك يێ بچووك بوو و نەدشيا خزمەتا سەربازى بكەت د شەڕێ جيهاى يێ دوێ دا، لێ بابێ وى دناڤ لەشكەرى دا كاردكر و برايێ وى يێ مەزن ژى د ڕويدانەكێ دا هاتە كوشتن و گوندێ وى بۆ ماوێ هەشت هەيڤان ژلايێ هێزێن ئەلَمانيڤە هاتە داگيركرن.

سەرەڕاى ڤان نەخۆشيان، لێ گۆرباشيڤ شيا پلەيێن بلند ل قوتابخانێ بدەستخۆڤە بينيت و ل دووڤدا پەيوەندى ب كۆمەلا شيوعى يا گەنجان ب ناڤێ "كۆمسۆمول" دكەت كو

هێشتا ژیێ وی 15 سالێ بوون. ل دووڤدا بۆ ماوێ چوار سالان دناڤ زەڤیێن گەنمی دا ل سەر ئامیرێ درووینێ کارکریە.

ل سالا 1950 ل زانکۆیا موسکو، کولیژا یاسایێ هاتە وەرگرتن و ل سالا 1955 دەرچوو. ل سالا 1952 ل موسکو بوو ئەندامێ پارتا شیوعی و هەر ل وێرێ هەڤنیاسین دگەل هەڤژینا خۆ یا پاشەڕۆژێ "ڕێسا ماکسیموڤنا"یێ کر و بەری زانکۆیێ بدوماهی بینیت ب ماوەیەکێ کێم ژیانا هەڤژینیێ پێکدئینا و کچەك ژێ هەبوو ب ناڤێ "ئێرینا".

پشتی بدوماهی ئینانا خواندنا خۆ یا زانکۆیێ، گۆرباشیف دووبارە زڤڕی دەڤەرا ستراڤرۆپول و پلا وی دناڤ پارتا بیرۆکراتی هاتە بلندکرن. ل سالا 1970 بوو سکرتێرێ ئێکێ یێ کومیتەیا پارتا دەڤەرداریێ و پشتی چەندین سالێن ل دووڤدا بوو ئەندامێ کومیتەیا ناڤەندی یا پارتا شیوعی.

ل سالا 1978 پلەیەکا دی یا بلند بدەستخۆڤە ئینا دەمێ چوویە باژێرێ موسکو و بوویە سکرتێرێ کومیتەیا ناڤەندی و بەرپرسیارێ بەشێ چاندنێ. هەروەسا ل سالا 1979 گۆرباشیف هاتە کاندیدکرن بوو ئەندامەتیا مەکتەبا سیاسی کو لوی دەمی دەستهەلات ل ئێکەتیا سوڤیەتێ دکر و ل سالا 1980 ب فەرمی بوو ئەندام دڤێ مەکتەبێ دا.

ئەڤ هەمی پلە بلندکرنە د ماوێ دناڤبەرا (1964 هەتا 1982) دا هاتنە ڕویدان ئەوژی ل دەمێ "لیونێد بریزنیف"ی دەستهەلات ل ئێکەتیا سوڤیەتێ دکر پشتی مرنا وی هەتا 1985 هندەك سەرکردەیێن دی پۆستێ سەروکاتیێ وەرگرت و دڤی ماوەی دا گۆرباشیف بوو ئەندامێ هەرە دیار یێ مەکتەبا سیاسی و پشتی هینگێ بوو سکرتێرێ گشتی یێ پارتێ ئەوژی پشتی کو ئەندامێن مەکتەبێ ب شێوەیەکێ نهێنی دەنگدان کری و ئەو هەلبژارتی.

بەروڤاژی پتریا سەروکێن بەری وی یێن ئێکەتیا سوڤیەتێ، گۆرباشیڤی بەری ببیتە سەروکێ پارتێ سەرەدانا گەلەك وەلاتێن ڕۆژئاڤای کربوو لەورا دەمێ ئەو هاتیە هەلبژارتن هیڤیێن گەش بوو وەلاتێن ڕۆژئاڤایی چێبوون کو گۆرباشیف ببیتە سەروکەکێ لیبرالی یێ مودێرن و ئەڤ چەندەژی ڕاست دەرچوو و هەر زوی وی ڕیفۆرمەکا سیاسی یا بنەڕەتی ئەنجامدا.

دەمێ گۆرباشیف ل سالا 1985 هاتیە هەلبژارتن وەك سكرتێرێ گشتی یێ پارتا شیوعی قەت د هزرا ویدا نەبوو كو ئێكەتیا سوڤیەتێ ب هەرفینیت و دوماهیێ ب پارتا شیوعی بینیت كو ئەوژی ئێك بوو ژ دامەزرێنەرێن وێ، لێ ئەو سیاسەتا وی پەیرەو دكری و هەبوونا هێزێن دەرەكی بوونە ئەگەرێ پەیدابوونا ڤی ئەنجامی. سەرەڕای چاڤدێریا وی یا توند، ئەو بۆ ئەگەرێ گوهۆرینا ئاراستێ ب رێڤەچوونا جیهانا مە.

## 96. مینا Menes

## (3100 ب.ز – 000)

### مینا

### ئەو شاهێ مسرێ کریە ناڤدارترین شارستانیا کەڤن

مینا دهێتە هەژمارتن ژ شاهێن دەستپێکێ یێن وەلاتێ مسرێ و ئێکەم شاهە کو شیایی وەلاتەکێ ئێکگرتی و بهێز ل سەر عەردێ مسرێ ئاڤا بکەت. بڤێ چەندێ ئەو شیا ڕۆلەکێ کاریگەر د دیروکا شارستانیا مرۆڤایەتیێ دا بگێریت.

هەرچەندە دیروك بەحسێ ژدایکبوون و مرنا وی بومە ناکەت و چ پێزانینێن دروست لبەردەست نینن، لێ پتریا بوچوونان دگەل هندێ نە کو ئەو ل دەستپێکا سالێن 3100 بەری زاینێ ژدایکبوویە. بەری ڤێ دیروکێ وەلاتێ مسرێ نەیێ ئیکگرتی بوو بەلکو ژ دوو شاهنشینێن سەربەخۆ پێکدهات کو ئێك ل باکوری بوو ل دەڤەرا دەلتایێ و یا دیژی ل باشوری بوو. دگوتنە یا ئێکێ شاهشینا مسرێ یا خوارێ و دگوتنە یا دووێ شاهنشینا مسرێ یا سەری لێ شاهنشینا خوارێ گەلەك پێشکەفتیتر بوو ژ یا سەری لێ شاهـ مینا هات و شیا ڤان هەردوو شاهنشینان بکەتە ئێك.

شاه، مینا ب نازناڤێ "نارمر" ژی دهێتـە نیاسین. ئەو ب خۆ ل باژێرێ "نانیس" ل باشورێ مسرێ ژدایکبوویە، لێ پشتی وی هەردوو شاهنشین کرینە ئێك ناسناڤێ شاهێ ئێکگرتنێ هەردوو وەلاتان ل سەر خۆ دانایە و ئەڤ ناسناڤە بۆ هزارەها سالان هاتیە پاراستن و پاشی پایتەختێ وەلاتێ خۆ ل باژێرێ "مەمفیس" دانا کو دکەفتە سنورێ دناڤبەرا هەردوو شاهنشینان‌دا و ب ماوێ پتر ژ هزار سالان یا ئاڤەدانکری بوو و ل سەردەمێ ئەڤروکە شینوارێن ڤی باژێری دکەڤنە نێزیکی باژێرێ قاهیرە.

هەردیسان دیروك نەشیایە گەلەك پێزانینان ل سەر ژیان و چەوانیا دەستهەلاتداریا ڤی شاهی بۆمە بپارێزیت، لێ وی نێزیکی 62 سالان دەستهەلات کریە و دبیت ئەڤ ژمارەیە پیچەکێ یا مەزن بیت. لێ گومان تێدا نینە کو ب ئێکگرتنا هەردوو

لایێن مسرێ ژ نوو شیانێن وێ یێن داهێنانێ د ڕەوشەنبیری و هونەر و ئاڤەدانکرن و بیناسازیێ دا دیاربوون و ئەڤ چەندە بۆ ئەگەرێ گوهۆرینا سیستەمێ دەستهەلاّت و کارگێریێ و کاریگەریا ڤێ چەندێ بۆ ماوەیەکێ درێژ یا بەردەوام بوو.

ل سەردەمێ ڤی شاهی زمانێ هیرۆگلیفی و ڕێکا نڤیسین و نەخشەیێن وێ گەلەك پێشکەفت. ئەم دشێن بێژین کو ل ڤی سەردەمی شارستانیا مسرێ ژ شارستانیا سومەری پێشکەفتیتر لێهات ژبەرکو سەردەمێ مینایی مسر بۆ ئێك ژ پێشکەفتیترین شارستانیێن کەڤن.

لێ هەکە ئەم پرسیار بکەین کا ئەم جهێ مینای دڤێ لیستێ دا بدانینە کیژ ڕێزبەندێ؟ گومان تێدا نینە کو شاه مینا کەسایەتیەکێ مەزن بوو و ئەم یێ سەر هندێ فێربووین کو ل سەردەمێن شاهاتیێ شاه گرنگترین کەسە د وەلاّتی دا لەورا ئەگەر ئەو نەبایە ڕەنگە ئەو سەرکەفتن و پێشکەفتن و ئێکگرتنا مسرێ بخۆڤە دیتی پەیدانەببا.

ژبەر ڤێ چەندێ مە ناڤێ وی ل ڤێرێ دانا ژبەرکو پتریا سەرکەفتنان بۆ وی دزڤرن و ئەگەر ئەو نەهاتبا ڕەنگە مسر نەشیابا بگەهیتە ڤی جهێ بلند د دیروکا کەڤن.

## 97. چاریلمان Charlemagne

## (724ز. – 814ز.)

### چاریلمان

### ئەو سەرکردێ شیای دووبارە ئیمپراتۆریا ڕۆمانی زیندی بکەت

چارلیمان یێ دهێتە نیاسین ب "چارلێ مەزن" ئێکە ژ ئیمپراتۆرێن ڕۆمانی یێن چەرخێ ناڤەڕاست و دانەرێ ئیمپراتۆریا ڕۆمانی یا پیرۆز و ئێکە ژ دەستهەلاتدراێن هەرە ناڤدار د دیدروکا ئەوروپا دا.

چارلیمان ل سالا 742 زاینی ل نێزیکی گوندێ "ئاخین" ژدایکبوویە کو پشتی هینگێ ئەڤ دەڤەرە کربوو پایتەختێ ئیمپراتۆریا خۆ، بابێ وی "پەپینێ کورت" بوو. و باپیرێ وێ "چارلز مارتل" ئەو سەرکردێ فرەنسی بوو یێ بوویە ئەگەرێ شکەستنا موسلمانان ل فرەنسا ل شەڕێ "تۆر" ل سالا 732 زاینی. بابێ ویژی پیپانێ کورت ل سالا 751 زاینی ببوو دەستهەلاتدارێ فرەنسا و ل سالا 768 پشتی بابێ وی مری ئێدی هەڤڕکی کەفتە دناڤبەرا چارلیمانی و برایێ وی کارولمانی ل سەر کورسیکا دەستهەلاتێ.

لێ پشتی هینگێ ل سالا 771 برایی وی ژ نیشکەکێڤە گیانێ خۆ ژدەستدا لەوڕا چارلیمان شیا دژیێ 29 سالیێدا بێی هەڤڕك ببیتە شاهێ فرەنسا و دەمێ ئەو هاتیە سەر تەختێ دەستهەلاتێ وەلاتێ فرەنسا پێکدهات ژ عەردێ وەلاتێن فرەنسا و بەلجیکا و سویسرا و بپشکەکا مەزن ژ عەردێ هولەندا و بەلجیکا ژبەر هندێ چارلیمانی ئێکسەر وەختێ خۆ ب بەرفرەهکرنا عەردێ وەلاتی ڤە نەبر بەلکو دەست ب چاکسازیان کر.

پشتی مرنا برایێ وی، خێزانا وی و زاروکێن ڕەڤین و چوونە باکورێ ئیتالیا ل شاهنشینا "لومبارديا". لێ چارلیمانی هێزەك پێکئینا و لدویڤ وان کەفت هەتا شیای ل سالا 774 شاهنشینا لومبارديیان داگیربکەت و عەردێ وان ژی ل سەر وەلاتێ خۆ زێدەبکەتن ل دووڤدا ژنبرا خۆ و زاروکێن ویژی گرتن و کوشتن.

ژ گرنگترین شەڕێن چارلیمانی ئەنجامداین، داگیرکرنا دەڤەرا "ساکسونیا" بوو ل ئەڵمانیا و بۆ ڤێ چەندێ وی 18 هەوێن لەشکەری هەر ژ سالا 772 هەتا 804 ئەنجامدان و ئەگەرێ درێژاهیا ڤی شەڕی ژی بۆ چەندین هوکارێن ئاینی دزڤڕی و بوویە ئەگەرێ ڕێژتنا گەلەك خوینێ. خەلکێ ساکسونیا یێ بێ باوەربوو لەوڕا چارلیمانی داخاز ژێکر ببنە مەسیحی و هەر کەسێ ئەڤ چەندە ڕەتکری هاتە کوشتن و یێن دژی وی ڕاوەستیان یان ڕەڤین ئەوژی هاتنە کوشتن.

ژبەر ڤێ چەندێ چارلیمانی نێزیکی چارێکا خەلکێ ساکسونیا کوشتن و یێ بەردەوام بوو ل سەر داگیرکرنا بەشێن ماین ژ ئەڵمانیا و فرەنسا و ل دووڤدا بەرەڤ هوزێن "ئافار"ی چوو ل وەلاتێن مەجەر و یوگیوسلافیا و کرواتیا و ل سالا 778 بەرەڤ ئیسپانیا ژی چوو لێ هێرشێن وی سەرنەکەفتن.

د ماوێ 45 سالێن خۆ یێن دەستهەلاتێ دا چارلیمانی 54 هەوێن لەشکەری ئەنجامدابوون و شیا ئەوروپا ڕۆژئاڤایی بکەتە ئێك و پاشی ئیمپراتۆریەکێ دروست بکەت کو پێکدهات ژ فرەنسا و ئەڵمانیا و سویسرا و نەمسا و هۆلەندا و بەشەکێ ئیتالیا. ئەم دشێ، بێژین ئەڤە ژ هینگێ وەرە چ وەلاتێن دی نەشیاینە دەستهەلاتێ لڤان وەلاتان هەمیا پێکڤە بکەت.

چارلمان شیا پەیوەندیێن خۆ دگەل "پاپای" خۆشکرن لێ چارلیمان ب خۆ دەستهەلاتدارێ ڕاستەقینە یێ ئەوروپا بوو نەك پاپا.

گرنگترین ڕویدان د ژیانا چارلیمانی دا ڕویدای ل شەڤا سەرێ ل باژێرێ ڕۆما ل سالا 800 بوو ژبەرکو ل ڤی شەڤێ "پاپا لیو یێ سیێ" تانجا ئیمپراتۆریێ دانا سەر سەرێ چارلیمانی و وەك ئیمپراتۆرێ ڕۆمانی دا دا نیاسین و پشتی شەڤێ دووبارە ئیمپراتۆریا ڕۆمانی کو بەری هینگێ ب سێ چەرخان ژناڤ چوبوو، دوبارە زیندی بووڤە و چارلیمان بوو جهگرێ "ئوگوست قەیەسری".

سەرەڕای سەرکەفتنێن مەزن یێن چارلیمانی لێ ئاریشا وی ئەوبوو کا کی دێ کیژ کورێ وی پشتی مرنا وی بیتە جهگرێ وی و ئەڤ ئەگەر ب تنێ بەس بوو کو ئیمپراتۆری ل سەر هەرسێ کورێن وی هاتە دابەشکرن شەڕ دناڤبەرا هەر سێ برایاندا ڕوپبدەت، لێ دوو

کورێن وی بەری مرنا بابێ خۆ مرین لەوڕا کورێ وی "لویسێ ئاینخواز" پشتی مرنا بابێ خۆ ل سالا 814 شیا ببیتە جهگرێ وی ل باژێری ئاخین.

لویسی ژی سێ کور هەبوون و پشتی هینگێ ویژی ئیمپراتۆری ل سەر هەرسێ کورێن خۆ دابەشکر ئەوژی ب ئیمزاکرنا هەڤپەیمانیەکێ ل سالا 843. پشکا ئێکێ پێکدهات ژ پتریا عەردێ فرەنسا یێ سەردەمێ ئەڤرو و پشکا دوێ ژی پێکدهات ژ ئەلمانیا و پشکا سیێ پێکدهات ژ پشکەکا ئیتالیا و هندەك دەڤەرێن سەرسنوری یێن ئەلمانیا و فرەنسا.

بوچوونێن دیروکنڤێسان ل سەر بهایێ ڕاستەڤینەیێ سەرکەفتنێن چارلیمانی دژێکجودانە، لێ پتریا وان دگەل هندێ نە کو ئەو شیا ئەوروپا ڕۆژئاڤا بکەتە ئێك و بەرپرسیارێ ئێکێ بوو ژ ڕاکرنا سنورێ دناڤبەرا فرەنسا و ئەلمانیا و ئیتالیا و شیا ئاینێ مەسیحی بەلاڤ بکەت و پاپا شیا دانپێدانێ پێ بکەت و ئەڤ چەندە تا ڕادەیەکی دەستپێکا پەیدابوونا هەڤڕکیێ بوو دناڤبەرا دەستهلاتا دێرێ و حکومەتێن ئەوروپا.

لێ ئەم دشێین بێژین ئەڤ سەرکەفتنێن وی تا ڕادەیەکی مەزناهی تێدا هاتیەکرن ژبەرکو ئەو نەشیابوو ئیمپراتۆریا ڕۆمانی یا کەڤن بزڤڕینتەڤە بەلکو ب تنێ شیا بوو ببیتە جهگرێ وێ ئمپراتوریێ یا ژبەر بابێ ویڤە بۆ مای، هەردیسان وی ئاینێ مەسیحی ژی بەلاڤ نەکربوو بەلکو بەری وی ب سەدەها سالان هاتبوو بەلاڤکرن.

هەردیسان ئەو پێدڤی ب هندێ نەبوو توندوتیژیێ دژی ساکسونیان بکاربینیت داکو ببنە مەسیحی ژبەرکو خەلکێ ساکسونی ل ئینگلتەرا و سوید و نەرویج هاتبوونە سەر ئاینێ مەسیجی بیێ کوشتن و ڕێژتنا خوینێ.

لێ دبیت مەزنترین سەرکەفتنا چارلیمانی بۆ هندێ بزڤریت کو ئەو شیا ساکسونیان بشکێنیت و وەلاتێ وان ژی ل سەر ئەوروپا ڕۆژئاڤایی زێدەبکەت و ئەڤ سەرکەفتنە تا ڕادەیەکی وەکی یا "یولیوس قەیسەر"ی یە دەمێ شەڕێ وەلاتێ "گال" کری لێ گرنگیا وێ کێمتربوو ژبەرکو ڕۆبەرێ عەردێ وەلاتێ ساکسونیا یێ بچووك بوو.

لێ چارلیمان شیا ڕێکێ بەرەڤ وەلاتێن ئەوروپا ناڤەڕاست ب تایبەت ئەلمانیا ڤەکەت و شەڕێ ئیتالیا بکەت و کونترۆل ل سەر دەڤەرێن وێ یێن باکوری کر. هەروەسا چارلیمان بوو ئەگەرێ پەیدابوونا شۆڕەشەکا ڕەوشەنبیری لێ بۆ ماوەیەکێ کێم د ژیانا وی

دا. ب كورتی ئەم دشێن چارلیمانی ب جەنگیزخانی هەڤبەربكەین ب تایبەت دەمێ بزاڤ كری ئەو وەلاتێن وی داگیركرین بكەتە ئێك.

## 98. هومیرۆس Homer

## (800 ب.ز- 000)

### هومیرۆس

### ئەو هوژانڤانێ بۆ ماوێ بیست وحەفت چەرخان کاریگەری ل سەر ئەدەبێ جیهانێ کری

ب درێژاهیا دیروکێ گەلەگ گەنگەشە ل سەر ڕاستیا هندێ هاتیە کرن کا هومیرۆس کیە و هوزانێن وی کیژکن؟ هەروەسا کا کەنگی و لکیڤە و چەوا ئەو شیایە هەردوو داستانێن مەزن "ئەلیادە" و "ئودیسا"یێ بنڤێسیت؟ ئەرێ کەسەکێ ب تنێ ئەڤ داستانە نڤێساینە یان گەلەك کەسان بەشداری د نڤێسینا ویدا کریە.

هەورەسا کا ئەڤ داستانە ب درێژاهیا چەرخان هاتینە پاڕاستن یانژی ژ فلکلورێ مللەتی بوو خەلکی بەشداری تێدا کریە و گەلەك تشت ژێ کێمرینە و زێدەکرینە هەتا سەردەمێ ئەڤروکە بڤی شێوەی گەهشتیە بەردەستێ مە.

هەتا نوکەژی کەس نەشیایە بەرسڤەکا ڕاست و دروست بۆ ڤان پرسیاران ببینیت. لێ لدویڤ وان ژێدەر و بەلگەیێن ئەم گەهشتینێ بۆمە دیاربوویە کو کەسەکی ب تنێ داستانا ئەلیادە یا نڤێسای.

بەری سەردەمێ هۆمیروسی چەندین کورتە چیرۆك ل سەر هەمان بابەت هەبوون لێ ئەو کارێ هۆمیروس پێ ڕابووی مەزنترین و گرنگترین داستان بوو ئەوژی پشتی شیایی ڤان هوزانان کوم بکەت و ب شێوەیەکێ ئەدەبی یێ جوان دوبارە ڕێکبێخت و گەلەك تشتان ل سەر زێدەبکەت هەتا کو شیایی وێنەیەکێ هونەری یێ جوان بدەتێ.

هۆمیروس ئەڤێ شیایی ڤێ داستانا هونەری یا جوان بەرهەم بینیت ل چەرخێ هەشتێ بەری زاینی ژیایە، هەرچەندە دیروکنڤێس گەلەك سالێن دی یێن بوون و مرنا وی پێشنیار دکەن لێ چ بەلگەیێن ڕاستەقینە ل سەر وان سالان نینن.

هەردیسان پترِیا بوچوونان دگەل هندێ نە کو هۆمیروسی داستانا ئودیسا ژی یا نڤێسای، لێ دگەل هندێ ژی هندەك رەحنەگر دبێژن کو هندەك جوداهی د شێوازێ نڤێسینا هەردوو داستاناندا هەیە و ئەڤەژی تیبینەکا بەرچاڤە، لێ ئەو خالێن بهێز یێن هەڤپشك دناڤبەرا ڤان هەردوو داستاناندا باشترین بەلگەنە ل سەر هندێ کو کەسەکێ ب تنێ ئەو هەردوو داستان نڤێساینە.

ب مخابنڤیە کو دیروکێ کێم پێزانینن ل سەر ڤی کەسی بومە هێلاینە لێ راستیەکا پشت راست یا هەی ئەوژی کو هۆمیروس کەسەکێ کورەبوو، هەرچەندە ئەو ب کورەهی ژدایکنەبوو لێ ل دوماهیا ژیانا خۆ تووشی ڤێ چەندێ ببوو.

هەروەسا ئەو چەندە نەهاتیە پشت راستکرن کا ئایا هوزانێن هۆمیروسی هاتبوونە نڤێسان یانژی لزار دەڤێ خەلکی هاتینە ڤەگوهاستن، لێ رەخنەگر گەهشتینە وێ باوەریێ کو هوزانێن وی یێن هاتینە نڤێساین ژبەرکو شێوازێ نڤێسین و رێکخستنا وان ب دروستاهی هاتینە پاراستن و ئەگەر ل سەر زارێ خەلکی هاتبانە ڤەگوهاستن دا ئەڤ شێوازە تێکچیت. د هەمان دەمدا ئەڤ داستانە گەلەك یا درێژبوو کو نێزیکی 28 هزار دێرێن شعری بوو لەورا یا بزەحمەتە خەلك شیابن هەمیان ژبەربکەن و ب ڤەگوهێزن.

ل چەرخێ شەشێ بەری زاینی هەردوو داستانێن ئەلیادە و ئودیسا وەك جوانترین و بهاترین بەرهەمێن گریکی هاتبوونە نیاسین ڤێجا چ کەسەکی ب تنێ نڤێسابن یانژی گەلەك کەسان بەشداری د نڤێسینا واندا کربیت لێ دگەل هندێ ژی ناڤێ هۆمیروسی دێ لدەستپێکا وان کەسان هێتە گوتن یێن ئەڤ داستانە بۆ دهێنە زڤراندن.

لێ هەکە پرسیار بکەین کا بوچی مە ناڤێ وی ل ڤی جهێ دوماهیێ دناڤ لیستا کەسێن کاریگەردا دانایە؟ ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ دزڤریت کو ئەڤ داستانە هند دناڤ خەلکی دا دناڤدار نینن ب تنێ ل قوناغێن دەستپێکێ یێن خواندنێ دهێنە خاندن و رەنگە پشتی هینگێ کەس چ بابەتان ل سەر نەخوینیت، ئانکو بەروڤاژی کارێن شکسپیری کو هەتا نوکەژی شیایە کونترۆلێ ل سەر شانویا پترِیا زمان و وەلاتێن جیهانێ بکەت و رۆژانە کارێن وی بهێ٘ە ساخکرن.

ل سەردەمێ ئەڤروکە کەس گرنگیێ نادەتە کارێن هۆمیروسی، لێ کارێن شکسپیرو عومەر خەیام و بنیامێن فرانکلینی هێشتا ژلایێ خەلکیڤە دهێنە ساخکرن. بو نموونە هەتا

نوکەژی دبیت ب تنێ گوتنەکا فرانکلینی کارتێکرنێ ل خەلکی بکەت ب تایبەت گوتنا وی "ئەگەر مە پارەیەك هەلگرت، ئانکو مە پارەیەك فایدەکر" لێ چ گوتنێن وەکی ڤێ ل دەف هۆمیروسی نەبوون.

لێ کا بوچی مە ناڤێ وی دانایە دگەل ڤێ لیستێ، ئەوژی بوو دوو ئەگەران دزڤریت.

ئەگەرێ ئێکێ: هژمارا ئەو کەسێن هوزانێن وی ب درێژاهیا دیروکێ خواندین گەلەکن و هوزانێن وی ل دەف هەمی خەلکی ناڤدار بوون هەتا وی رادەی پتریا دەستهەلاتدارێن رۆمانی مفا ژ هوزانێن وی وەرگرت و ئەسکەندەرێ مەزن دانەیەك ژ داستانا ئەلیادە دگەل خۆ دهەلگرت.

ئەگەرێ دووێ ژی ئەوە کو کاریگەریا هۆمیروسی ل سەر ئەدەبێ جیهانی کاریگەریەکا بێ دوماهیکە و بوویە ئەگەر گەلەك ئەدیبێن دی بهێنە پێش وەك سوفوکلیس و یوربیلوس و ئەرستۆ.

ئەڤ ئەدیبە هەمی ب داستانێن ئەلیادە و ئودیسا داخباربووینە و گەلەك گەنجینەیێن وێ ژ رامانێن پەیڤان و شێوازێ جوانێ نڤێسینی بۆ خو ژێ ئینایندەرێ. هەردیسان هۆمیروسی کاریگەری ل سەر هزرمەندێن لاتینی ژی هەبوو وەك "فرگیل" خودانێ داستانا "تاسوعیات" کو ل سەر شێوازێ داستانێن هومیرۆسێ نڤێسایە.

ئەم دشێن بێژین کو د دیروکێ دا ئەو چەندە دووبارە نەبوویە کو نڤیسەرەکێ ب تنێ شیابیت ڤێ کاریگەریا مەزن ل پشت خۆ هێلابیت و هەتا سەردەمێ ئەڤروکە کاریگەریا هۆمیروسی مەزن ل سەر ئەدەب و هونەری بۆ ماوێ پتر 27 چەرخان یا بەردەوامە.

## 99. جوستینیانێ ئێکێ Justinian I

## (483ز. – 565 ز.)

### جوستینیانێ ئێکێ

### ئەو ئیمپراتۆرێ یاسایا ڕۆمانی یا ناڤدار دانای

ئیمپراتۆر جوستینیانێ ئێکێ ب هندێ یێ ناڤداره کو شیایه یاسایا ڕۆمانی یا ناڤدار بدانیت و ل سەردەمێ وی ل دادگەهێن ڕۆمانی هاته بجهئینان. ڤێ یاسا جوستینیانی شیا وێنەیەکێ بلیمەتیا ڕۆمانی یێ یاسادانانێ نیشا جیهانێ هەمیێ بدەت و ئەڤ یاسایه بۆ بنیاتێ دانانا یاسایێ ل وەلاتێن ئەوروپی و ڕەنگه چ یاساییێن دی یێن وەکی ڤێ کاریگەری ل سەر جیهانی نەکربیت.

جوستینیان ل سالا 483 زاینی ل دەڤەرا "تورسیوم" کو ل سەردەمێ ئەڤروکه دبێژنێ وەلاتێ یوگیوسلافیا ژدایکبوویه. مامێ وی جوستینێ ئێکێ جوتیارەکێ ساده بوو لێ پشتی هینگێ شیا بچیته دناڤ لەشکەری دا و جهێ خۆ بکەت هەتا شیای ببیته دەستهەلاتدارێ ئیمپراتۆریا ڕۆمانی یا ڕۆژهەلاتی. هەرچەنده کەسەکێ گوندی بوو لێ هەر زوی شیا خو فێری خواندن و نڤێسینێ بکەت و مامێ ویژی هاریکاریا وی کر پێشبکەڤیت.

ل سالا 527 دەمێ مامێ وی زانی کو ئەو دێ مینته بێ کور بریاردا برازایێ خۆ جوستینیانی بکەته هاریکارێ خۆ و دەمێ پشتی بورینا سالەکێ مامێ وی مری جوستینیانێ ئێکێ بوو جهگرێ وی.

ل سالا 476 زاینی، ئانکو بەری ژدایکبوونا جوستینیانی ب حەفت سالان، هوزێن ڕۆمانی یێن دونیانەدیتی دەست بسەر ئیمپراتۆریا ڕۆمانی یا ڕۆژئاڤایی دا گرت لەوڕا ب تنێ ئیمپراتۆریا ڕۆژهەلاتی ما د دەستێ جوستینیانێ ئێکێ دا و پایتەختێ وێ قوستەنتینیه بوو.

لێ جوستینیانێ ئێکێ خۆ بەرهەڤ کر دووبارە ئیمپراتۆریا ڕۆمانی یا ڕۆژئاڤایی ئازاد بکەت و هەمی هێزێن خۆ بۆ ڤێ مەرەمێ بەرهەڤکرن و تا ڕادەیەکی شیا بسەرکەڤیت و خۆ ژ ڤان هوزان ڤۆرتال بکەتب تایبەت ل ئیتاڵیا و باکورێ ئەفریقیا و بەشەکێ ئیسپانیا.

ئەگەرێ دانانا ناڤێ جوستینیانێ ئێکێ دڤێ لیستێ دا بۆ سەرکەفتنێن وی یێن لەشکەری نازڤریت بەلکو ئەو شیا یاسایا ڕۆمانی بدانیت. ل سالاْ 528 لیژنەك پێکئینا ژبۆ دانانا یاسایەکا گشتی و ڤێ لیژنێ کارێ خۆ ل سالاْ 529 بدوماهی ئینا و پاشی ل سالاْ 534 ل ڤێ یاسایێ زڤڕی و کارپێکر و ئەڤ یاسایە بۆ ئەگەرێ لادانا هەمی وان یاساییێن بەری هینگێ کار پێ دهاتەکرن.

# 100. ماهاڤیرا Mahavira

## (599ب.ز – 527 ب.ز)

### ماهاڤیرا

### ئەو کەسێ شیای ئاینێ جینی ل هندێ بدانیت

ماهاڤیرا ئانکو قارەمانێ مەزن، ئەو ناسناڤە یێ خەلکێ دەڤەرا جینس ل سەر وی کەسی دانایە یێ ڕابووی ب پێشئێخستنا ئاینێ وان. ناڤێ وی یێ دروست فاردهامانا یە و ل باکورێ هندێ ژدایکبوویە، ئانکو ل هەمان وێ دەڤەرێ یا بۆدا لێ ژدایکبووی. ژبەر ڤێ چەندێ ژی گەلەك وەکهەڤی دناڤبەرا ڤان هەردوو کەسان دا هەنە.

قارەمانێ مەزن ژی کورێ کەسەکێ دەولەمەند بوو و وەکی بودای د خۆشیێ دا دژیا لێ وی ئەڤ دژیێ 30 سالیێ دا بریاردا ڤێ خۆشیێ و هەڤژین و کچا خۆ بجهـ بهێلیت و ب تنێ بژیت و لدویف ڕامانا دروست یا ژیانێ بگەریێت.

پشتی هینگێ بوو ڕەبەن ل دێرەکێ و نێزیکی 12 سالان خۆ ژ هەمی خۆشیێن دونیایێ دوورکر و ژیانەکا ب هەژاری و نەخۆشی بوراند تا وی ڕادەی نە کوپەکێ ئاڤێ و سینیەك بۆ خۆارنێ هەبیت. هەردیسان وی پتریا دەمێ خۆ ب ڕۆژیگرتنێ ڤە دبوراند و ب تنێ جلکەك لبەر هەبوو لێ پشتی هینگێ ئەڤ جلکەژی هاڤێت و ب ڕویسی دناڤ خەلکی دا دهات وچوو.

ماهاڤیرای مێشومور ژخو نەدانە پاش دەمێ ل سەر لەشێ وی دهاتن وچوون هەتا ئەگەر زیندەوەرەکی پێڤەداباژی. هەرچەندە ل دەڤ خەلکێ هندێ ببوو تشتەکێ ئاسایی دەمێ ڕەبەن ب ڕویسی دناڤ واندا دهاتن وچوون لێ دگەل هندێ ئەڤ دیمەنە ببونە جهێ دلگرانیا خەلکی و وان یاری و تڕانە پێ دکرن و ب کەسێن دین و نەدروست ل قەلەم ددان.

دەمێ ژیێ وی گەهشتیە 42 سالیێ، ماهاڤیرای هزرکر ئەو یێ گەهشتیە قۆناغا پێگەهشتنا مێشکی و ئەو یێ بەرهەڤە نوکە هەر کارێ وی بڤێت بکەت لەوڕا بۆ ماوێ 30

سالێن پشتی هینگێ ڕابوو ب فێرکرنا خەلکی و ئەو تشت نیشا دان یێن وی ددەمێ خۆ یێ ب تنێ دا فێربووی. ل سالا 547 بەری زاینی دەمێ وەغەر کری گەلەك دویکفەتی و پشتەڤان هەبوون.

هەڤبەرکرنێن مەزن دناڤبەرا ڕێنماییێن ماهاڤیرای و ڕێنماییێن بودای و هندوکی هەنە. ماهاڤیرا دبێژیت دەمێ مرۆڤ دمریت گیانێ وی نامریت بەلکو دچیتە دناڤ لەشێ مرۆڤەکێ دی دا یان زیندەوەرەکێ دی دا و ئەڤ چەندە بنەمایێ ئاینێ وی بوو. هەروەسا وی هزرکر دکر گونەهێن مرۆڤی ب چ ڕەنگان ناهێنە ژێبرن بەلکو دڤێت ئەو خۆ برسی بکەت و خۆ ژ هەمی خۆشیێن دونیایێ دووربکەت هەتا دمریت. هندەك ڕەبەنێن دیژی دگەل ڤێ بوچوونا وی بوون لەوڕا بریاردا پاقژی و دلسوزیا خۆ ب هندێ دیاربکەن و بریاردا ئەو خۆ ژ هەمی خۆشیێن دونیایێ دووربکەن هەتا دمرن.

ژ گرنگترین ڕێنماییێن ئاینێ وی خو دوورکرن ژ توندوتیژی و کوشتنێ وبوو تا وی ڕادەی دڤێت هەر کەسەك گەلەك یێ هشیاربیت دەمێ ل سەر عەردی بڕێڤە دچیت داکو چ زیندەوەرێن هویر و مێشوموران نەکوژیت. هندەك ڕەبەنان داخاز ژ دویکفەتییێن وی دکر پێن خۆ هێدی بدانە سەر عەردی و خۆارنێ د تاریاتیێ دا نەخۆن داکو ئەڤ چەندە نەبیتە ئەگەرێ چ مێشوموران.

پتریا دویکەفتیێن ماهاڤیرای کەسێن ڕۆەکخۆر بوون و خو ژ خۆارنا گوشتی ددا پاش لێ دگەل هندێ ژی وان کارێ چاندنێ نەدکر ژبەرکو ب دیتنا وان کارێن دەستی حەڕامن لەوڕا وان دەست ب کارێ بازرگانیێ کر و ببوونە کەسێن زەنگین یێن هندی. ماهاڤیرای باوەری ب هەبوونا خودێ و خوداوەندان نەبوو بەلکو وی هزرکر ژیانا مرۆڤی تێرا هندێ دکەت ئەو پێ بهێتە خەلاتکرن یان سزادان.

گومان تێدا نینە کو فەیلەسوفێ هندی یێ مەزن گاندی گەلەك ب ڕێنمایا خۆ دوورکرن ژ توندوتیژی و کوشتنێ یا ماهاڤیرای داخباربوو. دبێژنە دویکەفتیێن ماهاڤیرا "جینس" و دبێژنە ئاینێ وی "ئاینێ جینی" و شیایە بۆ ماوێ پتر ژ 25 چەرخان بمینتە زیندی و هەتا نوکەژی گەلەك کەس ل سەر ڕێبازا ڤی ئاینی ماینە کو هژمارا وان دگەهیتە پتر ژ دوو ملیون و نیڤ کەسان و پتریا وان ژی ل وەلاتێ هندێ نە.

ڤی ئاینی کاریگەریەکا مەزن ل سەر ژیانا وان کەسان هەیە یێن باوەری ب ڤی ئاینی هەین و بوویە ئەگەرێ ئێکرێزی و پێکڤەگرێدانا وان داکو بشێن وەکی کیانەکێ ب هێز بمینن بێی کو وان پەرتووکەك هەبیت وان پێکڤە گرێدەت.

**خشتێ ژمارە 1: ناڤێ وەلآتێن ئەڤ کەسە ژێ'هاتینە هەلبژارتن.**

| | هژمارا کەسان | جهێ |
|---|---|---|
| کێشوەرێ ئەوروپا | 18 | بریتانیا |
| | 15 | ئەلمانیا و ئوستریا |
| | 9 | فرەنسا |
| | 8 | ئیتالیا |
| | 5 | یونان گریس |
| | 3 | ئیسپانیا |
| | 4 | رۆسیا |
| | 7 | وەلاتێن دی یێن ئەوروپی |
| | 8 | ویلایەتێن ئیکگرتی |
| | 1 | ئەمریکا باشور |
| | 1 | نیوزیلەندا |
| | 3 | ئەفریقیا |
| کێشوەرێ ئاسیا | 7 | چین |
| | 3 | هند |
| | 1 | مەنگولیا |
| | 7 | رۆژهەلاتا ناڤین |
| | 100 | سەرجەم |

**خشتێ ژمارە 2: ئەو سەردەمێ ئەڤ کەسە تێدا ژیاین.**

| هژمارا کەسان | سەردەم |
| --- | --- |
| 3 | 600 سالێ بەری زاینی |
| 13 | 600 هەتا 201 بەری زاینی |
| 16 | 200 بەری زاینی هەتا 1400 زاینی |
| 4 | چەرخێ پازدێ |
| 9 | چەرخێ شازدێ |
| 9 | چەرخێ حەڤدێ |
| 12 | چەرخێ هەژدێ |
| 18 | چەرخێ نۆزدێ |
| 16 | چەرخێ بیستێ |
| 100 | سەرجەم |

**خشتێ ژمارە 3: تایبەتمەندیا وان کەسێن ناڤێ وان د لیستا 100 کەسێن کاریگەردا هاتین.**

| هژمارا کەسان | تایبەتمەندی یان بوار |
| --- | --- |
| 36 | زانا و داهێنەر |
| 31 | سەرکردێن سیاسی و لەشکەری |
| 14 | فەیلەسوفێن علمانی |
| 11 | سەرکردێن ئاینی |
| 5 | هونەرمەند و ئەدیب |
| 2 | ڤەدوزەو (گەرۆك) |
| 1 | پیشەساز |
| 100 | سەرجەم |

